# تاوانە گەورەکان

# لە ڕوانگەی ئیسلامەوە

ملا عبدالرحمن ملا طه عزيز



چاپی سێیەم / ٢٠١٢

# تاوانە گەورەکان
# لە ڕوانگەی ئیسلامەوە





## ناسنامەی

ناو: تاوانەگەورەکان لەروانگەی ئیسلامەوە
بابەت: روونکردنەوەی گوناهەکان
نووسەر: ملا عبدالرحمن ملا طە عزیز
چاپخانە: هێڤی - هەولێر
چاپ: یەکەم/2012
تیراژ: 1000/ دانە
بەرهەم: (137)



کتێبخانەی
**حاجی قادری کۆیی**
دیزاین - چاپکردن - بڵاوکردنەوە
٠٦٦ ٢٢٢٣٨٦٨
٠٦٦ ٢٦٤٨٩٠٧
عێراق - کوردستان - هەولێر





لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٨٧) ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە.

07504671394
07501181919
07504885903
hawler.chap@gmail.com

# تاوانە گەورەکان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە

## (كبائر الذنوب في نظر الإسلام)

ملا عبدالرحمن ملا طه عزيز

چاپی سێیەم
هەولێر/ ٢٠١١

## پێشکەشە بە...

- ئەو بڕوادارانەی، کە لە تەمەنی لاوییاندا هەتا گەیشتنیان بە خودای پەروەردگار، خۆیان دەپارێزن لە هەموو تاوانێکی بچوک و گەورە.

- ئەو دایک و باوکانەی کە نانی حەڵاڵ دەدەن بە کۆرپەکانیان و، نزیکی حەرام ناکەون هەرگیز.

- ئەو بڕوادارانەی کە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرﷺ دەڕۆن و لە ڕاستەڕێگەی شەریعەت هەرگیز لانادەن و، بەرەنگاری هەموو تاوانێک دەوەستن لەسەر زەوی.

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

## پێشەکی/

**هۆی دانانی ئەم پەرتووک نووسینەم چی بوو؟!**

رۆژێ لەرۆژان لە ژورەکەمدا خەریکی خوێندنەوە بووم، کاتێک لەپڕ سەرم هەڵبڕی و چاوم بە کتێبخانەکەمدا خشاندو ماوەیەک لێی وورد بوومەوە و سەیرم کرد، ووتم سوپاس بۆ خوا گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە هەموو جۆرە پەرتووکێکی ئاینی تێدابوو، بۆ نموونە: گەلێک لە تەفسیری قورئان و شەریعەت و فقهو (ارشاد) و پەڕتووکی فەرموودە و ژیانی پێغەمبەران و (سیرە) و (وەعز) و ئامۆژگاری و، هەروەها پەڕتووکی (ئوصوول) و نەحو و صەرف و بەلاغە و بیان و مەنگق و تەصەوف و مێژوو..

لێرەدا لەبەرخۆمەوە گوتم ئەدی ئەی (فەقیرحاڵ) بۆچی خزمەتێکی ئایینەکەت ناکەی، هەروەک زۆر لە زانا ئایینیەکانمان خزمەتی ئەم ئایینە پیرۆزەیان کردووە، پەڕتووکیان داناوە خوا پاداشتی چاکەی هەموو لایەک بداتەوە. لەبەر ئەوە منیش دەستم کرد بە کۆکردنەوەی هەندێک لە فەرموودەکانی پێغەمبەرمانﷺ لەبارەی تاوانە گەورەکان و توانیم چاوێ بخشێنم بە پەڕتووکی (زواجر) و (کبائر) هەندێ لە فەرموودەکانی ناویان کۆبکەمەوە و وەری بگێڕم بۆ سەر زمانی کوردی شیرین.

هەرچەندە خۆمم بە لێهاتوو و چالاک نەدەزانی لەم بارەیەوە، بەلاّم داوای یارمەتیم لە خودای گەورە کرد کە پیشاندەرم بێت و دلّیشم بەو فەرموودەیە خۆش بوو کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ**...الخ.))

ئینجا خوێندەوارە موسلّمانەکان ئەگەر هەلّەیەک و کەم و کورتیەکتان بەدی کرد، تکام وایە لای خۆتان ئەم هەلّەیە ڕاست بکەنەوە، چونکە ئینسان زۆر جار دەکەوێتە هەلّەوە، ئەمەش شتێکی ڕۆن و ئاشکرایە وەکو پەندێکی عەرەبی دەلّێت (**الإنسان محلّ النسيان**).

هەروەها ئومێدەوارم ئەم بەرتووکە ببێتە مایەی پڕکردنەوەی کەلێنێک لە مێشک و دەروونی موسولّمانانی کورد و ئاوڕدانەوەیەک بێت بۆ چاکە و دوور گرتنیان لە خراپە.. ئیتر سوپاس بۆ خودای مەزن..

وەر گێڕ
(عبدالرحمن مەلاّ طه عزیز)
پێش نوێژ و وتارخوێنی گوندی دارەتوو
ناوچەی بەردەڕەش، سەر بە قەزای ئاکرێ
هەرێمی کوردستان
١٩٩٩/٢/٢زایینی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي هو الأول والآخر والباطن والظاهر الذي هو بكل شيء عليم، والصلاة والسلام على أمام المتقين وخاتم الأنبياء والمرسلين سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

خوای مەزن لە قورئاندا دەفەرموێ: ((**إِنْ تَجْتَنِبُوا كَبَائِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ**)) **واتە**: ئەگەر دوور بکەونەوە و وازبێنن لە گوناهە گەورەکان کە خوا لە ئێوەی قەدەغە کردووە، ئەوا ئێمە گوناهە بچووکەکانی ترتان دادەپۆشین بە بەزەیی و میهرەبانی خۆمان.

لە کۆتایی ئایەتەکە دەفەرموێ: ((**وَنُدْخِلْكُمْ مُدْخَلاً كَرِيماً**)) **واتە**: ئەتان خەینە شوێنێکی خاوەن رێز و حورمەت کە بەهەشتە.

لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێ: ((**الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ إِلاَّ اللَّمَمَ إِنَّ رَبَّكَ وَاسِعُ الْمَغْفِرَةِ**))**سورەی (النجم)** ئایەتی ٣٢،

**واتە**: ئەو کەسانەی کە خۆیان دەپارێزن لە گوناهە گەورەکان وەکو (هاوبەش بۆ خودا پەیداکردن و کوشتاری بێتاوان و دەست بەسەردا گرتنی ماڵی خەڵک و داوێن پیسی) تەنها ئەو کەسەی بە قەزاوقەدەر گوناهێکی لێ (بقەومێ و) بە مەرجێ بۆ جاری دووەم نەگەڕێتەوە سەری، ئەوا بێ گومان دەرگای بەخشین بۆ ئەو کەسانە گوشاد و فرەوانە.

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: **((الصَّلَوَاتِ الْخَمْسُ وَالْجُمْعَةُ إِلَى الْجُمْعَةِ وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ مُكَفِّرَاتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ مَا اجْتُنِبَتْ الْكَبَائِرُ))** [1]

**واته**: نوێژە فەرزەکان رۆژی پێنج جار، لە هەینیەوە هەتا دە گاتە هەینی، لە رەمەزانەوە هەتا دە گاتە ڕەمەزانێکی تر، دەبنە ڕەش کەرەوە بۆ گوناهەکانی موسڵمان ئەگەر نزیکی گوناهە گەورەکان نەبێتەوە.

س: ئەگەر یەکێک پرسیار بکات دەربارەی گوناهە گەورەکان چەندن؟

ج: لەوەلامدا دەڵێین گوناهە گەورەکان زۆرن، بەلام ئێمە وەلامی ئەم پرسیارە بە فەرموودەیەکی (ابن عباس﷛) دەدەینەوە کە دەڵێت: **((وقد روی عن ابن عباس ﷛ أنه سُئل عن الكبائر أسبع هي؟ فقال: هي إلى سبعين، وفي رواية أخرى إلى سبعمائةٍ...))** **واته**: لە ڕاستیدا (ریوایەت) کراوە لە (عەبدولای کوڕی عەباس ﷛)پرسیاریان لیّ کرد گوناهی گەورە هەر ئەم حەوتەیە؟ فەرمووی هەتا حەفتاشە لە ریوایەتێکی تردا دەڵێ حەوت سەدە... [2]

ئێمەش خودا یاریدە بێت لە دوو بەرگدا حەفتا (بەشی تاوانەکان) دەنووسین، لە بەرگی یەکەم (سی) تاوانە مەزنەکان دەنوسین لە بەرگی دوەمیش ئەوی تر تەواو دەکەین لەسەر ڕێکخستن و شێوەی پەڕتووکی (الکبائر) نوسینی بەڕێز (شیخ شمس الدین أبی عبدالله). [3]

هەروەها خوێندەوارە بەڕێزەکان (مامۆستا مەلا عبدالکریم مدرس) لە تەفسیرەکەیدا باسێکی زۆر گرنگی رۆن کردۆتەوە لەبارەی گوناهە گەورەکانەوە، منیش بەپێویستم زانی ئاماژەی بۆ بکەم و بیخەمە پێش چاو، بزانن لەسەر زاهیری قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ گوناهو تاوان

---

[1] - رواه مسلم.

(٢) بروانە (الخطایا في نظر الإسلام) ص١٢ (عفیف عبدالفتاح طبارة) وكتاب الكبائر ص٧ والمذاهب الأربعة الجزء الخامس، ص٤٥٨.

(٣) بەلام ئێمە بە کورتی لەسەری دەڕۆین و کەمتەرخەمی ناکەین لە وەرگێڕان و نوسینەوەی احکامەکان بەقەدەر توانا.. هەروەك گوتراوە (ما لا یدرك کلّه، لا یترك کله).

بريتين لەو نافەرمانانەی کە بەسەر ئادەمیزادا دێن لە گوناهی گەورە و بچووک، ئەو کەسانەی کە فەرموویانە گوناهی بچووک نییە، مەبەستیان ئەوەیە ئەگەر ئێمە تەماشای گەورەیی خوا بکەین و تەماشای نرخی فەرمانی ئەو بکەین، دەبێ هەموو نافەرمانییەک بە گەورە و زیان بەخش تەماشا بکەین.

ژمارەی گوناهە گەورەکان حەوت سەد دەبن، هەروەک ابن عباس دیاری کردووە، بەڵام ئەم حەوت گوناهە گەورەیە بە فەوتێنەر (موبقات) ناوبراون، واتە گوناهبارەکە بەهیلاک دەبەن، وەک فەرموویەتی: ((**اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ... الشِّرْكُ بِاللَّهِ وَالسِّحْرُ وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَكْلُ الرِّبَا وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ الْغَافِلَاتِ**))**رواه البخاري ومسلم**. وە لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((**الْكَبَائِرُ الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ والسحر وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ وَقَتْلُ النَّفْسِ**)) وە ئیمامی بوخاری لەسەر ئەم ریوایەتە (**الْيَمِينُ الْغَمُوسُ**)ی زیاد کردووە و ئیمامی موسلیم لەجیاتی ئەمە دەڵێت (**قول الزور**)، مەبەستمان لە باس کردنی ئەوانە ئەوەیە کە ئەو گوناهانە زەرەر و زیانیان یەکجار زۆرە بۆ بڕوای (ایمان داری) موسڵمان، ئەگەر نا گوناهی گەورە بەمانە تەواو نابن.

تەماشا بکەین (ئیبن و حەجەری) هەیتەمی لە زەواجیردا لە (**شیخ الاسلام**) علائی دەگێڕێتەوە کە جەزئێکی رێک خستووە لە گوناهی گەورە، کە بەشێکیان پێغەمبەرﷺ ناوی ناوە گوناهی گەورە، ئەوانەش ئەمانەی خوارەوەن: ((هاوبەشی دانان بۆ خودا، کوشتن، داوێن پیسی، ڕاکردن لە شەڕی گاوراندا، سوو، خواردنی ماڵی هەتیو، بوختان کردن بە ژنی خاوەن شوورەیی، جادوگەری، زمان درێژی لە ناموسی موسڵماناندا بە ناحەق، گەواهی (شەهادەی) درۆ لە دادگا، ئاژاوە نانەوە، دزی کردن، عەرەق خواردن، هەتکی خانەی خوا و (کەعبە)ی پیرۆز، شکاندنی پەیمانی ڕەوا بە ناحەق، وازهێنان لە

سونەتی پێغەمبەر، دوورکەوتنەوە لە جەماعەت پاش کۆچ کردن، نائومێد بـوون لە بەزەیی خوا، دڵنیایی لە غەزەبی خوا، قەدەغەکردنی ڕێبوار لـە ئـاوی زیـادە، خۆپاک نەکردنەوە لە میز و پاش میز، جـوێن دان و ئـازاردانی دایـک و بـاوک، گۆڕینی وەسیەتی موسڵمان.. ئەمانە هەموو بـە گونـاهی گـەورە دانـراون. جـا هەروەکو ڕوونمان کردەوە گوناهە گەورەکان زۆرن و بە ئاسـانی دیـار نـاکرێن، پێناسەی ئەم جۆرە گوناهانە زۆرن لەلایەن زاناکانەوە، وە گـەلێ پێناسـەی بـۆ دانراوە کە زۆربەی زاناکانی تر پێی (قایل) نەبوون. بەڵێ (شیخ الاسلام بارزی) دەفەرمووێ: بەڕاستی تاوانی گەورە ئەو تاوانەیە کە خودا قەدەغەی کردووە لـە موسڵمانان بە هەڕەشەیەکی توند و بەهێز، وە لەگەڵ نەفرەت و (لعنه) کردنـی لە ئەو کەسەی کە پێی هەڵدەستێ یا بـە (ئایـەت) وە یـاخود بـە فـەرمووده، یاخود گوناهێ بێ زیانی ئەم گوناهە وەک زیانی ئەو کەسە بێ کـە بەڵگـە بـی لەسەر گرنگی نەدانی خاوەنەکەی بە بیروبڕواکەی.

گوناهی گەورە گەلێک شێوەی هەیە: یەکەمیان گوناهێ بێ کە پەیوەنـدی بــە خـــووی مـــرۆڤ خۆیـــەوە هـــەبێ وەکـــو ریابـــازی و لـــەخۆبایی بـــوون و خۆبەگەورەزانی و تەماشاکردنی خەڵک بە سووکی.

دووەم ئەو گوناهانەن ئاشکرا و بە دەرەوەن و پەیوەندیان هەیە بە زیان دانی بە خەڵکی لەناو دەرونیاندا و وەکو کوشتنی بێتاوان و، دەست بڕین و...هتد.

سێهەم ئەوەیە کە زیان دەگەیەنێ بە ناموسی خەڵک و بوختان هەڵبەستن بۆ بێ تاوانان..

چوارەم ئەوەیە کـە زیـان دەگەیـەنێ بـە دارایـی خـەڵک کـە لەبـەر زۆری ناژمێردرێن.

پێنجەم ئەوەیە کە زیان بە دڵـی خـەڵک دەگەیـەنن وەک ئـاژاوە نانـەوە و قسەهێنان و بردن لەنێوان خەڵکدا و، قسەبردن بـۆ لای فەرمانـداران بـۆ زیـان

گەیاندنی خەڵکی بۆ ئەوەی پلەو پایەی خـۆی بـەرز بێتـەوە و (غەیبـەتکردن) واتە پاشمڵە ناوهێنان و جنێودان و ناو بەدکردنی موسڵمانان و هەڵبەسـتی درۆ و ناپاکی و دوڕوویی بە دەمیانەوە، ئەم هـەموو زیـان بەخشـانەش کـە دەبێتـە هۆی نەمانی یەکێتی موسوڵمانان و لەرزینی (بناغەی) دڵ و دەروونیـان تێـک دەدات.[٤]

(٤) مامۆستا (عبدالکریم مدرس) لە تەفسیری (نامی) بەرگی دووەم لاپەڕە ٣٠٢، ئەم باسەم وەرگرتووە لەگەڵ دەست لێ‌یدان... —وەرگێڕ—

# تاوانی یەکەم

## هاوبەش بۆ خودا پەیداکردن (الشرك بالله)

(أعاذنا الله منه بمنه وكرمه وختم لنا بالحسنى في عافية بلا محنة إنــه أكــرم كــريم وأرحم رحيم) **واته**: خوای گەورە بمـان پارێزێـت، بـە گـەورەیی و میهرەبـانی خۆی لەم تاوانە گەورەیە و دڵ و دەرونمان مۆر بکات بە چاکە و لێمـان خـۆش بێت بەبێ ئازار و ناخۆشی، هەروەها بەڕاستی خودای گەورە دەستی ڕەحمەتی لە گشت بلاوترە و لە هەموو بەخشندەیەک بەخشندەترە.

شێخ (ابن حجر) دەفـەرموێت: (**ولما كان الكفر أعظم الذنوب، كان أحق بأن يُبسط الكلام عليه وعلى أحكامه فنقول: قال الله تعالى: ((إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ... ﴿١١٦﴾))** [5]

**واته**: خوای گەورە خۆش نابێت لـەو کەسـانەی هاوبـەش و هـاوەڵ پەیـدا دەکەن بۆ خودا و خۆش ئەبێت لە گوناه و تاوانی کە تەنها لە گوناهی هاوبەش دروست کردنەکە خۆش نابێت.

خودا دەفەرموێت لە ئایەتێکی تردا: ((**إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ**))[6]

**واته**: بەڕاستی هاوبەش پەیداکردن بۆ خودا سـتەمێکی یـەکجار گەورەیـە. هەروەها دەفەرموێت لە ئایەتێکی تـردا: ((**إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْــهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ**))[7]

---

(٥) سورەی نساء ئایەتی ١١٥

(٦) سورەی لوقمان ئایەتی ٢١٣

(٧) سورەتی مائیدە ئایەتی ٧٢

واته: بەڕاستی ئەو کەسەی هاوبەش بۆ خودا پەیدا دەکات ، ئەو کەسە لە بەزەیی خوا بێبەشە و خودا بەهەشتی لێ قەدەغە دەکات، بەڵکو بێ گومان دۆزەخ و ئاگر جێگای دەبێ.

لە پەرتووکی (الکبائر) دەڵێت: (فمن أشرك بالله ثم مات مشركا فهو من أصحاب النار قطعاً) واته: هەرکەسێ هاوەڵ و هاوبەش بۆ خودا پەیدا بکات پاشان بمرێت بە کافری دەمرێت و دەبێتە یەکێ لە دانیشتوانی ئاگر هەتا سەر.

وە دیسان ئەفەرمووێت: (کما أن من آمن بالله ومات مؤمناً فهو من أصحاب الجنة وإن عذب بالنار) واته: هەرکەسێ باوەڕی هەبێت بە خودا و پاشان بە باوەڕەوە بمرێت، ئەوا دانیشتووی بەهەشتە، ئەگەر کەمێکیش بە ئاگری دۆزەخ سزا بدرێت.

پێغەمبەری خوا دەفەرمویﷺ: ((أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ – قالها ثَلَاثًا– قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ))[8] واته: ئاگادارتان بکەمەوە بە تاوانە گەورەکان کامانەن؟ (سێ جار دووبارەی کردەوە) گوتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: هاوبەش بۆ خودا پەیداکردن و بێفەرمانی دایک و باوک و ئازاردان و دڵڕەنجاندنیان.

وە دەفەرموێ ((كَانَ مُتَّكِئًا فَجَلَسَ فَقَالَ: أَلا وَقَوْلُ الزُّورِ، فَمَا زَالَ يُكرِرُهَا حَتَّى قُلْنا لَيته سكت))[9] واته: پێغەمبەرﷺ پاڵی دابۆوە و دانیشت، پاشان گووتی: گەواهی (شاهیدی) بەدرۆ، ئەوەندی ئەو قسەی دووبارە دەکردەوە تاکو گووتمان خۆزگە بێدەنگ دەبوو.

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: ((اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ (أي المُهلكات). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: الشِّرْكُ بِاللَّهِ...الخ.))[10] واته: خۆتان

(٨) رواه البخاري ومسلم عن ابي بكرة ﷺ.

(٩) متفق عليه

(١٠) رواه البخاري ومسلم.

بپارێزن له حەوت گوناهی فەوتێنەر، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم گوناهانه کامانەن؟ فەرمووی: ئەوەیە هاوبەش بۆ خودا پەیدا بکەیت...هتد.

پێغەمبەری خوا دەفەرموێتﷺ: ((أَكْبَرُ الْكَبَائِرِ الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ وَقَتْلُ النَّفْسِ وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ وَشَهَادَةُ الزُّورِ))[11] واتە: هەرە گەورەترین گوناه ئەوەیە کە هاوبەش بۆ خودا دروست بکەیت و هەروەها ئازاردان و بێ- فەرمانی و بێدڵی دایک و باوکە و گەواهی درۆیە.

ابی درداو (خوا لێی رازی بێت) دەڵێت: ((أَوْصَانِي خَلِيلِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ شَيْئًا وَإِنْ قُطِّعْتَ وَان حُرِّقْتَ وَلَا تَتْرُكْ صَلَاةً مَكْتُوبَةً مُتَعَمِّدًا فَمَنْ تَرَكَهَا مُتَعَمِّدًا فَقَدْ بَرِئَتْ[12] مِنْهُ الذِّمَّةُ)) واته: پێغەمبەری خواﷺ ئامۆژ گاری کردم کەوا هاوبەش و هاوەڵ بۆ خودا پەیدا نەکەم، ئەگەر پارچەپارچەم بکەن یاخود بشم سوتێنن، وە فەرمووی واز لە نوێژە فەرزەکان نەهێنیت بە ئەنقەست، ئەگەر وازت هێنا بە ئەنقەست ئەوا بێ گومان لە کۆمەڵی موسڵمانان دەردەچێت.

وە دەفەرموێت: ((وَلَا تَشْرَبْ الْخَمْرَ فَإِنَّهَا مِفْتَاحُ كُلِّ شَرٍّ))[13] واتە: مەی مەخۆرەوە چونکە بەڕاستی مەی (کلیلی ) دەرگای هەموو خراپەیەکە.

فەرمانی (حکم) شەرعی بەرامبەر ئەم گوناهە چییە؟

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ))[14] واتە هەرکەسێک لە ئاینەکەی پاشگەز بووەو ڕێبازی خۆی گۆڕی ئەوە پاداشی هەر کوشتنە. ئەم فەرمانەش پێویستە داد گەرێکی ئیسلامی بیدات.. ئیمامی شافعیرضي الله عنه دەفەرموێ: (هەرکەسێ بێباوەڕ بوو بە خودا لە ملی بدەن بەشیر.

---

(١١) رواه البخاري.

(١٢) له لێکدانەوەی فەرموودەکە دەڵێت (فقد برئت: خرج من الملة الحنيفة السمحاء) واتە بەڕاستی ئەگەر پەشیمان نەبێتەوە (لەم کارە خراپە) ئەمە دەردەچێ لەگەڵ و (میلەتی) ئیسلامی بەرێز.

(١٣) رواه ابن ماجه.

(١٤) رواه احمد والبخاري.

**(تێبینی)**

زانایانی ئایینی دەڵێن هەر کەسێ (کافر) بێت یانی باوەڕی نەمێنێ بەخوا، واتە بێبەری بێ لە ئاینی ئیسلام (هەموو کردەوە باشەکانی بەفیڕۆ دەڕوات. ئیمام شافعی (خوا لێی رازی بێت ) دەڵێت: لەسەر پێشەوایان جێگری پێشەوای موسڵمانان پێویستە بەزووترین کات داوای پەشیمان بوونەوە لە یاخیبوونەکەی (مرتد) بدات سێ جار، ئەگەر پەشیمان بووە، ئەوا پەشیمان بوونەوەی لێ وەردەگیرێ، ئەگەر نا دەکوژرێت، بەڵام سوتاندن دروست نییە، هەروەها پێویستە نەشۆردرێ و نوێژی مردووی لەسەر نەکرێت و لە گۆڕستانی موسڵمانان نەشاردرێتەوە.[١٥]

## جۆرێك لە هاوبەشی بچوك (الشرك الأصغر)[١٦]

هاوبەشی بچووک بریتییە لە ڕواڵەت (**الرياء**)، ئەمەش جۆرێکە لە هاوبەشی پەیداکردن بۆ خودا. هەروەک خوای دروست کار دەفەرمووێ: ((**الَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ**))[١٧] واتە سزای دۆزەخ (ویل)[١٨] بۆ ئەوان کەسانە کە خاوەن ڕواڵەتن.

خوای گەورە دەفەرموێت ((**فَمَنْ كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحًا وَلاَ يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا**))[١٩]. موفەسیرەکان ئەڵێن بە مانا ڕواڵەت لە کردارەکان نەکەن. دەقی ئایەتەکە ئەمەیە هەرکەسێک بە هیوای گەیشتنە بە خودا با کاری چاکە بکات و بە هیچ جۆرێک لە پەرستندا هاوبەش بۆ خودا پەیدا نەکات، خواپەرستنەکەی تەنها بۆ خودای پاک و بێ گەرد بێ.. لێرەدا مەبەست

---

(١٥) بڕوانە کتابی (كفاية الأخيار) لاپەڕە ٢٧٧ بەرگی یەکەم.

(١٦) تکایە (ئاگاداربن) ڕێکخستن و دانانی تاوانەکان لەسەر ڕێکخستنی پەرتووکی (الكبائر)ە لە نووسینی (شمس الدين الذهبي) ئەڕۆین.

(١٧) سورەتی ماعون ئایەتی ٦

(١٨) قۆرتێکە لە قۆرتەکانی دۆزەخ، یاخود بە مانای قوڕەبەسەری دێت.

(١٩) سورەتی الكهف ئایەتی ١١٠

له خواپەرستن تەنها نوێـژ و ڕۆژوو نییــە، بـەڵکو هەرکردەوەیـەک بێـت بـەبێ (ڕیایی) بۆ خودای تاک و تەنهای بکەی.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((**إِنَّ أَخوَفَ مَا أَخَـافُ عَلَـيْكُمْ الشِّـرْكُ الأَصْـغَرُ (الرِّيَاءُ).**)) واتە لە هەموو شتێک زیاتر کە لێی بترسم لەبابەت ئێـوەوە هاوبـەش کردنی بچووکە واتە ڕواڵەت.

خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا دەڵێتە ڕواڵەت کـەرەکان ((**أذهبوا الى الـذين كنتم تراؤءون في الدنيا، أنظروا هل تجدون عندهم جزاء**)) واتـە بـڕۆن بـۆ لای ئـەو کەسانەی کە ئیشتان بۆ دەکردن لە دونیا، ئایا ئەوانە پاداشیان پێ دەدرێتەوە.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((**إن الله حرّم الجنة على كـل مَـراءٍ**))[٢٠] واتـە خـوا بەهەشتی قەدەغەکردووە لە هەموو ئەو کەسانەی (ڕیاچینە).

پێغەمبەری خواﷺ دەفـەرموێت: ((**إِنَّ أَوَّلَ النَّاسِ يُقْضَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَيْهِ، رَجُلٌ اسْتُشْهِدَ فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ، أي الله، نعَمَتهُ فَعَرَفَهَا، قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَـالَ: قَاتَلْـتُ فِيكَ حَتَّى اسْتُشْهِدْتُ. قَالَ: كَذَبْتَ وَلَكِنَّكَ قَاتَلْتَ لِأَنْ يُقَالَ جَرِيءٌ، فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ.**))[٢١] واتـە: یەکـەم کەسـێ کـە خـودا ڕۆژی دوایی پرسیاری لەگەڵ دەکات، پیاوێکە شەهیدکراوە لە شەڕی گاوران، خوا پێی دەڵێ وەرە بزانم بەو نیعمەتەی کە بە ئێوەم بەخشی چیت کـردووە؟ دەڵێت: خوایە لە ڕێی تۆ شەڕم کـرد هـەتا شـەهیدکرام. خـودا دەڵـێ: درۆت کرد، بەڵکو شەڕت کرد بۆ ئەوەی بڵێن پیاوێکی ئـازا و زیرەکـی، پاشـان خـودا دەفـەرموێ: بیگـرن و لەسـەر دەم و چـاو ڕایبکێشـن ببیـەن بـۆ دۆزەخ ئـەی فریشتەکان.

(٢٠) رواه ابو نعيم والديلمي.

(٢١) رواه امام احمد ومسلم ونسائي

وە بەشی دووەمی فەرموودەکە دەڵێـت: ((**وَرَجُلٌ تَعَلَّمَ الْعِلْمَ وَعَلَّمَهُ وَقَرَأَ الْقُرْآنَ فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا. قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: تَعَلَّمْتُ الْعِلْمَ وَعَلَّمْتُهُ وَقَـرَأْتُ فِيكَ الْقُرْآنَ. قَالَ: كَذَبْتَ، وَلَكِنَّكَ تَعَلَّمْتَ الْعِلْمَ لِيُقَالَ عَالِمٌ وَقَرَأْتَ الْقُرْآنَ لِيُقَالَ هُوَ قَارِئٌ، فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ**)) واتـە: لەپاشـان پیاوێک دێنن کە فێری زانیاری بووە و فێری خوێندنەوەی قورئان بووە، پاشـان خوا پێی دەڵێ: وەرە بزانم چۆن ئیشت بەو نیعمەتـەی خـوا کـردووە. ئـەویش دەڵێت: من فێری زانیاری و خوێندنەوەی قورئان بوومە، خەڵکیشم فێرکـردووە تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆ و بەرزی ئـایینی ئیسـلام. خـواش وەڵامـی دەداتـەوە و دەڵێت: درۆدەکەی، بۆیە قورئانت خوێنـد تـا بڵـێن قورئـان خـوێنێکی باشـە و دەنگی خۆشە، بۆیە فێری زانیاری بوویت تا بڵێن زانایـەکی چـالاک و زیرەکـە. پاشان خوا فەرمان بە فریشتەکان دەدات لەسەر ڕوو رایبکێشن بۆ دۆزەخ.

بەشی سێیەمی فەرموودەکە دەڵێت: ((**وَرَجُلٌ وَسَّعَ اللَّهُ عَلَيْـهِ وَأَعْطَـاهُ مِـنْ أَصْنَافِ الْمَالِ كُلِّهِ فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا، قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: مَا تَرَكْـتُ مِنْ سَبِيلٍ تُحِبُّ أَنْ يُنْفَقَ فِيهَا إِلَّا أَنْفَقْتُ فِيهَا لَكَ. قَالَ: كَذَبْتَ، وَلَكِنَّكَ فَعَلْتَ لِيُقَـالَ هُوَ جَوَادٌ، فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ ثُمَّ أُلْقِيَ فِي النَّارِ**)) واتـە: پیـاوێکی تریش دێنن، کە خودا ماڵێکی زۆری پێداوە، پاشان بـانگی دەکـات و دەڵێـت: چۆن ئیشت بەو نیعمەتەی من کـرد؟ ئـەویش دەڵێـت: خوایـە لـەڕێی تـۆدا بەخشیم، ئەوەی تۆ حەزت پێکرد من بەخشیم. پاشان خوا وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: درۆت کرد، بۆ ئەوەی ماڵت بەخشی تـا بڵـێن سـەخی و نـان دەرە. لـە پاشان خوا دەفەرموێت: لەسەر ڕوو رایبکێشت بـۆ دۆزەخـی سـوتێنەر. (خوایـە بمانپارێزە لەم کردەوەیە).

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((**رُبَّ صَائِمٍ لَيْسَ لَهُ مِنْ صِيَامِهِ إِلَّا الْجُوعُ والعطـش**)) واتە: زۆر کەس هەیە لـە ڕۆژووگـران پاداشـی ڕۆژوویـان بـۆ نانوسـرێ، تـەنها

ماندوویی و برسیەتی و تینویەتی نەبێ (چونکە ئەندامەکانی لەشیان نەپاراستووە لە گوناە و تاوان، ئنجا خێر و پاداشتی دەست ناکەوێ لای خودای مەزن). پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((وَرُبَّ قَائِمٍ لَيْسَ لَهُ مِنْ قِيَامِهِ إِلَّا السَّهَرُ)) واتە: زۆرکەس هەیە لە نوێژکەران هیچ خێر و پاداشتی نوێژیان بۆ نانوسرێ، ماندوویەتی و شەونخونی نەبێ. واتە ئەگەر نوێژ و ڕۆژووی بۆ ڕەزامەندی خوا نەبێت بەهیچ جۆرێ پاداشتی و چاکەی نادرێتەوە.

پێغەمبەریشﷺ دەفەرموێت: ((من أحسن الصلاة حيث يراه الناس ثم أساءها حيث يخلو، فتلك إستهانة بها ربه))[٢٢] واتە: کەسێک بەڕێک و پێکی نوێژ بکات بۆ ئەوەی خەڵک چاوی لێی بێت، وە لەکاتی نهێنیشدا بە ەڕێک و پێکی نوێژ نەکات، ئەوا ئەو کەسە گاڵتەی بەخوای کردووە.

**تێبینی :**

ڕای زاناکان ئەوەیە هەر کردەوە و چاکەیەک بە مەرایی و ڕواڵەتی بێت، هیچ پاداشی بۆ نانوسیێ، مەگەر پەشیمان بێتەوە و واز لەم کارە بەدە بهێنێت.

هەروەها هەندێک لە زانایان ئەفەرموون: لەپاش کوفر -پەنا بەخوا- ریاکردنیان بە تاوان و گوناهێکی زۆر گەورە دایاناوە، چونکە حەزرەتﷺ ڕیاکردنی بە (شرك أصغر) داناوە، واتە شەریک بۆ خودا قەراردانی (دەرەجە دوو، ئەم ڕیاکردنە ئەبێتە هۆی (مەحوبوونەوەی) کرداره چاکەکانی ئینسان- خودا پەنامان بێت-.

---

(٢٢) رواه الطبراني وابو يعلي والبيهقي.

# تاوانی دووەم

## کوشتنی کەسێك بە ئەنقەست (قتل النفس عمداً)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: ((**وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا**))(٢٣) واتە: کەسێ بە ئەنقەست موسڵمانێک بکوژێت، ئەوا پاداشتی دۆزەخە هەتاهەتایە، خودا ڕکی خۆی بەسەردا دەڕژێنێ و نەفرەتی لێ دەکا و، سزایەکی سەختی بۆ ئامادە دەکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((**أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي الدِّمَاءِ**))(٢٤) واتە: یەکەم شت کە خوا ڕۆژی دوایی پرسیاری لەسەر دەکات بریتییە لە پیاوکوشتن، واتە خوێن ڕشتنە.

وە لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: ((**أَوَّلُ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ الصَّلَاةُ وَأَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ فِي الدِّمَاءِ**))(٢٥) واتە: یەکەم شت کە بەندە پرسیاری لەسەر لێ دەکرێت نوێژە، یەکەم شت کە خوا فەرمانی لەسەر دەردەکات لەنێوان خەڵک خوێن ڕشتنە.

خودا دەفەرموێت: ((**وَلاَ تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ**))(٢٦) واتە: ئەو کەسانە مەکوژن کە خودا کوشتنی قەدەغە کردوونە، تەنها مەگەر بە ڕەوا نەبێت.

---

(٢٣) سورەتی النساء ئایەتی ٩٣

(٢٤) رواه الإمام البخاري ومسلم.

(٢٥) رواه النسائي

(٢٦) سورەتی (الإسراء) ئایەتی ٣٣

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ ، وعدد منها: **قَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ**)) واتە: خۆتان بپارێزن لە حەوت گوناهی فەوتێنەر، یەکێک لەوانە کوشتنی کەسێکە کە خودا قەدەغەی کردووە، مەگەر بە ڕەوا نەبێ.

ئەم ڕەوایەی کە پێغەمبەری خوا کەرێگای کوشتنی داوە، ئەوەیە کە دەفەرموێت: ((**لا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ: كَفْر بَعْدَ إِيمان، وزَنَا بَعْدَ إِحْصَان، و قَتَل نَفْس بِغَيْرِ حق**))**متفق عليه**. واتە: ڕەوا نییە ڕژانی خوێنی موسڵمان تەنها بەسێ شت نەبێت. پاشگەزبوونەوەی پاش ئیسلام بوونی، داوێن پیسی پاش شووکردن یان ژنهێنان، کوشتنی کەسێک بەبێ تاوان.

خوا دەفەرموێت: ((**وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ**))[٢٧] واتە: ئەو بەندانەی کە بێجگە لە بەرنامەی خودا ئیش بە هیچ بەرنامەیەکی تر ناکەن. لە کۆتایی ئایەتەکە دەفەرموێت: ((**وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلاَ يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا**))[٢٨] واتە: وە ئەو کەسانە ناکوژن کە خودا کوشتنی قەدەغەکردوون، تەنها مەگەر بە ڕەوا نەبێ. وە داوێن پیسی ناکەن. وە هەر کەسێ ئەم کردەوانە بکات، گوناهبار دەبێ، خوا سزایەکی سەختی دەدات.

بەشەکەی تری ئەم ئایاتە دەڵێت: ((**يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا، إِلاَّ مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحًا**))[٢٩] واتە: سزایەکی بەتین دەدرێن و ئازار و سزاکەیان زیاتر دەکرێت، چونکە بێجگە لە بێباوەڕی و ئەوانە پیاوکوژ و داوێن پیس بوونە، لەم ئازارەدا دەمێننەوە و بە سووکی و بێنرخی تەمەشا دەکرێن هەتاهەتایە. مەگەر ئەوانەی کە پەشیمان دەبنەوە و باوەڕ دەهێنن و

---

(٢٧) سورەتی الفرقان ئایەتی ٦٨.

(٢٨) وشەی (يَلْقَ أَثَامًا) لە تفسير روح المعاني لاپەرە ٤٨ بەرگی ١٩ دەڵێت شیوێکە لە شیوەکانی دۆزەخ پڕە لە خوێن و خێزاو.

(٢٩) سورەی الفرقان ئایەتی ٧٠

کردەوەی چاک دەکەن، خوا لەو کەسانە خوش دەبێ، چونکە خوا بە بەزەیی و میهرەبانە.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((وإن أَكْبَرُ الْكَبَائِرِ عند الله يوم القيامة الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ وَقَتْلُ النَّفْسِ المؤمنة بغير الحق))رواه البخاري. واتە: گەورەترین تاوان لای خوا لە ڕۆژی دوایدا هاوبەش بۆ خودا پەیداکردن و کوشتنی کەسێکی بڕوادارە بەبێ تاوان.

هەروەها پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ أَعَانَ عَلَى قَتْلِ مُؤْمِنٍ بِشَطْرِ كَلِمَةٍ لَقِيَ اللَّهَ مَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ آيِسٌ مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ تعالى))[٣٠] واتە: هەرکەسێ بەشداری بکات بۆ کوشتنی موسڵمانێک، ئەگەر بە قسەیەکیش بێت، بە خزمەتی خوا دەگات ڕۆژی دوایی، وە لەنێوچەوانی نوسراوە بێبەشە لە بەزەیی خوا.

لە (ابن عباس) دەگێڕدرێتەوە کە یەکێک کوژرا لە سەردەمی پێغەمبەردﷺ لە شاری مەدینەدا، نەزانرا کێ کوشتوویەتی. پێغەمبەرﷺ بەسەر دوانگەی (المنبر) کەوت فەرمووی: ((أيها الناس، يُقتل القتيل وأنا فيكم ولا يُعلم من قتله)) واتە: فەرمووی: ئەی موسڵمانینە، منیش لەناو ئێوەدام و یەکێک یەکێکی کوشتووە، نەزانراوە کێ کوشتوویەتی.. پاشان فەرمووی: ((لو اجتمع أهل السماء والأرض على قتل امرىءٍ مؤمن لعذبهم الله إلاّ أن يفعل ما يشاء)) واتە: ئەگەر خەڵکی زەوی و ئاسمان خڕببنەوە لەسەر کوشتنی مرۆڤێکی موسڵمان سزایان دەدەم، تەنها مەگەر خودا خۆی سزاکە دوابخات.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((كُلُّ ذَنْبٍ عَسَى اللَّهُ أَنْ يَغْفِرَهُ إِلَّا الرَّجُلُ يَمُوتُ كَافِرًا أو الرَّجُلُ يَقْتُلُ الْمُؤْمِنَ مُتَعَمِّدًا))[٣١] واتە: لەوانەیە خوای بەبەزەیی لە هەموو

(٣٠) رواه ابن ماجه عن ابي هريرة ﷺ.

(٣١) رواه النسائي والحاكم– عن ابي درداء (وفي رواية عن معاويةﷺ).

گوناهێک خۆش ببێت، تەنها کەسێک بە کافری بمرێت، یان پیاوێک مرۆڤێکی موسڵمانی بێ‌تاوان بە ئەنقەست بکوژێت.

**تێبینی :**

(ابن حجر) ئەفەرمووێ لە پەرتووکی (الزواجر) زانایان ڕای جیاوازیان هەیـە کە پاش هاوبەشی دانان بۆ خودا گەورەترین تاوان بریتییە لـە کوشـتن، بـەڵام ئەوەی ڕاست و بێ گومان بێت پاش هاوبەش بۆ خودا پەیداکردن، کوشتنی بـە ئەنقەست بریتییە لە مەزنترین تاوان.

# تاوانی سێیەم

## جادووگەری (السحر)

خوای دەفەرموێ: ((وَلَكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا)) واتە: بەڵام شەیتانی ئادەمیزاد و جنۆکە باوەڕیان بەهێزی خودا نەبووە، ((يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ))[٣٢] واتە: هونەری جادوگەری فێری ئادەمیزاد دەکەن و تاکو ئێستاش هەر فێریان دەکەن..

خوا لە ئایەتێکی تردا ئەفەرمووێت: ((وَلاَ يُفْلِحُ السَّاحِرُونَ))[٣٣] واتە: هیچ لەو جادووگەرانە ڕزگاریان نابێ و بە ئاوات ناگەن.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا هُنَّ قَالَ الشِّرْكُ بِاللَّهِ وَالسِّحْرُ وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ وَأَكْلُ الرِّبَا وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ وَقَذْفُ الْمُحْصِنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ))[٣٤] واتە: ئاگاداربن لە حەوت گوناهی (فەوتێنەر). ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم گوناهانە کامانەن؟ فەرمووی: هاوبەش بۆ خودا پەیداکردن، وە جادوگەری، وە کوشتنی کەسێک کە خوا قەدەغەی کردووە بە ناڕەوا، وە خواردنی ماڵی بێباوک، وە خواردنی سوو، وە هەڵاتن لە شەڕی (کافراندا و) ئابڕووبردن و بوختان کردن بەو ئافرەتانەی کە بێئاگان.

پێغەمبەری خوداﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: ((ثَلَاثَةٌ لَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ: مُدْمِنُ خَمْرٍ، وَقَاطِعُ رَحِمٍ، وَمُصَدِّقٌ بِالسِّحْرِ)) واتە: سێ کەس ناچنە بەهەشت: (یەکەم) دەوام کردن لەسەر (عەرەق) تا کۆتایی ژیان. (دووهەم)

---

(٣٢) سورەتی (بقەرە) ئایەتی ١٠٣

(٣٣) سورەتی یونس ئایەتی ٧٧.

(٣٤) رواه الشيخان عن ابي هريرة ﷺ.

بڕینی پەیوەندی و سەردان لە کەسایەتی. (سێهەم) کەسێک بڕوایی بە جادوگەر هەیە.

لە (بجالەی کوڕی عبدە) ریوایەت کراوە کە دەڵێت: (أتانی عمر ﷺ قبل موتە بسنە ((أن اقتلوا کلّ ساحر وساحرة))[٣٥] واتە: کیتابی عومەری کوڕی خەتاب هات بۆ لامان ساڵێک بەر لە کۆچ کردنی، کەوا هەموو جادوگەری پیاو و ژن بکوژن..

**بۆ ئاگاداری :**

بەڵام لە کیتابی (**مذاهب الأربعة**) زانایانی شافعی دەڵێن: مرۆڤی جادوگەر ناکوژرێ (وەکافریش) نابێ بە مەرجێک بە نەزانی بزانێ جادوو دروستە لە ئیسلامدا، بەڵام ئەگەر جادوگەرەکە زانی قەدەغەیە و لەسەری بەردەوام بوو، ئەوا (کافر) دەبێ.

ئیمام نەوەوی دەفەرموێت: (کار و پیشەی جادوگەری دروست نییە و بە کۆمەڵی ڕای هەموو زاناکان یەکێکە لە گوناهە گەورەکان.

ئەمەش (دەقی) فەرمودەکەیە:

(**قا الإمام النووي (عمل السحر حرام) وهو من الکبائر بالإجماع..**).

---

(٣٥) رواه البخاري.

# تاوانی چوارەم

## وازهێنان لە نوێژ بە ئەنقەست (ترك الصلاة عمداً)

خوای مەزن دەفـەرموێت: ((مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ، قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ))[٣٦] واتە: ئەو کەسانەی کە سەرفراز و شادمان ئەبن لە ڕۆژی زیندوبونەوەدا پرسـیار ئەکەن لە تاوانبـارە گیرۆدەبووەکـان، چ هۆیـەک بـوو ئێـوەی فـڕێ دایـە نـاو (سەقەڕەوە)، واتە دۆزەخەوە، ئەوانیش دەڵێن ئێمە لە نوێژکەران نەبووین.

**هەروەها برا موسڵمانە بەڕێزەکان**

دەربارەی نوێژنەکەر ئایەت و فەرموودەیەکی یەک جار زۆر هـاتووە بەچـەند جۆرێک فەرموودەکان ڕیوایەت کراون، وە بەم جۆرەی کە شێخی (ابـن حجـر) دەربارەی نوێژ باسی کردووە ئەمانەن:

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الْكُفْرِ تَـرْكُ الصَّـلَاةِ))[٣٧] واتـە: ئەوەی موسڵمان و گاوری لێک جوێ دەکاتەوە بریتییە لە نوێژنەکردن.

وە لە ریوایەتێکی تردا پێغەمبەرﷺ دەفـەرموێت: ((ليس بَيْنَ العبد وبين الْكُفْرِ الا تَرْكُ الصَّلَاةِ))[٣٨] واتە: لێرە (ليس) بۆ نەفیـە، واتـە جیـاوازی نێـوان بەنـدەی موسڵمان و بەندەی بێباوەڕ بریتییە لە وازهێنان لە نوێژ.

لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: ((بَيْنَ الْكُفْرِ وَالْإِيمَانِ تَرْكُ الصَّلَاةِ))[٣٩] واتە جیاوازی نێوان بڕوایی و بێبڕوایی وازهێنانە لە نوێژ.

---

(٣٦) سورەتی (المدثر) ئایەتی ٤٣.

(٣٧) رواه البخاري وامام احمد.

(٣٨) رواه ابوداود والنسائي.

(٣٩ ) رواه الترمذي.

پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفـەرمووێ: ((**الْعَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْــنَهُمْ الصَّلَاةُ فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ**))[٤٠] واتە: پەیمانێ نێوان ئێمە و ئەوان نوێژە، ئـەوەی وازی لێ بێنێ بەڕاستی ئەوە بێباوەڕە.

دیسان دەفەرموێت: ((**من ترك الصَّلَاةَ مُتَعَمِّدًا فَقَــدْ كفــر جهــاراً**))[٤١] واتـە: کەسێک بە ئەنقەست نوێژێت بچوێنێت، بەڕاستی و بە ئاشکرا بێباوەڕ بووە.

لەم فەرموودانە بۆمان دەردەکەوێ ئەو کەسەی نوێــژ بکـات ڕووکەشـی بـە موسڵمان دەناسرێ، بەڵام ئەگەر نوێژی نەکرد، ئەوە بە پێچەوانەوە.

لە پێغەمبەرﷺ دەگێڕدرێتەوە کە فەرموویـەتی: ((**من لم يصلي فهو كافر**))[٤٢] واتە: هەرکەسێ نوێژ نەکات ئەوە بێباوەڕە.

پرسیاریان لە ئیمامی عەلی (خوا لێی رازی بێت ) کرد دەربارەی ژنێک کە نوێژی نەدەکرد، لەم بارەوە ئیمام فـەرمووی: ((**من لم يصلي فهو كافر**))[٤٣] واتـە: هەرکەسێ نوێژ نەکات ئەوە بێباوەڕە.

ت الصلاة فقد كفر وليس من الاعمال شئ تركه كفر الا الصلاة
من تركها فهو كافر و قد أحل الله قتله

**سەرنجێك:**

لە (زواجر)ی شـیخ (ابـن حجـر) دەفـەرموێ و دەڵێـت: زانـا ئایینيیـەکان دەربارەی نوێژنەکـەر (رأی) جیاوازیـان هەیـە، بـەڵام زۆربـەی فـەرموودەکان دەست نیشانی ئـەوە دەکـەن کـە نوێژنەکـەر بێبـاوەڕە دەرچـووە لـە چـینی موسـڵمانان. لەگـەڵ ئەوەشـدا هاوەڵـەکانی (أصـحاب)ی پێغەمبـەرﷺ هـیچ کردەوەیەکیان بە (کافری) دانەدەنا تەنها نوێژنەکردن نەبێ.

---

(٤٠) رواه احمد وابوداود والنسائي والترمذي عن بريدةﷺ.
(٤١) رواه الإماد طبراني.
(٤٢) رواه البخاري.
(٤٣) رواه البخاري.

بەلاّم ئیمامی شافعی (خوا لیٚـی رازی بێـت ) و هەنـدێک لـە زاناکـاتی تـر دەڵـێن نوێژنەکـەر کـافر نابـێ، مەگـەر دانـی پیانـەنێت (انکـار)، واتـە بڵێـت نوێژکردن (فەرز نىیە) واتە پێویست نیە.

**تێبینی:**

بەرای ئەم پێشەوایانە (حەنـەفی و ماڵیـک و شـافعی) (رەحمـەتی خوایـان لێبێ) دەڵێن: ئەگەر کەسێک بێباوەڕ و بێ (ئیمان) نەبێت لە کردنـی نوێـژە فەرزەکانی (کافر) نابێت.

بەلاّم بەڕای ئیمامی ماڵیک و شافعی دەڵێن: دروستە پێشـەوای موسـڵمانان فەرمان بکات بە کوشتنی نوێژنەکەر بەهۆی (یاسایی) شـەرعیيەوە، نـەک بـە تاوانی بێباوەڕیەوە، بەڵکو بە تاوانی نوێژنەکردن، چونکە بە نوێژنەکردن (کافر) نابێت.

بەلاّم پێویستە یەکـەم جـار داوای پەشـیمان بوونـەوەی لێبکرێـت، بـەلاّم ئەگەر پەشیمان نەبۆوە ئەکوژرێ کە (شیرێک) لە ملی بـدرێت. بـەلاّم بـەڕای ئیمامی (حەنەفی) کوشتنی دروست نىیـە بکـوژرێ و بـەڵکو دەڵێـت دەبێـت بخرێتە بەندیخانەوە، تا پەشیمان دەبێتەوە و دەست دەکاتەوە بە نوێژکردن.

پرسیار: ئەگەر یەکێک پرسیار بکات لەبابەت ئەم فەرموودانەی پێغەمبەرﷺ کە وا دەگەیەنن نوێژنەکەر بێبڕوایە؟

وەلاّم: هەندێ لە زانایان دەفەرموون ئـەم فەرموودانـە لەسـەر ئـەو کەسـانە ڕادەهێنرێت (تگبیق) دەکرێ کە دەڵێن نوێژکردن گرنگ نىیە و باوەڕیان بـە فەڕزبوونی نىیە. بەلاّم ڕاسـتییەکەی ئەوەیـە کـە موسـڵمان بـە نوێژنـەکردن (کافر) نابێ و پێی دەڵێن (فاسق) واتە لەڕێگالادان.

**باسێك لەبارەی گوناهی دواخستنی نوێژ**

خوا دەفەرمووێت: ((**فَخَلَفَ مِنْ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلَاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا**)) واتە: لەپاش خۆیان دەستەیەکیان بەجێهێشت کە نوێژیان دوادەخست و سەریان بۆ ئارەزوویان دادەناواند، ئا ئەوانە لەمەودوا بەرەنگاری سزایەکی زۆر سەخت دەبن.

لە دواییدا خوا دەفەرموێت: ((**إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا**))[٤٤] واتە: مەگەر ئەوانە پەشیمان ببنەوە و کردەوەی چاک بکەن.

(ابن عباس) (خوا لیێی رازی بێت ) دەڵێت: لێرەدا وشەی (**أضاعوا**) مانای دۆڕاندن و وازهێنانی نییە بە تەواوی، بەڵکو سستی و کەمتەرخەمی و دواخستنی نوێژەکەیە لەکاتی خۆی.

(سعیدی کوڕی مسیب) پێشەواو گەورەی تابعین[٤٥] (خوا لیێی رازی بێت) دەڵێت: ئەو کەسانەی کە نوێژی نیوەڕۆ ناکەن، هەتا ئەیگەیەنن بە نوێژی عەسر، نوێژی عەسر ناکەن تاکو دەیگەیەنن بە نوێژی ئێوارە (مغرب) و، نوێژی شەو ناکەن تا دەگاتە بەیانی و، نوێژی بەیانی ناکەن تا ڕۆژ هەڵدێت. (مانای وایە نوێژەکە دەچوێنن و دەیفەوتێنن). هەرکەسێک بمرێت و سوور بێت لەسەر ئەم کردەوەیە و پاشگەز نەبێتەوە، خوای گەورە پەیمان و بەڵێنی داوە بیخاتە ناو (غَی) کە شوێنێکی زۆر قوڵە لە دۆزەخ سزای زۆر سەختە.

خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ((**فَوَيْلٌ لِلْمُصَلِّينَ، الَّذِينَ هُمْ عَنْ صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ**))[٤٦] سزای سەخت بۆ ئەو کەسانەی کە لە نوێژکردن سستی دەکەن و بێئاگان و دوایی دەخەن.

---

(٤٤) سورەی (مریم) ئایەتی ٦٠.

(٤٥) تابعین، بەو کەسانە دەڵێن کە بە خزمەتی (یارانی) حەزرەتی پێغەمبەرﷺ گەیشتوونە.

(٤٦) سورەتی (الماعون) ئایەتی ٥

پێغەمبەرﷺ دەفــەرموێ: ((هم الذين يؤخرون الصلاة عن وقتــها)) واتــە ئــەو کەسانەن کە نوێژ دوا دەخەن لە کاتی خۆیدا هەتا ئەیچووێنن.

خوا لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تُلْهِكُمْ أَمْــوَالُكُمْ وَلاَ أَوْلاَدُكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْخَاسِرُونَ))[٤٧] واتــە: ئــەی ئــەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە، با ماڵ و منداڵتان بێئاگاتــان نــەکات لــە یــادی خوا، وە ئەو کەسەی گوێ بە نوێژەکانی نەدات بێبەشە لە ڕەحم و بەزەیی خوا لە ڕۆژی دواییدا.

زۆر لە موفەسیرەکان دەڵێن مەبەست لە (ژکر الله) لێــرەدا مەبەســتی پێــنج نوێژەکەیە، هەرکەسێ کە خۆی زۆر خەریک بکات بە ماڵی دونیــا لــە کــڕین و فرۆشتن و ڕۆزی پەیداکردندا یاخوود منداڵ، ئــەوا ئــەو شــتانە مــرۆڤ بێئاگــا دەکەن لە یادی خوا، ئەوانەش کە شتی وا دەکەن هەر زەرەرمەند دەبن.

پێغەمبەرﷺ ((أَوَّل مَا يُحَاسَبُ عليهِ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ الصَلَاة فَإِنْ صَلُحَتْ صــلح سَائِرُ عَمَلِهِ وَإِنْ فَسَدَتْ فسد سائر عمله))[٤٨].

واتە یەکەم شتێ کە خوا لە ڕۆژی دوایی (موحاسەبەی) بەندە بکات، نوێــژە. بەڕاستی ئەگەر نوێژەکانی بە تەواوی کردبێ، ئەوا کردەوەکــانی تریشــی بــاش دەبێ، بەڵام ئەگەر نوێژەکانی بە تەواوی نەکردبێ، ئــەوا کردەوەکــانی تریشــی هەموو خراپ دەبن.

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((لَتُنْقَضَنَّ عُرَى الإِسْلَامِ عُرْوَةً عُــرْوَةً فَكُلَّمَــا انْتَقَضَتْ عُرْوَةٌ تَشَبَّثَ النَّاسُ بِالَّتِي تَلِيهَا، فَأَوَّلُهُنَّ نَقْضًا الْحُكْمُ وَآخِرُهُنَّ الصَّلَاةُ))[٤٩].

واتــە: دەســکی ئیســلام دەســک هەڵدەوەشــێندرێتەوە، هــەرجارێک

---

(٤٧) سورەتی (المنافقون) ئایەتی ٩.

(٤٨) رواه الترمذي والطبراني.

(٤٩) رواه ابن حبان.

دەسکێکی هەڵدەوەرێ و خەڵکەکە دەست دەگرن بە دەسکەکەی ترەوە، یەکەم دەسک کە هەڵدەوەشێندرێتەوە (حوکمڕانی) و دوا دەسکیش نوێژە.

ڕۆژێک پێغەمبەرﷺ باسی گەورەیی و گوناهی نوێژی دەکرد دەیفەرموو: ((مَنْ حَافَظَ عَلَيْهَا كَانَتْ لَهُ نُورًا وَبُرْهَانًا وَنَجَاةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ لَمْ يُحَافِظْ عَلَيْهَا لَمْ يَكُنْ لَهُ نُورٌ وَلا بُرْهَانٌ وَلَا نَجَاةٌ وَكَانَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَعَ قَارُونَ[٥٠] وَفِرْعَوْنَ[٥١] وَهَامَانَ[٥٢] وَأُبَيِّ بْنِ خَلَفٍ[٥٣]))[٥٤] واتە: هەرکەسێ ئاگاداری هەر پێنج فەرزە نوێژەکان بکات، بۆی ئەبێ بە ڕووناکی و بەڵگە و ڕزگاری لە ڕۆژی دوایی، هەر کەسێک ئاگاداریان نەبێت نە بۆی دەبێ بە ڕۆناکی و نە بە بەڵگە و نە ڕزگاری و ڕۆژی دوایی لەگەڵ قاروون و فیرعەون و هامان و (أبی کوڕی خلف) دەبێ.

(ئەی برایانی موسوڵمان) زۆر لەسەرمان پێویستە کە ئاگاداری نوێژەکانمان بین لەبارەی (سجدە و رکوعەکانی) بە تەواوی جێبەجێیان بکەین و زۆر بە مڵکەچیەوە و بەترسەوە (خشوع) کۆتایی بە نوێژەکانمان بێنین بە ڕێک و پێکی جێبەجێیان بکەین، چونکە دەزانی ئێمە (موناجات) لەگەڵ کێ ئەکەین؟ پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ((إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ فِي صَلَاتِهِ فَإِنَّهُ يُنَاجِي رَبَّهُ أَوْ إِنَّ رَبَّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ)).[٥٥] واتە: هەرکاتێک یەکێ لەئێوە هەستا بۆ

---

(٥٠) قاروون ئامۆزایەکی حەزرەتی موسا بوە. وا دەگێڕنەوە لە سەردەمی حەزرەتی (موسی علیه السلام) هات بۆ لای حەزرەتی (موسی-ع) لێ پاڕایەوە (دوعای) بۆ بکات خوا رزق و ڕۆزی بداتێ، حەزرەتی موسا زانیاری کیمیای ئەزانی، قارونی فێرکرد،- -قارون زۆر دەوڵەمەند بوو، سەروەت و سامانی گەیشتە پلەیەك ژمارە نەئەکرا، وەکو قورئان بۆمانی باس دەکات، حەزرەتی مووسا (ع) داوای زەکاتی لە قارون کرد، بەڵام ئەو (بە سەرانە) ژمارەی کرد، لەسەر ئەم بێ(ئەدەبیە) خوا بردی بە قووڵای زەویدا بە خۆی و ماڵ و سامانەکەیەوە هەتاهەتایی.

(٥١) فیرعەون کابرایەکی (زاڵم بوە) واتە ستەمکار بووە، داوای خوایەتی کردوە.

(٥٢) هامان وەزیری فیرعەون بووە، کابرایەکی زۆر بێدین بووە.

(٥٣) ئوبەی کوڕی (خەڵەف) ئەڵقە لەگوێیەکی (کافرەکانی) سەردەمی پێغەمبەرﷺ بووە، زۆر ئازاری پێغەمبەر و یارانی داوە، هەروەها بە کافری تۆپیوە.

(٥٤) رواه أحمد والطبراني.

(٥٥) رواه البخاري.

بەجێهێنانی نوێژ، وتووێـژ لەگـەڵ خـودا ئـەکات. یـا بەڕاسـتی پـەروەردگار لەنێوان نوێژکەر و ڕووگەدایە.

لە عەبدوڵای کوڕی (ئەشعەریەوە) ڕیوایەت کراوە کـە پێغەمبـەرﷺ چـاوی کەوت بە پیاوێک ڕکوعەکانی تـەواو نـەدەکرد و، گرنگـی بـە سـجدە نـەدەدا. پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: ((**لو مات هذا على حاله مات على غير ملّة محمـــد**))(٥٦) واتە: ئەگەر ئەو پیاوە بمرێت بەڵام بەم جۆرە کـە نوێژەکـەی بـەڕێک و پێکـی ناکات، لەسەر )غەیری) میللەتی (محمد) ئەمرێ.

لە فەرموودەیەکی تردا دەفـەرموێت: ((**مثل الذي لا يـــتم ركوعـــه وينقـــر في سجوده مثل الجائع يأكل التمرة والتمرتين لا تغنيان عنه شيئاً**))(٥٧) واتە: ئەو کەسەی نوێژ دەکا و سجدە و ڕکوع بە تەواوی ناکات، وەک یەکێکە دەنکـە خورمایـەک یان دوو دەنک بخوا و پێی تێر نەبێت.

کەواتە لەسەرمان پێویستە ئەی موسڵمانەکان کە نوێـژەکانمان بـە ڕێـک و پێکی و لەکاتی خۆیدا بکەین، چونکە پێغەمبەری خواﷺ دەفـەرموێت: ((**أَحَبُّ الْأَعْمَالِ إِلَى اللَّهَ الصَلَاةُ لوقتها**))(٥٨) واتـە: باشـترین و خۆشەویسـتترین کـردەوە لەلای یەزدان نوێژکردنە لە کاتەکانی خۆیدا بکرێت.

**تێبینی :**

دواخستنی نوێژە فەرزەکان بە ئەنقەست بەبێ (عووزر و) مهانە، لـە گوناهـە گەورەکان دادەنرێـت، پێویسـتە هـەر نوێـژێک کـە فـەوتا یەکسـەر (بەقـەزا) بگێڕدرێتەوە.. پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێکی خاوەن باوەڕ ئامۆژگاری ئەو

---

(٥٦) رواه الطبراني وابو يعلى

(٥٧) رواه الطبراني وابن خزيمة.

(٥٨) رواه الطبراني.

کەسانە بکات کە نوێژ ناکەن، یان وازیان لە نوێژ هێنـاوە، بەتایبـەتی ئەوانـەی کە مافیان هەیە لەسەرمان وەک خزم و کەس و منداڵەکانمان.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((مُرُوا صِبْيَانَكُمْ بِالصَّلَاةِ لِسَبْعِ سنِين وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا لِعَشْر سنِين وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ))[٥٩] واتە: فەرمان بە منداڵـەکانتان بـدەن بۆ نوێژ لە کاتێکدا کە تەمەنیان حەوت ساڵە و، ئەگەر نەیان کـرد لـە تەمـەنی دە ساڵیدا لێیان بدەن، جییان بکەنەوە. هەروەها لە خەوتندا جێگای نوسـتنیان لێ جیابکەنەوە.

(ئیمام ابو سلێمانی خەتابی) کە زانایەکی زۆر بەناوبانگ و بلیمەت بـووە بـۆ لەبەرکردنی فەرموودەکانی پێغەمبـەرﷺ، دەڵێـت: ئـەو فەرموودەیـە بەڵگەیـە لەسەر سزایەکی سەخت بۆ ئـەو کەسـانەی (خۆیـان ناسـیوە) و نوێـژ ناکـەن. (بەڵێ) نوێژنەکەر لە هەر ماڵێکدا بێت نەگبەتە و بەرەکەتی ئەو ماڵـە ناهێڵێـت و ئەیبات.

## باسی نوێژکردن بە کۆمەڵ (جەماعەت)

نوێژکردن بە کۆمەڵ خێـر و پاداشـتی یـەک جـار زۆرە، بەتایبـەتی لـەلای خودای مەزن، چونکە حەزرەتی پێغەمبەرﷺ دەفـەرموێت: ((صَـلَاةُ الْجَمَاعَـةِ أَفْضَلُ من صَلَاةَ الْفَذِّ (أي المنفرد) بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً))[٦٠] واتە: نوێـژێک کـە بـە کۆمەڵ بکرێت باشترە و خێری زیاترە لە نوێژێک کە بە تەنها بکرێت بە بیسـت و حەوت پلە (درجە) بەڕاستی نوێژی (جەماعەت) واتە کۆمـەڵ لـە مزگەوتـدا بکرێت خێری یەک جار زۆرە.

---

(٥٩) رواه ابوداود في سننه.

(٦٠) رواه الشيخان عن عبدالله ابن عمرﷺ.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەربارەی ئەو کەسانەی کە واز لە نوێژی بەکۆمەڵ دەهێنن دەفەرمووێت: ((**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِحَطَبٍ فَيُحْطَبَ ثُمَّ آمُرَ بِالصَّلَاةِ فَيُؤَذَّنَ لَهَا ثُمَّ آمُرَ رَجُلاً فَيَؤُمَّ النَّاسَ، ثُمَّ أُخَالِفَ إِلَى رِجَالٍ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ**)) واتە: سوێن بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە، بیروباوەڕم وایە کە فەرمان بکەم دار و چیلکەیەکی زۆر کۆبکەنەوە و لە پاشان فەرمان بدەم بە بانگدەرێک کە بانگ دا بۆ نوێژ، لە پاشان پیاوێک بکەم بە پێشنوێژ(امام)، ئنجا پاشان بچم بۆماڵی ئەو پیاوەی کە نایەت بۆ نوێژی بە کۆمەڵ، ماڵیان بسوتێنم.

لە ریوایەتێکی تردا پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**ثُمَّ أَنْطَلِقَ مَعِي بِرِجَالٍ مَعَهُمْ حُزَمٌ مِنْ حَطَبٍ إِلَى قَوْمٍ لَا يَشْهَدُونَ الصَّلَاةَ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ**))[٦١] واتە ویستم بڕۆم، لەگەڵ خۆم هەندێک پیاو ببەم و، هەندێ کۆڵە داریان پێبێت، پاشان بچم بۆ لای ماڵی ئەو کەسانەی کە گوێیان لە بانگ بووە و نایەن بۆ نوێژی بە کۆمەڵ، ماڵیان بەسەردا بسوتێنم.

لە ئەبی هورەیرەوە دەگێردرێتەوە (خوا لێی رازی بێت) کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**إِنَّ أَثْقَلَ صَلَاةٍ عَلَى الْمُنَافِقِينَ صَلَاةُ الْعِشَاءِ وَصَلَاةُ الْفَجْرِ**)) واتە: گرانترینی نوێژ لەسەر دووڕوناپاکەکان نوێژی بەیانی و نوێژی ئێوارانە. پاشان لە کۆتایی فەرموودەکە دەفەرمووێت: ((**وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا**))[٦٢] واتە: بەڵام ئەگەر ئەو دووڕوانە بیان زانیایە ئەم دوو نوێژە چ خێر و گەورەیییەکی تێدایە، ئەوە بە گاگۆڵک، واتە/ لەسەر چۆک بۆی دەڕۆیشتن و دەچوون.

---

(٦١) رواه الشيخان

(٦٢) رواه البخاري ومسلم عن ابي هريرةرضي الله عنه

**ئاگادارییێک** :

له (زواجر)ی (ابن حجر) دەڵێت: ئەو فەرموودانــەی کــە بــاس کــراوە لــەلای **(امام احمد)** و زاناکانی تر، نوێژی بە کۆمەڵیان بە **(فەرزی عەین)** داناوە، واتە بــە پێویست. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ لە (مەزهەبی شافعیﷺ) بە **(فەرزی کیفایە)** دانراوە، واتە چەند کەسێک لەو ناوچەیە بیکات ئەم (فــەرزە) لەســەر هــەموان لادەچێ، بەڵام ئەگەر ئەو چەند کەسەش نــەیان کــرد، ئــەوا هــەموو گوناهبــار دەبن.

پاشان دەڵێت ئەو کەسانەی کــە نوێــژی بەکۆمــەڵ ناکــەن، بــەبێ (عــوزری شەرعی) بە تاوانکارە گەورەکان دادەنرێ و دەژمێردرێت.

**تێبینی:** نوێژی کۆمەڵ سێ بەشە؛

**یەکەم/** نوێژی هــەینی **(الجمعة)** کردنــی ئــەم نوێــژە بــە کۆمــەڵ فــەرزی (عەین)ە، واتــە پێویســتە لەســەر موسڵمانێکی پیــاو بــەجێی بهێنــێ، مــادام (عوزرێکی) واتە بیانوویەکیی پێدراوی (شەرعی) نەبێت، وەکو نەخۆشــی یــان ترس و بیمی دوژمن یان وەک ڕەشەبا و بەفر و بارانی زۆر.

**دووەم/** جەماعەتی نوێــژە فــەرزەکان: ئەمــە فــەرزی (کیفایە)یــە وەک لــە پێشەوە باسمان کرد. کەواتە ئەگەر چەند کەسێ ئامادەبوون بــۆ بــەجێهێنانی ئەمە (تاوان) لەسەر ئەو نامێنێ کە ئامادەی جەماعەت نەبوون.

**سێیەم/** جەماعــەتی نوێــژە ســوننەتەکان: وەکــو نوێــژی جەژنــەکان و نوێژەبارانە **(صلاة الأستســـقاء)** و نوێــژی ڕۆژ گیــران و مــانگ گیــران **(صــلاة الكسوف والخسوف)** و نوێژی (تــەراویح) و نوێــژی مــردوو. بــەجێهێنانی ئــەو نوێژانە بە (جەماعەت) واتە بە کۆمــەڵ (ســوننەتێکی) زۆر گەورەیــە. هــەروەها نوێــژی هــەینی و نوێــژی جەماعــەت بــۆ ئــافرەت ســوننەتە بــە مــەرجێک

بێ(شەرعی) تیا ڕوونەدات، وە دروستە کۆمەڵێک ئافرەتێک بکەن بە پێش نوێژ(ئیمام) بۆ خۆیان.

**پرسیار/** جیاوازی نێوان فەرزی (کیفایە) و فەرزی (عەین) چییە؟

وەڵام/ فەرزی کیفایە: واتە کۆمەڵێک لە خەڵکی ناوچەکە ئەم فەرزە جێبەجێ بکەن ئەو گوناهەکە لەسەر هەموان لادەچێ. بۆ نمونە نوێژی بە کۆمەڵ لە مەزهەبی ئیمامی شافعی.. ئەما (فەرزی عەین) واتە لەسەر هەموو کەسێک (فەرزە)، واتە پێویستە کە ئەم فەرمانەی خودا جێبەجێ بکات. بۆ نمونە نوێژی (جمعە) واتە هەینی.

**باسێك دەربارەی تاوانی وازهێنان لە نوێژی هەینی (جمعە)**

خوای گەورە دەفەرموێت: ((**يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلاَةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ**))[٦٣] واتە: ئەی ئەو کەسانەی خاوەن باوەڕن، هەرکاتێک بانگ درا لە ڕۆژی هەینيدا، ئەوا بە پەلە بڕۆن بۆ یادی خوا بۆ نوێژکردن و ئامادەبوون بۆ وتاری هەینی (خگبە) و، دەست هەڵگرن لە کڕین و فرۆشتن و کەسابەت، ئەوە باشترە بۆ ئێوە ئەگەر بزانن.

لە (**ابي جعدي كوڕی ضميريەوە**) دەگێڕدرێتەوە کە زۆر هاوڕێیەتی پێغەمبەری کردووەﷺ: ((**مَنْ تَرَكَ ثَلَاثَ جُمَعٍ تَهَاوُنًا بِهَا طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قَلْبِهِ**))[٦٤] واتە: هەرکەسێک سێ نوێژی هەینی بەبێ عوزری شەرعی پشت گوێ بخات و وازی لێ بێنێت، خوای مەزن دڵی ئەو کەسە مۆر دەکات و تاریکی دەکا و دوور دەبێ لە بەزەیی خوا.

---

**(٦٣) سورە الجمعە– ئایەتی ٨**

**(٦٤) رواە احمد وابوداود والنسائي.**

پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: ((**مَنْ تَرَكَ ثَلَاثَ جُمَعات من غير عُذرٍ كُتب من المنافقين**))[٦٥] واتە: هەرکەسێک سێ نوێژی هەینی بەبێ (عوزری شەرعی) بچوێنێت، ئەوە لە ڕیزی ناپاکان دەنووسرێ، مەگەر پەشیمان بێتەوە.

لە پەڕتووکی شەرعدا دەفەرموێت: (نوێژی هەینی پێویستە و فەرزە لەسەر هەموو پیاوێکی بڕوادار کە خۆی ناسی بێت و ئازاد و نیشتەجێ بێت، هەروەها واجبە لەسەر هەموو کۆمەڵێ کە نیشتەجێ و چەسپاو بێت، با خەڵکی گوند و دێهاتیش بن، لەسەر (مەزهەبی شافعی) پێویستە لە چل کەس کەمتر نەبێ. هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((**الجمعة حق واجب على كل مسلم إلا أربعة: عبدٌ مملوك أو إمرأة أو صبي أو مريض**))[٦٦] واتە: نوێژی هەینی فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێ، تەنها لەسەر چوار کەس نەبێت: بەندە و، ئافرەت و، منداڵ و، نەخۆش.

هەروەها لەسەر شێت و گەشتکەر(مسافر) فەرز نییە، ئەگەر پێش هەڵاتنی بەیانی بچێتە دەرەوە).

ئیمامی ترمزی لە (ابن عباس) ڕیوایەتی کردووە کە پرسیار کرا دەربارەی پیاوێک کە بەڕۆژ بەڕۆژوو دەبێت و بە شەو شەونوێژ دەکا. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا (جومعە و جەماعەت) ناکا، واتە نوێژی هەینی و نوێژی بەکۆمەڵ ناکات؟ (ابن عباس) فەرمووی: ئەوە بۆ ناو ئاگرە.

---

(٦٥) رواه الطبراني عن اسامة.رضي الله عنه

(٦٦) رواه ابوداود.

**تێبینی:**

بەڕای هەموو زانایان (نوێـژی هـەینی فـەرزی عەینـە) و هەرکەسـێ وازی لێبێنێت بە گوناهێکی گەورە دادەنرێت، بە مەرجێک هیچ عوزرێکی شـەرعی نەبێت.

پێغەمبەرﷺ دەفـەرمووێت: ((**مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ فَلْيَتَصَدَّقْ بِدِينَارٍ فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَبِنِصْفِ دِينَارٍ**))[٦٧] هەرکەسێ بەبێ )عوزری شەرعی) نەیەت بـۆ نوێـژی هەینی، با ئەو کەسە یەک دینار بدات بە هـەژارێک، تـاکو ببێتـە (کـەفارەتی) گوناهەکەی، ئەگەر دینارێکی نەبوو با نیو دینار بدات.

پاشکۆ:

**نوێژی هەینی پێنج مەرجی هەیە، جگە لە مەرجەکانی نوێژ:**

١. کاتەکەی نیوەڕۆیە، ئەگـەر نوێـژی لـەکاتی نیـوەڕۆ تێپـەڕيکرد بـە قـەزا ناگێڕرێتەوە، ئەبێ نوێژی نیوەڕۆ بگێڕرێتەوە.

٢. ئەبێ نوێژەکە لـەناو شـاردا یـان لـەناو دێـدا بکرێـت، نـەک لـە دەشـت و دەرەوەی شارەکە یان دێکە.

٣. ئەبێ نوێژەکە پێش نەکەوێ و بەرانبەری نەکات لەگەڵ نوێژێکی تردا لـەو جێگەیەدا، واتە تەنها لە شارێکدا یان لە دێیەکـدا یـەک نوێـژی هـەینی بکرێت، مەگەر شارەکە گەورە بێت و خەڵکی دانیشتووانی شارەکە زۆر بـن و جێگایان نەبێتەوە، ئەو کاتە درووستە لە دوو مزگەوتدا یان زیاتر نوێـژی هەینی بکرێت.

٤. ئەبێ نوێژی هەینی بە کۆمەڵ بکرێت و مەرجی نوێژی جەماعەتی هـەینی وەک جەماعەتی نوێـژەکانی تـر وایـە، نوێـژی هـەینی دوو ڕکاتـە، بـەڵام جەماعەتی نوێژی هەینی ئەبێ لە چل -٤٠- کەس کەمتر نەبێ و، ئەو چـل

---

(٦٧) رواه احمد وابوداود والنسائي.

کەسەش پیاو بن، وەک پێغەمبەرﷺ بە چل کەس نوێـژی هـەینی پـێ‌ی کردون.

((عن ابن مسعودرضي الله عنه قال جمع النبی بالمدینـه ونحـن أربعـون رجـلاً))[68]

واتە: ئیبنو مەسعود(خوا لێی رازی بێت) دەڵێ: پێغەمبـەرﷺ لـە مەدینـە (جومعەی) کرد ژمارەمان چل پیاو بوو..

کەوابوو ئەگەر شوێنێک چل پیاوی لێنەبو (جومعەیان) لەسەر نیە. بـەلاّم ئەگەر گوێیان لە بانگی شوێنێکی تر بو، ئـەبێ بچـن بـۆ ئـەوێ (جومعـە) بکەن.

5. خوێندنەوەی دوو وتار (**خطبتان**) لە پێش نوێژەکەدا.

هەروەها لەو دوو وتارەدا واجبە پێنج (روکنـەکان) بـە عـەرەبی بـن یەکـەم سوپاسی خوایە بڵێ (**الحمدلله**)، دووەم سەلاّوات لەسەر پێغەمبەرﷺ بڵـێ (**اللهم صلّ علی محمد**)، سێیەم وئامۆژگاری بە ترسان لە خودا بڵێ (**أوصـیکم بتقـوی الله**)، چـوارەم خوێندنـەوەی ئایـەتێکی قورئـانی پیـرۆز لـە وتارێکـدا. پێنجـەم دوعاکردن بۆ موسڵمانان. لە وتاری دووەمدا بەلای کەمی دەبێ بڵێ (**اللهم أغفر للمسلمین والمسلمات**)، جگە لەم پێنجانە واجب نیە وتارەکان بە عەرەبی بن.

---

(٦٨) رواه البیهقي.

# تاوانی پێنجەم

## نەدانی زەکات (مانع الزکاة)

خوای گەورە دەفەرمووێت: ((وَوَيْلٌ لِلْمُشْرِكِينَ، الَّذِينَ لاَ يُؤْتُونَ الزَّكَاةَ))[٦٩] واتە: قوڕ بەسەری و ئازاری سەخت بۆ ئەو هاوبەش پەیداکەرانەی کە زەکات نادەن. خوای مەزن ناوی زەکات نەدەری بە هاوبەش پەیداکەر ناوبردووە.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرمویێت: ((وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمْ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَهُمْ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ))[٧٠] واتە: با گومان نەبەن ئەوانەی کە ڕەزیلی دەکەن، کە خوا ماڵ و سامانێکی زۆری پێ بەخشیون و زەکاتی ماڵی خوا نادەن. ئەوانە قازانج ناکەن، بەڵکو زیانیان پێ دەگا و دەبێتە تەوقی ئاگرین لە ئەستۆیان لە ڕۆژی دوایی.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرمویێت: ((وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ))[٧١] واتە: ئەوانەی کە زێڕ و زیو و پارە و سامانیان هەیە و کۆی دەکەنەوە و خەرجی ناکەن لەڕێی خوادا، واتە زەکاتی ماڵی خوای لێ نادەن، ئەوا موژدەیان بدەنێ بە چێشتنی ئازارێکی بە ئێش.

وە دەفەرمویێت: ((يَوْمَ يُحْمَى عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَى بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَذَا مَا كَنَزْتُمْ لأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ))[٧٢] واتە: ئەو ڕۆژە دێت کە ڕۆژی لێپرسینەوەیە، تیایدا ئەو زێڕ و زیو و پارە و سامانە سوور دەکرێتەوە بە لەشیان وەدەنێن، ناوچەوان و تەنیشتیان و پشتیانی پێ داخ دەکرێت، پاشان فریشتەی سزا پێیان دەڵێن ئەو سزا سەختە بچێژن، هەر بەو زێڕ و سامانەی کۆیان کردۆتەوە سزا دەدرێن و، سزای پێ دەچێژن.

---

(٦٩) سورة فصلت اية ٦

(٧٠) سورة آل عمران آية ١٨

(٧١) سورة التوبة آية ٣٤

(٧٢) سورة التوبة ئایەتی ٣٥.

هەروەها پێغەمبەرﷺ لە فەرمووودەیەکی تردا دەفەرمووێت: ((**مَا مِنْ صَاحِبِ ذَهَبٍ وَلا فِضَّةٍ لا يُؤَدِّي مِنْهَا حَقَّهَا إِلاَّ إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ صُفِّحَتْ لَهُ صَفَائِحُ مِنْ نَارٍ فَأُحْمِيَ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَيُكْوَى بِهَا جَنْبُهُ وَجَبِينُهُ وَظَهْرُهُ**))(٧٣) واتـە: هەرکەسێک لە دونیادا خاوەنی زێڕ و زیو بێ و زەکاتی لێ کەوتبێ و پاشـان زەکـاتی لێـی نەدابێ، ئەوا ئەم زێڕ و زیوە دەکرێتە بەرگێکی ئـاگرین و لەبـەری دەکـرێ لـە دۆزەخدا.. پاشان پشت و تەنیشت و نێوچەوانی پێ داخ دەکەن.

پاشان لە فەرمووودەیەکی تردا دەفەرمووێت کـە ریوایـەتێکی تـرە: ((**كُلَّمَا بَرَدَتْ أُعِيدَتْ لَهُ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ فَيَرَى سَبِيلَهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ**))(٧٤) واتە: هـەرکاتێ ئـەو بەرگـە سـارد بـۆوەوە بەرگێکی تری بۆ گەرم دەکرێتەوە، هەتا رۆژی دوایی دادێـت، کـە ئەنـدازەی پەنجا هەزار ساڵە، هەتاکو لێپرسینەوە لە نێوانی خەڵک کۆتایی دێـت، ئەوکاتـە یان بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ ڕەوانە دەکرێ.

وە پێغەمبەرﷺ لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرمووێت: ((**مَنْ آتَاهُ اللَّهُ مَالاً فَلَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهُ مُثِّلَ لَهُ مَالُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ لَهُ زَبِيبَتَانِ**)) واتە: هەرکەسێک خـوا ماڵ و سامانی پێبدات زەکاتی لێی نـەدا، لـەڕۆژی دوایـی مـاڵ و سـامانەکەی دەکرێ بە مارێکی ژەهراوی سەر ڕووتاو کە دوو لا لغاوی توندی هەیە.. پاشـان دەفەرموێت: ((**ثُمَّ يُطَوَّقُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَأْخُذُ بِلِهْزِمَتَيْهِ (أي شِدْقَيْهِ) ثُمَّ يَقُولُ أَنَا مَالُكَ أَنَا كَنْزُكَ**))(٧٥) واتە: پاشان ئەو مارە دەکرێتە ملی خاوەن سامانەوە، یاخود خۆی لە ملی خاوەن سامان دەئاڵێت و بە هەردوو لا لغاوەوە گەزە و قەمپاری لێ دەدا و پێی دەڵـێ مـن ماڵەکـەتم، مـن سـامانەکەتم، کـە هـەڵت گرتبـوو و زەکـاتی شەرعیت لێ نەدەدا.

پاشان پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتی خوێندەوە ((**لا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ.. الخ.**)).

---

(٧٣) رواه البخاري ومسلم عن ابي هريرة ﷺ.

(٧٤) متفق عليه.

(٧٥) رواه الخمسة إلا اباداود.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموویت: ((مَا مِنْ صَاحِبِ إِبِلٍ وَلَا بَقَرٍ وَلَا غَنَمٍ لَا يُؤَدِّي زَكَاتَهَا إِلَّا جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْظَمَ مَا كَانَتْ وَأَسْمَنَهُ تَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا وَتَطَؤُهُ بِأَظْلَافِهَا كُلَّمَا نَفِدَتْ أُخْرَاهَا عَادَتْ عَلَيْهِ أُولَاهَا حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ))(٧٦) واتە: هەرکەسێک خاوەنی وشتر و مەڕ و بزن و چێڵ و ڕەشەووڵاخ بوبێت، پاشان زەکاتی شەرعی لێ نەدابێ، ئەوە بێ گومان خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا ئەم گیان لەبەرانە زیندوو دەکاتەوە لە بارێکی زۆر بەهێزدا، خاوەنەکەی خۆیان نارەحەت دەکەن، ئەوەش بە قۆچ لێدان و لەقە هاوێشتن ئازاری خاوەنەکانیان دەدەن، هەتاکو خوای مەزن داد گەریی (محاکمە) نێوان خەڵک دەکات.

لە فەرمودەیەک پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((ما منع قوم الزكاة إلا ابتلاهم الله بالسنين))(٧٧) واتە: هەر نەتەوەیەک دەستیان بەسەر زەکات داگرت و نەیان دا، ئەوا جێگای خۆیەتی خوا تووشی گرانی و نەهاتیەکیان بکا.. لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: ((ولا منع قوم الزكاة إلاّ حبس الله عنهم القطر أي المطر)) واتە: هەر نەتەوەیەک قەدەغەی زەکات بکات، خوای گەورە بارانیان لێ قەدەغە- دەکات. پێغەمبەرﷺ دیسان دەفەرموێت: ((ولو لا البهائم لم يُمطروا))(٧٨) واتە: ئەگەر لەبەر گیان لەبەر نەبوایە، ئەوە باران یەک دڵۆپە نەدەباری.

هەروەها عەبدوڵای کوڕی مەسعود (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: ((أمرنا بإقام الصلاة وإيتاء الزكاة ومن لم يُزك فلا صلاة له)) واتە: فەرمانمان پێ کراوە بە نوێژکردن و بە زەکات دان، هەرکەسێک زەکات نەدات، نوێژی لێ وەرناگیرێ.

پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکی باوەڕ پێکراوی ترەوە دەفەرموێت: ((بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عبده رَسُوله، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ

---

(٧٦) رواه ابن ماجة في سننه عن ابي ذرؓ.
(٧٧) رواه البيهقي وغيره عن بريدةؓ.
(٧٨) رواه احمد وابن ماجه.

وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَالْحَجِّ البيت وَصَوْمِ رَمَضَانَ))[٧٩] واته: ئیسـلام لەسـەر پێـنج شـت دارێژراوە: شەهادەت بەوەی کە یەک خوا هەیە، بێجگە لە خوا هیچ خوایـەکی تر نىیە، پێغەمبەرمان موحەمەدﷺ بەندە و ڕەوانەکراوی خوایە، نوێـژکردن و، زەکات دان و، حەجی ماڵی خوا و، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان.

**تێبینی:**

هەرکەسـێک زەکـاتی خـوای بکەوێتـە سـەری و نەیـدات ئـەوە لـە تاوانـە گەورەکان دەژمێردرێت.

ئەگەر هاتوو یەکێک یان کۆمەڵێک قەدەغەی زەکاتیـان کـرد، یـان یـاخی بوون لە نەدانی و واتە وایان دانا کە زەکات فەرز نىیە، ئەوە لەبـەر ئـەم هۆیـە وەردەگەڕێن لە ئاینی ئیسلام و بە هەڵگـەڕاوە دادەنـرێن.[٨٠] چـونکە ئایـەت و فـەرموودەی ئاشـکرا هەیـە لـەبارەی زەکـات دان و بـە تایبـەتی لەسـەر دەوڵەمەندەکان کە فەرزە لەسەریان کە زەکاتی ماڵی خوا بدەن، بە ڕای هـەموو زانایان کە زەکات فەرزە و پێویستە. هەموویان لەسەر ئەم بیروباوەڕەن.

هەروەها شێخی ابن حجر (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەفەرموێ: (**عُـدّ منـع الزكاة كبيرة، هو ما أجمعوا عليه**) واتە بەڕاستی نەدانی زەکات لە تاوانە گـەورەکان دەژمێردرێن بە ڕای هەموو زانایان.

**پاشـکۆ :**

هەروەها حەزرەتی پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی کە لە وەختی پێویستدا بـاران نەباری، ئەوە نیشـانەی ئەوەیـە کـە (ئـەهلی) ئـەو وڵاتـە (زەکاتیـان) نـەداوە، هەروەها کە (تاعوون) و ناساغی خراپە کەوتە ناو هـەر گـەل و نەتەوەیەکـەوە، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە (زینا) زۆر ئەکرێت.

---

(٧٩) رواه الشيخان.

(٨٠) بروانە (الخطايا في نظر الإسلام) دانراوی بەڕێز عەفیف عبدالفتاح طبارە ص٢٢٢.

هەروەها ریوایەت کراوە کاتی ئینسان لە ڕۆژی (قیامـەت)دا بەسـەر پـردی (سیرات)دا ڕادەبووری، ئەگەر لە دنیادا (زەکاتی) نەدابێ، پردەکە لار دەبێتەوە، هەتا کابرا بکەوێتە خوارەوە بۆ دۆزەخ، ئنجا زەکاتەکەی لەشـێوەی ئینسـانێکدا بانگی ئەکات: خوا بتکوژێ دەربـارەی مـن (قصـوورت) نەکردایـە هـەتا ئێسـتا ڕزگار ببویتایە.[81]

(٨١) بڕوانە (مەکتووباتی کاك ئەحمەدی شێخ) مامۆستا مەلا عبدالکریمی مردس لە فارسیەوە وەریگێڕاوەتە سەر کوردی- بەرگی دووەم- لاپەڕە ٢٦٤.

# تاوانی شەشەم

## شکاندنی ڕۆژوویێك لە ڕۆژەکانی ڕەمەزان

(ترك صوم يوم من أيام رمضان والإفطار فيه)

خوای گەورە دەفەرموویت: ((يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمْ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ)) واتە ئەی ئەو کەسانەی کە خاوەن باوەڕن، لەسەر ئێوە فەرزکراوە ڕۆژوو گرتن، هەروەک لەسەر نەتەوەکانی پێش ئێوەش فەرزکرابوو، بەڵکو تکا وایە بەهۆی ئەم خواپەرستنەوە خۆتان بپارێزن لە خراپە و خراپەکاری.

پاشان لە کۆتایی ئایەتەکە دەفەرموویت: ((أَيَّامًا مَعْدُودَاتٍ فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ))[٨٢] واتە: ڕۆژوتان لەسەر (فەرزکراوە) بۆ چەند ڕۆژێکی دیاریکراو، ئنجا هەرکەسێک لەئێوە نەخۆش کەوت یان لەسەر سەفەر بوو، واتە بەڕۆژوو نەبوو، با لە چەند ڕۆژێکی تردا ڕۆژووەکان بگرێتەوە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموویت: ((من أفطر يوماً من رمضان من غير رخصة ولا مرض لم يقضه صوم الدهر كله وإن صامه))[٨٣] واتە: هەرکەسێک یەک ڕۆژوو لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆز بشکێنێ و بەبێ هۆیەکی (شەرعی) کە نەخۆش نەبێ و یاخود نەخۆشیش بێت بەڵام نەخۆشیەکە و، ڕۆژوەکەی کاری تێ نەکات، ئەوا بێ گومان ئەگەر هەتاهەتایە بەڕۆژوو بێت، جێگای ئەو ڕۆژەی ڕەمەزان ناکاتەوە، ئەو چاکە و پاداشەی کە لەو مانگە بۆی نوسراوە بە هیچ جۆرێک جێگای ناگرێتەوە.

(٨٢) سورەی البقرە ئایەتی ١٨٤

(٨٣) رواه الترمذي وابوداود والنسائي وابن ماجه عن ابي هريرةﷺ.

له فەرموودەیەکی تردا دەفـەرموێت: ((**عري الإسلام وقواعد الدين ثلاثة عليهن أسس الإسلام، من ترك واحدة منهن فهو بها كافر، أي (حلال الدم): شهادة أن لا إله إلا الله، والصلاة المكتوبة، وصوم رمضان.**)) واتە: بناغە و بنچینەی ئیسلام لەسـەر سێ شـت دامـەزراوە، هەرکەسـێک یـەکێک لەمانـە واز لیٚبێنیٚـت، ئـەوە بـە موسڵمان ناژمێردرێت، خوێن ڕشتنی دروستە: یەکەم شایەتمان، واتـە بێجگـە لـە خـوا هـیچ خوایـەکی تـر نیـیـە و شـایەدی دان کـە موحەمـەد بەنـدە و پێغەمبەری خوایە و، پێنج نوێژە فەرزەکان و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان.

**سەرنجێك :**

ڕۆژووی مـانگی ڕەمــەزان خــوا فــەرمانی کــردووە بــە گرتنــی و لەســەر موسڵمانان پێویست کردووە. ئەگەر کەسێک بەبێ (مەعزەرەتێک) بیشـکێنێ و نەیگرێ، ئەمـە تـاوانێکی گـەورەی کـردووە. بەڕاسـتی ڕۆژوو شـکاندن بـەبێ بەڵگەیەکی شەرعی و بەبێ هۆ ئەمە لە تاوانە گەورەکان لەقەڵەم ئەدرێ بـەڕای زاناکان.

# تاوانی حەفتەم

## وازهێنان لە حەجی ماڵی خوا (ترك الحج)

خوای مەزن دەفـەرموویت: ((وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَـنْ اسْـتَطَاعَ إِلَيْـهِ سَبِيلاً)) واتە: لەلایەن خوای گەورەوە حەجی ماڵی خوا فەرز کراوە لەسـەر ئـەو موسڵمانانەی کە توانای لەشی و ماڵیان هەیە.

خوای گەورە دەفـەرمویت: ((وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنْ الْعَـالَمِينَ))[84] واتـە: هەرکەسێک باوەڕ نەکا بە فەرزبوونی حەج، یان بڵێ حەج فەرز نىيە، تواناشـی هەبێ بەڵام بەئەنقەست حەج نەکات، ئەوە خوای گەورە دەوڵەمەندە و بێباکـە لەو کەسە، پێویستی بە هیچ کەسێک نىيە.

لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمویت: ((من ملك زاداً وراحلةً تبلغه إلى بيـت الله الحرام، فلا عليه أن يموت يهودياً او نصرانياً))[85] واتە: هەر کەسێک توانـای حـەج کردنی هەبێت، بەڵام بە ئارەزووی خۆی نەچێت بۆ حەج بەبێ هیچ (عـوزرێکی شەرعی)، ئەوە ئارەزوو و کەیفی خۆیەتی چ لەسەر ئاینی (جولەکە) بمـرێ و چ لەسـەر ئـاینی (نەصـرانیەوە). پاشـان لـە کۆتـایی فەرموودەکـە پێغەمبـەر دەفـەرمویت: ((وذلك أن الله يقول: وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنْ اسْـتَطَاعَ إِلَيْـهِ سَبِيلاً)) واتە: پێغەمبەر پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە ((وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ ..الخ.)).

ئیمامی عومەر (خـوا لێـی رازی بێـت) دەفـەرمویت: بڕیـارم دا کـە چـەند کەسێک بنێرم بۆ ئەو شار و دێهاتانەی کە توانای حەجی ماڵی خوایان هەیـە و ناچن بەبێ ئەوەی عوزرێکی شەرعییان هەبێ، دەمەوێ باجیان لەسەر دابنـێم، چونکە ئەوانە بە موسڵمان ناژمێردرێن.

---

(٨٤) سورەی ال عمران ئایەتی ٩٧

(٨٥) رواه الترمذي والبيهقي عن عليﷺ.

پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: ((**الإسلام ثمانية أسهم: الإسلام (أي كلمته) سهم، والصلاة سهم، والزكاة سهم، وحج البيت سهم، والأمر بالمعروف سهم، والنهي عن المنكر سهم، والجهاد في سبيل الله سهم، وقد خاب من لا سهم له**))[86] واتە: ئاینی ئیسلام لەگەڵ وتەکەیەوە هەشت بەشە: ئایینی ئیسلام بەشێکە و، نوێژ بەشێکە و، زەکات بەشێکە و، ڕۆژوو بەشێکە و، حەجی ماڵی خوا بەشێکە و، فەرمان کردن بە چاکە بەشێکە و، قەدەغەکردنی خراپە بەشێکە و، شەڕکردن لەڕێی خوا لەگەڵ دوژمنی موسڵمانان بەشێکە، ئەو کەسە زەرەرمەندە کە بێبەشە لەم بەشانە.

(سەعیدی کوڕی جبیر) کە یەکێک بووە لە تابعیە گەورەکان، (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: دراوسێکەم خاوەن ماڵ بوو، واتە دەوڵەمەند بوو، مرد، منیش نوێژی مردووم لەسەر نەکرد، چونکە حەجی ماڵی خوای نەکردبوو.

سەرنج :

ئەم تاوانەش لە تاوانە مەزنەکان دەژمێردرێت، بەڵی کەسێک ماڵ و سامانی هەبێ و دەستی بڕوا، نەچێ بۆ حەجی ماڵێ خوا، بەبێ عوزرێکی شەرعی، تاکو دەمرێت ئەوە بە تاوان بارێکی گەورە دادەنرێ بە بەڵگەی ئایەت و فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ.

والله أعلم بالصواب، خواش زانایە بەڕاستی.

---

(٨٦) رواه الإمام البزار عن حذيفةرضي الله عنه.

# تاوانی هەشتەم

## ئازاردانی دڵی دایك و باوك (عقوق الوالدين)

خوای گەورە دەفەرموێت: ((وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلاَ تُشْرِكُوا بِـهِ شَـيْئًا وَبِالْوَالِـدَيْنِ إِحْسَانًا))[٨٧] واتە: ئەی ئادەمیزاد، بەندەیی خوا بکەن و بەهیچ جۆرێک هاوبەش بۆ خودا دامەنێ، وە چاکە لەگەڵ دایک و باوک بکە.

خودای بە بەزەیی فەرمان بە ئێمە دەکات کە چاکە لەگەڵ دایک و باوکمان بکەین و بە (لوتف) بەزەیی و دڵسۆز بین لەگەڵیانـدا، بەتایبـەتی کاتـێ بـەرەو پیری لاوازی دەچن، وەک خوا دەفـەرموویت: ((فَلاَ تَقُـلْ لَهُمَـا أُفٍّ))[٨٨] واتـە بەهیچ جۆرێک نابێت ئۆف و داخیان لە دەستی بکەیت، دڵیان ئازار بدەیت.

وە خوای مەزن لە ئایەتێکی تردا دەفـەرموێت: ((أَنْ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَـيَّ الْمَصِيرُ))[٨٩] واتە سوپاسی نیعمەتی من و دایک و باوکـت بکـە و، لـە دوایشـدا هەر بۆ لای من دەگەڕێنەوە.

لە (ابن عباس) دەگێڕدرێتەوە کە دەیفەرموو: سێ شت هەن بەبێ سێ شت وەرناگیرێ: یەکەمیان کە خوا دەفـەرمووێت: ((وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُـولَ)) واتە گوێڕایـەڵی خـوا و گوێڕایـەڵی پێغەمبـەرﷺ بکـەن. (واتـە هەرکەسێک گوێڕایەڵی خوا بکـا و گوێڕایـەڵی پێغەمبـەرﷺ نـەکات، ئـەوە کـردەوەی لـێ وەرناگیرێت، چونکە هەر یەکێک لەمانە پەیوەندیان بە یەکـەوە هەیـە). دووەم شت کە خوا دەفـەرمووێت: ((وَأَقِيمُـوا الصَّـلاَةَ وَآتُـوا الزَّكَـاةَ)) واتـە: خـودا فەرموویەتی نوێژ بکەن و زەکات بدەن. واتە هەرکەسێک نوێژ بکات و زەکـات

(٨٧) سورة النساء ئايەتى ٣٦

(٨٨) سورەى الإسراء ئايەتى ٢٣

(٨٩) سورەى لقمان ئايەتى ١٤

نەدات، لێی وەرنا گیرێت. سێیەم شت خوا دەفەرموێت: ((أَنْ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ)) واتە: خوا دەفەرموێ سوپاسی من و دایک و باوکتان بکەن، واتە هەرکەسێک سوپاسی خوا بکات و گوێڕایەڵی و سوپاسی دایک و باوکی نەکات، لێی وەرنا گیرێ ئەم سوپاس کردنە.

لەبەر ئەوە پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((رِضَى الرَّبِّ فِي رِضَا الْوَالِدَيْنِ وَسَخَطُ الرَّبِّ فِي سَخَطِ الْوَالِدَيْنِ))[٩٠] واتە: رازی بوونی خوا لەگەڵ رازی بوونی دایک و باوکە و، نارەزایی خوا لەگەڵ نارەزابوونی دایک و باوکایە.

فەرموودەیەک لە پێغەمبەرﷺ ریوایە کراوە کە دەفەرموێت: ((جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاسْتَأْذَنَهُ فِي الْجِهَادِ، فَقَالَ: أَحَيٌّ وَالِدَاكَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ))[٩١] واتە: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەرﷺ داوای لێکرد کە رێی بدا بۆ جەنگ لەگەڵ یاخیبووان لە ئیسلام. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دایک و باوکت ساغن و ماون؟ فەرمووی: بەڵێ. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خزمەتی دایک و باوکت بکە، سوودەکەی وەک غەزا وایە.

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێت: ((ثَلَاثَةٌ حَرَّمَ اللَّهُ تبارك وتعالى عَلَيْهِمْ الْجَنَّةَ: مُدْمِنُ الْخَمْرِ، وَالْعَاقُّ، وَالدَّيُّوثُ الَّذِي يُقِرُّ فِي أَهْلِهِ الْخَبَثَ))[٩٢] واتە:سێ کەس خوای گەورە بەهەشتی لێ قەدەغەکردوون: مەیخواردنەوە بە بەردەوامی، ئازاردانی دایک و باوک، (گەواد) واتە ئەو کەسەی کە ئیشی داوێن پیسی لەگەڵ خێزان و ماڵی بکرێ و قسە نەکا.

لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: ((كل الذنوب يؤخر الله منها ما شاء إلا يوم القيامة إلا عقوق الوالدين)) واتە: خوا هەموو گوناهێک دوادەخات بۆ رۆژی دوایی تەنها بێفەرمانی دایک و باوک نەبێ. ((فإن الله يُعجله لصاحبه في الحياة قبل

---

(٩٠) رواه الترمذي والحاكم

(٩١) رواه الشيخان

(٩٢) رواه احمد عن عبدالله بن عمر بن العاص

**الممات))**[٩٣] واته: خوای مەزن لەپێش مردن تۆڵەی لـیٚ دەسـتێنێتەوە، یـاخود خوا منداڵیٚ خراپی دەداتیٚ و ئازاریان لیٚ بچێژیٚ.

هــەروەها عەبــدولاّی کــوڕی ئیمــامی عومــەر (ڕەزای خوایــان لیٚبــیٚ) دەفەرمویٚ: ((**أَتَى النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلٌ فقَالَ: اني أَذْنَبْتُ ذَنْبًا عظيمًا، فَهَلْ لِي من تَوْبَةٌ؟ فقَالَ: هل لَكَ من أم؟ قَالَ: لا. قَالَ: فَهل لَكَ خَالَةٌ؟ قَالَ: نَعَــمْ. قَــالَ: فَبِرَّهَا**))[٩٤] واتــە: پیاوێــک هاتــە لای پێغەمبــەرﷺ وتــی: مــن گونـاهێکی زۆر گەورەم کردووە، ئایـا دەبـیٚ خـوا گەڕانـەوەو پەشـیمانیم پەسـەند بکـا و لـێم وەر گریٚ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئایـا دایکـت مـاوە چـاکەی لە گـەڵ بکـەی؟ ووتی: نەخێر. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خوشکی دایکت ماوە؟ کابرا وتـی: بـەڵیٚ. فەرمووی: بڕۆ چاکەی لە گەڵ بکە.

لە یەکێک لەو شتانەی کە پێغەمبەرﷺ ئاگادارمان دەکاتـەوە ئەوەیـە، لـەو هۆیانــە دوورکەوینــەوە کــە دەبێتــە هــۆی جوێنــدانی دایــک و بــاوک، وەک دەفەرموێت: ((**مِنْ الْكَبَائِرِ شَتْمُ الرَّجُلِ وَالِدَيْهِ. قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَهَلْ يَشْتِمُ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ؟! قَالَ: نَعَمْ، يَسُبُّ أَبَا الرَّجُلِ فَيَسُبُّ أَبَاهُ، وَيَسُبُّ أُمَّهُ فَيَسُبُّ أُمَّهُ**))[٩٥] واتە: لە گوناهە گەورەکان ئەوەیە یەکێک جوێن بە دایک و باوکی بـدات. هاوڕیٚکـانی فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا، پیاو جوێن بـە دایـک و بـاوکی خـۆی دەدا؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵیٚ، پیاو جوێن بە باوکی یەکێک دەدا، ئەویش جوێن بە باوکی ئەو دەدات، جوێن بە دایکی دەدات، ئـەویش جـوێن بـە دایکـی ئـەو دەدات.

---

**(٩٣) رواه الحاكم في مستدركه**

**(٩٤) رواه البخاري ومسلم**

**(٩٥) متفق عليه**

**تێبینی:**

گرنگی ماف پێنەدانی دایک و باوک یەکێک لە تاوانە گەورەکان ژمێردراوە بە کۆمەڵی ڕای هەموو زانایان:

جوێن دان بە دایک و باوکیش هەر بە تاوانە گەورەکان ژمێـردراوە، یـاخود بۆتە هۆ بۆ جوێن پێدانیان، هەروەک فەرموودەیـەکی ڕاسـتی پێغەمبـەری ﷺ لەسەرە، بەڵام ئەگەر پەشیمان ببێتەوە لە تاوانـەکانی، یـاخود گـەردنی خـۆی پێیان ئازاد بکات، ئەگەر خوا حەز بکات لە تاوانەکانی خۆش دەبێ.

# تاوانی نۆیەم

## تەرك كردنی هات و چۆی خزمان (هجر الأقارب أو قاطع الرحم)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموویت: ((وَاتَّقُوا اللَّــهَ الَّــذِي تَسَــاءَلُونَ بِــهِ وَالأَرْحَامَ))[٩٦] واتە: ئێوە خۆتان بپارێزن لەو شتانەی کە خوا لە ئێوەی قەدەغـە کــردووە، هــەروەها داوای هــەموو پێویســتیەکی لــێ دەکــەن، ئاگــاداری بەجێهێنانی مافەکانی خزمان بکەن و هاتوچۆیان بکەن.

قورئان دەمان ترسێنێ و لە خەوی بێئاگـایی ڕامـان دەپـەڕێنێ دەربـارەی هاتوچـۆ نـەکردنی خـزم و کەسـایەتی، هـەروەها یارمـەتی نـەدانیان لـەکاتی پێویستی و ناخۆشیدا، هەروەک خوا لەو ئایەتەدا بە تونـدی باسـی ئـەم بابەتـە دەکات، کە دەفـەرموێت: ((فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ تَوَلَّيْتُمْ أَنْ تُفْسِدُوا فِي الأَرْضِ وَتُقَطِّعُــوا أَرْحَامَكُمْ، أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمْ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَى أَبْصَارَهُمْ))[٩٧] واتـە: ئەوانـە لـەو کەسانەن ئەگەر پێیان هـەڵکرد بکەونـە خراپـەکاری لـە زەویـدا و، هاتوچـۆی خزمان ناکەن، ئەوانەن خوا لەعنەت و نەفرینی لێ کردوون، چـونکە پێشـوازی ئەم ئاینە پاکـەیان نـەکردووە و، سـوود و قازانجیـان وەرنـەگرتووە، هـەروەک گوێیان لەم بانگە نەبووبێ و کەڕ بووبن، چاوی نەیدیبێ و کوێر ببن.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَــيْفَهُ)) واتە: هەرکەسێ بڕوای بەخوا و بەڕۆژی دوایی هەیە با ڕێزی میوانی بگرێت.

لە بەشی دووەمی فەرموودەکە دەفـەرموێت: ((وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّــهِ وَالْيَــوْمِ الآخِرِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ)) واتە: هەرکەسێک بڕوای بە خوا و بەڕۆژی دوایی هەیە، بـا هاتوچۆی خزمان بکات.

لە بەشی سێیەمی فەرموودەکەدا دەفەرموێت: ((وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَــوْمِ

---

(٩٦) سورة النساء ئایەتی ١

(٩٧) سوره محمد ئایەتی ٢٣

**الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ))**[٩٨] واته: هەرکەسێک بڕوای بە خوا و بەڕۆژی دوایی هەیە با قسەیەکی چاکە بکات یان بێدەنگ بێت.

پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: ((**إِنَّ اللَّهَ تعالى خَلَقَ الْخَلْقَ حَتَّى إِذَا فَرَغَ مِنْ خَلْقِهِ قَالَتْ الرَّحِمُ: هَذَا مَقَامُ الْعَائِذِ بِكَ مِنْ الْقَطِيعَةِ؟ قَالَ: نَعَمْ، أَمَا تَرْضَيْنَ أَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ وَأَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ؟ قَالَتْ: بَلَى. قَالَ: فَذاكَ لَكِ. ثم قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ (فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ تَوَلَّيْتُمْ أَنْ تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ..الخ).))**[٩٩] واته: خوای دروستکار کاتێ لە دروست کردنی مرۆڤ بۆوە، پاشان (گیان) هەستا و ووتی: کاتی ئەوەیە مرۆڤ پەنا بۆ تۆ بێنێت لە هاتوچۆنەکردنی خزمان. ئنجا خوای دروستکار فەرمووی: بەڵێ، ئەی گیان (رحم)، هەرکەسێک هاتوچۆت بکات من بەزەییم پێیا دێتەوە، هەرکەسێک هاتوچۆت نەکات من بەزەییم پێیا نایەتەوە. ئایا تۆ بەوە ڕازیت؟ ئنجا گیان (رحم) ووتی: بەڵێ ڕازیم. خوا فەرمووی: ئەو فەرمانەم بۆ تۆ.. پاشان پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەگەر حەز دەکەی ئەم ئایەتە بخوێننەوە: ((**فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ تَوَلَّيْتُمْ أَنْ تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ**)).

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((**الرَّحِمُ مُعَلَّقَةٌ بِالْعَرْشِ تَقُولُ مَنْ وَصَلَنِي وَصَلَهُ اللَّهُ وَمَنْ قَطَعَنِي قَطَعَهُ اللَّهُ**))[١٠٠] واته: (رحم) خزمایەتی هەڵواسراوە بە عەرشی خواوە و دەڵێت: هەرکەسێ هاتوچۆم بکات خوا دەیگەیەنێ بە بەهەشت، هەرکەسێکیش هاتوچۆم نەکات خوا لەگەڵی دەیپچڕێنێو. بێبەزەییە.

لە پێغەمبەرﷺ دەگێڕدرێتەوە کە لە تەورات نوسراوە: ((**من أحب أن يزاد في عمره ويزاد في رزقه فليصل رحمه**))[١٠١] واته: هەرکەسێک دەیەوێت تەمەنی درێژ بێ و ڕۆزی بەرگوشاد و فرەوان بێت، با خزمانی بەسەرکاتەوە.

---

(٩٨) رواه امام البخاري ومسلم

(٩٩) متفق عليه

(١٠٠) رواه البخاري ومسلم عن عائشة رضي الله عنها.

(١٠١) رواه الحاكم

پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەک دەفەرموێت: ((إنَّ أَعْمَالَ بَنِي آدَمَ تُعْرَضُ كُـلَّ خَمِيسٍ ولَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، فَلا يُقْبَلُ عَمَلُ قَاطِعِ رَحِمٍ))[١٠٢] واتـە: کـردەوەی ئـادەمیزاد هەموو شەوی پێنج شەمان و هەینیەک کردەوەکـانی مـرۆڤ پێشـنیاری خـوا دەکرێت، بەڵام کردەوەی هاتوچۆ نەکەری خزمان گیرا ناکات.

لە فەرموودەیەکی تردا دەفـەرموێت: ((لا يدخل الجنة قاطع الرحم))[١٠٣] واتـە: هەر مرۆڤێکی موسڵمان بە ئەنقەست سەرنەدا لە خزمی، ناچێتە بەهەشت.

عەلی کـوڕی حوسـەین (خـوا لێـی رازی بێـت) کـە بـە (زیـن العابـدین) بەناوبانگە، ئامۆژ گاری کوڕەکەی دەکرد و دەیگوت: کوڕم نەکەیت هاوڕێیـەتی ئەو کەسە بکەیت کە خزمانی بەسەر ناکاتەوە و سەریان لێ نادات، مـن دیومـە لەسێ جێگادا قورئان نەفرەتی لێ کردوون.[١٠٤]

سەرنجێک :

هاتوچۆنەکردنی خزمان بە ئەنقەسـت لـە گوناهـە مەزنـەکان دەژمێـردرێ، چونکە پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیـەکا دەفـەرموێ: تـەرک کردنـی هاتوچـۆی خزمان ناچێتە بەهەشت، مەگەر پەشیمان ببێتەوە. هەروەها ئیمامی (قر گبـی) کە زانایەکی زۆر لێهاتوو بووە، لە تەفسیرەکەیا دەفەرمووێت: (بە کۆمـەڵ و ڕای زاناکان هاتوچـۆکردنی خزمـان (فـەرزە) و هاتوچـۆنەکردنیان دروسـت نیـیـە، چونکە زیانی یەکجار زۆرە. بە تایبەتی ئەگـەر خزمـەکانی هـەژار بـن خۆشـی دەوڵەمەند بێت، لەبەر یارمـەتی نـەدان و فیـز بـێ هاتوچـۆیان نـەکات، ئـەوە کارەساتێکی یەکجار گەورەیـە، هـەروەک شـێخی (ابـن حجـر) دەفـەرموێت: هەرکەسێ هات و چۆی خزمان نەکات، بەتایبەتی ئەگەر خزمـەکانی هـەژار و بێدەست بن، وازیان لێ بێنێ و فیز و تەکەبوریان بەسەردا لێدا و، سـەردانیان نەکات و چاکەیان پێ نەگەیەنێت، لەسەر ئەم هەموو شتەش دەوڵەمەند بێـت،

---

(١٠٢) رواه احمد

(١٠٣) متفق عليه

(١٠٤) بڕوانە پەرتووکی (الكبائر) دانراوی (شمس الدين الذهبي) لاپەڕە ٤٨

ئەوانیش هەژار بن، ئەو بەڕاستی خوای گەورە بەهەشتی لێ قەدەغە دەکا، مەگەر بگەڕێتەوە لای خوای گەورە و مەزن و، چاکە لەگەڵ خزمان بکات.

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((**من کان له أقارب ضعفاء ولم يحسن إليهم ويصرف صدقته إلى غيرهم، لم يقبل الله صدقته ولا ينظر غليه يوم القيامة**))[١٠٥] واتە: هەرکەسێک خزم و کەسی بێچارەی هەبێت و، خێر و چاکەیان لەگەڵ نەکات و، ئەو خێرە نەدات بە خزمەکانی، کە مافیان هەیە لەسەری، ئەوا هەر چاکەیەک بکات لێی وەرناگیرێ، هەروەها لە ڕۆژی دوایی بەچاوی بەزەیی تەماشایان ناکات.

---

**(١٠٥) بڕوانە پەرتووکی (الزواجر عن اقتراف الكبائر) دانراوی الشيخ احمد بن محمد بن علي بن حجر المكي الهيتمي، ج٢ ص٨٠**

# تاوانی دەیەم

## داوێن پیسی (الزنا)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفـەرموێت: ((وَلاَ تَقْرَبُوا الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً))[١٠٦] واتـە: نزێـک مەکەونـەوە لـە (زنـا) چـونکە ئیشـێکی زۆر خراپـە و لەگشت ڕێگەیەک خراپترە.

خوای گەورە بە تەواوی باسـی داوێـن پیسـی کـردووە، بـە گونـاهێکی زۆر ناشیرین نـاوی بـردووە، ئـەو کەسـەی کـە ئـەو ڕێگایـە دەگرێتـە بـەر، ئەمـە خراپترینی مرۆڤە.

خوای مەزن دەفەرموویت: ((الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِـدٍ مِنْهُمَـا مِائَـةَ جَلْدَةٍ)) واتە: ئەو ژن و پیاوەی کە داوێن پیسـی دەکـەن، هەریـەکێکیان سـەد داریان لێ بدەن.

پاشا دەفەرموویت: ((وَلاَ تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ)) واتە: بـەزەییتان بـەو جۆرە کەسانەدا نەیەتەوە کە فەرمانی خوا بەفیرۆ ئـەدەن. ((إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ))[١٠٧] واتە: ئەگەر ئێوە باوەڕتـان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە، وە پێویستە کۆمەڵێک لە موسڵمانان ئامادە بـن لەم شوێنەدا بۆ ئەوەی پەند و ئامۆژگاری و کەڵک وەربگرن لەم کردەوە خراپە.

زاناکانی ئایینی دەڵێن: ئەو سزایە بۆ ئەو کوڕ و کچـانەیە کـە کوڕەکـە ژنـی نەهێنابێ و کچەکەش شووی نەکردبێ، هەر یەکێک لـەمان (سـەد) داری لـێ دەدرێت.

بەڵام ئەگەر ئەو ژن و پیاوە لـە تەمـەنیان جارێـک ژنەکـە شـووی کردبـوو

(١٠٦) سورة الإسراء ئایەتی ٣٢

(١٠٧) سوره النور ئایەتی ٢-٤

یاخود پیاوەکە جارێک ژنی هێنابوو، ئەوا پێویستە بەردباران بکرێن.

لە پێغەمبەری خوا بەڕاستی وەرگیراوە، کە ئەگەر هەر یەکێک لەو ژن و پیاوە تۆڵە و سزایان لێ وەرنەگیرابێ لە دونیادا یاخود هەردوکیان بەبێ پاشگەزبوونەوە بمرن، ئەوا سزا دەدرێن لەناو دۆزەخدا، بە قامچی ئاگرین لێیان دەدرێت.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموویت: ((**لا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ**)) واتە: ئەو کەسەی داوێن پیسی دەکات لە کاتی داوێن پیسیدا باوەڕی نامێنێت.. ((**وَلا يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ**)) واتە: (دز) لەکاتی دزیندا باوەڕی نامێنێت. ((**وَلا يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ**))[١٠٨] واتە: مەی خۆر لەکاتی مەی خواردندا باوەڕی نامێنێت.

پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: ((من زنى أو شرب الخمر نزع الله منه الإيمان كما يخلع الإنسان القميص من رأسه))[١٠٩] واتە: هەرکەسێ داوێن پیسی بکات یان مەی بخواتەوە، خوا بەبێ باوەڕی ناو دەبات، هەروەک مرۆڤ کراسی بەر خۆی دادەکەنێت.

هەروەها دیسان پێشڕەومانﷺ دەفەرموێت: ((**إن السموات السبع والأرضين السبع ليلعنّ الشيخ الزاني**)) واتە: هەر حەفت ئاسمان و هەر حەفت چینی (گبقە) زەوی، نەفرەت دەکەت لە پیرێکی داوێن پیس.. ((**وإن فروج الزناة ليُؤذي أهل النار نتن ريحها**))[١١٠] واتە: لە دۆزەخدا بۆگەنی دامەنی ئەوە کەسانەی واتە ئەو ئافرەتانەی کە داوێن پیسیان کردووە و پەشیمان نەبونەتەوە، باری خەڵکی دۆزەخ ناڕەحەت دەکەن، بێجگە لە ناڕەحەتی خۆیان.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((**يا معشر الناس، أتقوا الزنى، فإن فيه ست خصال:**

(١٠٨) رواه البخاري ومسلم عن ابي هريرةرضي الله عنه

(١٠٩) رواه الحاكم من حديث ابي هريرةرضي الله عنه

(١١٠) رواه البزار. بڕوانە پەرتووكى (الزواجر) ج٢ ص١٣٥

**ثلاثاً في الدنيا وثلاثاً في الآخرة. أما التي في الدنيا: فيذهب البـــهاء، ويـــورث الفقـــر وينقص العمر. أما التي في الآخرة فسخط الله وسوء الحساب وعـــذاب النـــار))**[١١١] واته: ئەی کۆمەڵی موسڵمانان، خۆتان لە داوێن پیسی بپارێزن، چـونکە شـەش سیفەتی تێدا هەیە، سیانیان لە دونیادا و سیانیان لە ڕۆژی دوایيدا. ئـەو سـێ سیفەتەی لە دونیادا ئەمانەن: ڕۆناکی ئیسـلام لـە ڕووی ئـەو کەسـە دەبـات و لەلای خەڵک سوک و ریسوا و بێ نرخە، هەژار دەبێت و ڕۆزی و ماڵ و سامانی بەرەو کەمی دەچێت، تەمەنی کورت دەبێ یاخود چاکە و خۆشـی لـە تەمـەنی خۆی نابینێت.

ئەو سێ سیفەتەی کە لە رۆژی دواییدا لێی پەیـدا دەبێـت ئەمانـەن: خـوا لــەخۆی دەڕەنجێنێــت و، لێپرســینەوەیەکی خراپــی لەگــەڵ دەکرێــت و، ئێشوئازارێکی زۆری دەدرێ لە ئاگری دۆزەخ.

پێغەمبەرﷺ دەفـەرموێت: **((ما من ذنب بعد الشرك بالله أعظم عند الله من نطفة وضعها رجلٌ في فرج لا يحل له))**[١١٢] واتە: لەپاش هاوبەش بۆ خـودا دانـان، هـیچ تاوانێک لەوە گەورەتر نیيـە کـە پیاوێـک ئـاوی پیـاوەتی و ئـارەزووی خـۆی بەکاربهێنێت لە شوێنێکدا کە بۆی دروست نەبێت.

(ابن مسعود) (خوا لێی رازی بێت) دەگێڕێتـەوە دەڵێـت: لـە پێغەمبـەری خوامﷺ پرسیار کرد: چ گوناهێک گەورەترین گوناهە؟ فەرمووی: **((أَنْ تَجْعَــلَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ))** واتە: هاوبەش بۆ خودا پەیدا بکەیت و لەگەڵ هەندێش ئەو تۆی دروست کردووە لە نەبوون.

(عبدالله کوڕی مەسعود) دەڵـێ: وتـم ئـەو گوناهـە گەورەیـە. لـەپاش ئـەو

---

(١١١) رواه الإمام السيوطي والبيهقي والخرائطي

(١١٢) رواه الإمام احمد.

گوناهە چیترە؟ فـەرمووی: ((وَأَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ تَخَافُ أَنْ يَطْعَمَ مَعَـكَ))[113] واتـە: منداڵی خۆت بکوژیت لەبەر ئـەوەی خواردنـت لەگـەڵ دەخـوات، واتـە لەبـەر هەژاری.. پاشان دەڵـێ وتـم: لەپاشـان چـیتر؟ فـەرمووی ((أَنْ تُزَانِـيَ حَلِيلَـةَ جَارِكَ))[114] واتە: داوێن پیسی بکەیت لەگەڵ دراوسێکەت.

هـەروەها بـە ڕیوایـەتێک ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوارەوە ئنجـا پێغەمبـەرﷺ ئایەتەکەی خوێندەوە، ئەمیش دەقی ئایەتەکەیە کە لە سورەی فورقانە ((وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلاَ يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا، يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا)) واتـە: بەنـدە باشەکانی خودای میهرەبان ڕەوشتێکی بەرزی تریشیان هەیە کە ئەوەیە بـەس خودای گەورە دەپەرستن و داوای هەموو شتێ هەر لە خودا دەکەن و کەسـێ کە خودا کوشتنی ئەوی قەدەغە کردبێ نایکوژن مەگەر لەبەر هۆیـەکی ڕەوای هەق و شەرعی.[115]

هەروەها بزانن بە ڕاستی داوێن پیسی هەیـە لـە داوێـن پیسـی گـەورەترە، وەک لەم فەرموودەیە بەدیار دەکەوێت: ((مَا تَقُولُونَ فِي الزِّنَا؟ قَالُوا: حرام حَرَّمَـهُ اللَّهُ عز وجل وَرَسُولُهُ، فَهُوَ حَـرَامٌ إِلَـى يَـوْمِ الْقِيَامَـةِ)) واتـە: پێغەمبـەرﷺ بـە هاوەڵەکانی خۆی ووت: ئێوە چ دەڵێن لەبارەی زیناوە، واتـە داوێـن پیسـیەوە؟ ووتیان: خوا و پێغەمبەری خوا قەدەغەیان کردووە هەتا ڕۆژی دوایی.

پاشان پێغەمبەرﷺ بە هاوەڵـەکانی فـەرموو: ((لأَنْ يَزْنِيَ الرَّجُلُ بِعَشْرَةِ نِسْـوَةٍ

---

(113) ئەم مەبەستە ئەو ئایەتە دەگرێتەوە کە خوا دەفەرموێت: ((وَلاَ تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ مِنْ إِمْلاَقٍ نَحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ)) واتە: مەکوژن منداڵەکانتان لەبەر ترسی هەژاری، ئێمە ڕۆزی ئێوە و ئەوان دەدەین.

(114) رواه البخاري ومسلم.

(115) لە هەمان کاتدا داوێن پیسی ناکەن و هەرکەس ئەم تاوانانە بکا و ئاگا بە تاوانی بێ پایانی ئاهەموار و لە ڕۆژی (قیامەتدا) لەناو دۆزەخدا سزا و ئازاریان بۆ چەن قات ئەکرێتەوە.. بڕوانە تەفسیری نامی، لەگەڵ دەست لێدان. بەرگی پێنجەم لاپەرە ٢٩٨.

أَيْسَرُ عَلَيْهِ مِنْ أَنْ يَزْنِيَ بِامْرَأَةِ جَارِهِ))[116] واته: ئەگەر پیاوێک لەگەڵ (دە) ژنان داوێن پیسی بکات، ئاسانترە و سوکترە بۆ داوێن پیسیەکەی، کە لەگەڵ دراوسێکەیدا بیکات. ئێش و ئازاری ئەم خراپە نالەبارە چەند کەڕەت زیاترە، چونکە خوای گەورە فەرمانی کردووە کە رێزی دراوسێ بگرین و چاودێریان بکەین و مافەکانیان بپارێزین.

پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەک دەفەرموێت: ((إِذَا زَنَى الرَّجُلُ خَرَجَ مِنْهُ الْإِيمَانُ كَانَ عَلَيْهِ كَالظُّلَّةِ فَإِذَا اقلَعَ رَجَعَ إِلَيْهِ الإِيمَانُ))[117] واتە: ئەگەر یەکێک داوێن پیسی کرد، خوا بڕوایی لە دڵ دا دەردێنی و بڕواکەی وەک سێبەر لەسەری ڕادەوەستی و سێبەری لێ دەکات، کاتێ وازی لە داوێن پیسییەکە هێنا، بڕواکەی دەچێتەوە ناو دڵی.

**تێبینی :**

داوێن پیسی لە کۆمەڵ و ڕای زانایان لە تاوانە مەزنەکان دەژمێردرێت، هەروەک لە هەندێک فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ بە پێش چاومان کەوت، کە بە گەورەترین گوناه ژمێردراوە، بەتایبەتی ئەگەر داوێن پیسیەکە لەگەڵ دراوسێدا بێت.

هەندێک لە زاناکان دەڵێن: داوێن پیسی لە کوشتنیش گەورەترە، چونکە دەڵێن لەپاش هاوبەش دانان بۆ خودا داوێن پیسی‌یە، بەڵام ئەوەی ڕاست بێت ئەوەیە کە شێخی (ابن حجر) دانی پیاهێناوە کە دەڵێت: ئەوەی ڕاسترین بێت لەپاش هاوبەش دانان کوشتنی بە ئەنقەستە، پاش کوشتن داوێن پیسی‌یە، بەتایبەتی ئەو داوێن پیسیەی کە لەگەڵ دراوسێ دەکرێت.

هەروەک لە کیتابی (الکبائر) باس کراوە دەڵێت: گەورەترینی داوێن پیسی،

---

(١١٦) رواه الإمام احمد والطبراني عن المقداد بن الأسودﷺ

(١١٧) رواه ابوداود عن ابي هريرةﷺ

داوێن پیسي‌یه لەگەڵ دایک لە پاشان لەگەڵ خوشک لەپاشان لەگەڵ ژنی باوک پاشان لەگەڵ ئەو کەسانەی کە دەستنوێژی لێیان ناشکێ.. بەم جۆرە هەتا کۆتایی...هتد.

حاکم، کە زانایەکی زۆر بەرز بووە، ئەو فەرموودەیەی زۆر بە ڕاست وەر گرتووە لە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((هەرکەسێک داوێن پیسی بکات لەگەڵ ئەو کەسانەی کە پێی ناشێن(محرم)، واتە ئەوانەی مارەییان لێ‌ی نابڕێت، بیکوژن)) ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە: ((من وقع علی ژات محرم فأقتلوه))[118].

پاشکۆ:

پێویستە بزانن کە تێکڕا (زیناکردن) ئەگەرچی یەکێکە لە تاوانە هەرەگەورەکان، بەڵام ئەم تاوانە گەورەیە چەند پلە و پایەیێکی هەیە و بەپێی ئەو پلەو پایانە سزاکەی ئەگۆڕێ. بۆ نمونە (زیناکردنی) پیاوێ ژنی هێنابێ و ژنێ شووی کردبێ، تاوانی زۆرترە و سزای زیاترە لە زیناکردنی پیاوێ ژنی نەهێنابێ و ژنێ شووی نەکردبێ، کە زینایان لەسەر سابت بوو، سزایان سەنگەسار کردنە تا مردن. بەڵام سزای زینای پیاوی ژن نەهێناو و ژنی شوو نەکردوو (صەد جەڵدەیە). هەروەها بە گوێرەی فەرموودەی حەزرەتﷺ زیناکردن لەگەڵ ژنی دراوسێدا تاوانی گەلێ گەلێ زۆرترە لە زیناکردن لەگەڵ ژنی دوورا.. زانا گەورەکان فەرموویانە تاوانە گەورەکان لە (حەوصەد) تاوان زیاترن و لەناو ئەوانەدا نۆ تاوانی زۆر گەورە هەن کە زینا یەکێکیانە.. بەڵام لەلایەنی پیسی و بێناموسي‌یەوە زینا لە هەموویان پیسترە.. بۆ نمونە ئینسان کوشتن تاوانێکی زۆر گەورەیە و سەختە، کەچی زینا لەو پیسترە.. هەروەها ئەم ئایەتە پیرۆزەی لە هەوەڵەوە باس کرا، زۆر بە توندی باسی زینای

---

(١١٨) رواه الحاكم

کردووە، (یەکەم) ئەفەرمووێ: هەر نزیکی مەبنەوە، (دووەم) زینای بە فاحیشە ناوبردووە، (سێهەم) بە جوملەی (وساو سبیلا) زەممی زینای دووبارەی کردەوە کە جوملەییێکە زۆر (موبالەغەی) تێدایە لە زەممی زینادا.. بەڕاستی زینا یەکێکە لەو تاوانانە کە لە سەرەتای دروستکردنی ئادەمیزادەوە تا ئێستە لەهیچ کۆمەڵێکدا پەسند نەکراوە و بە تاوانێکی دژی ناموس و شەڕافەت ناسراوە (خوا پەنامان بدا لەو تاوانە گەورەیە).. ئامین.

# تاوانی یازدەهەم

## نێربازی (اللواط)

خوا دەفەرمووێت لە قورئانـدا: ((**أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنْ الْعَالَمِينَ، وَتَذَرُونَ مَا خَلَــقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ**))[119] واتە: ئایا ئێوە ئەوەندە لە یاسـای ڕەوشت و ئاین لادەدەن، کە دەچنە لای مرۆڤی نێرینـە و، واز لەوانـە دەهێـنن کە خودا بۆی حەڵاڵ کردوون لە ژنەکانتان؟ وادیارە ئێوە نەتەوەیەکن لە یاسای خودا دەرچوون و لاتان داوە.

پێغەمبەرﷺ دەفـەرمووێت: ((**إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَــى أُمَّتِــي عَمَــلُ قَــوْمِ لُوطٍ**))[120] واتە: لە هەموو شتێک زیاتر لێی دەترسێم کە تووشی (ئۆمەتەکـەم) ببێت کردەوەی نەتەوەی (لوگ)ە.. )واتە (نێربازيیە).

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ فَاقْتُلُوا الْفَاعِــلَ وَالْمَفْعُولَ**))[121] واتە لە هەر شوێنێکدا بینیتان کردەوەی نەتەوەی (لوگ) کـرا، کارکەر و کارلێکراو بکوژن، واتە (سەرکەوت و بن کەوتوو).

پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: ((أ**ربعة يصبحون في غضب الله ويُمسون في سخط الله. قلت: من هم يا رسول الله؟ قال: المتشبهون من الرجــال بالنساء والمتشبهات من النساء بالرجال والّذي يأتِ البهيمة والذي يأتِ الذكر- يعــني اللواط**))[122] واتە: چوار کەس سبەینان و ئێواران لەناو قەهر و توڕەیی خوادان. (**ابو هريرة**) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: ووتم: ئەو چوار کەسە کامانەن، ئـەی

(١١٩) سورة الشعراء ئایەتی ١٦٥-١٦٦

(١٢٠) رواه ابن ماجة والترمذي عن جابر بن عبدالله رضي الله عنه

(١٢١) رواه ابوداود والترمذي وابن ماجه، كلهم من رواية عمرو بن ابي عمر وعن عكرمة عن ابن عباس رضي الله عنهما.

(١٢٢) رواه الطبراني والبيهقي عن ابي هريرة رضي الله عنه.

پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەو پیاوانەی خۆیان دەبەنە سەر شێوەی ژنان و، ئەو ژنانەی خۆیان دەبەنە سەر شێوەی پیاوان، ئەو کەسەی نزیکی چوارپێ دەکەوێت بە تایبەتی گوێدرێژ، وە ئەوەی دەچێتە لای پیاو (واتە نێربازی دەکات).

لە فەرموودەیەکی تر پێغەمبەرمان موحەمەدﷺ دەفەرمووێت: ((**لا ينظر الله عز وجل الى رجل أتيّ ذكراً أو إمرأة في دبرها**))[١٢٣] واتە: خوا بەچاوی بەزەیی تەماشای ئەو پیاوانە ناکات کە دەچنە لای پیاو یاخود لە پشتەوە دەچنە لای ژنان.

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**ملعون من أتيّ إمرأة في دبرها**))[١٢٤] واتە: لە میهرەبانی خوا دوورخراوەتەوە ئەو پیاوانەی لە پشتەوە دەچنە لای ژنان.

لە فەرموودەیەکی تر دەفەرمووێت: ((**لعن الله الذين يأتون النساء في محاشهنّ**))[١٢٥] واتە: لە میهرەبانی خوا دوورن ئەوانەی لە پشتەوە دەچنە لای ژنان.

**سەرنجێك:**

هەموو زانایەکان لەسەر ئەو ڕایەن کە نێربازی لە تاوانە مەزنەکانە.. هەروەک خوای گەورە ئەم باسەی بە دڵنیایی بۆ باس کردووین لە نەتەوەی (**لوط**) پێغەمبەر سڵاوی خوای لێ بێت، کە (**لوط**) پێغەمبەر زۆر ئامۆژگاری نەتەوەکەی کردووە بەرامبەر بەو خراپەکاري‌یە ڕەوشت لەناوبەرە، هەروەها لەبەر ئەوەی وازیان لەم کردەوەیە نەهێنا.. (**فأرسل الله الملائكة فجعلوا عالي القرية، سافلها**) واتە: ئنجا خوا لي‌یان تووڕە بوو، چەند فریشتەیەکی سزادەری

---

**(١٢٣) رواه الترمذي والنسائي وابن حبان في صحيحه.**

**(١٢٤) رواه احمد**

**(١٢٥) رواه الطبراني**

بۆ ناردن، کە گوند و شارەکانی ئەم نەتەوەیە بەسەر یەکدا هەرسی هێنــا.. خــوا دەفــەرموویێت: ((**فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِنْ سِجِّيلٍ مَنْضُودٍ، مُسَوَّمَةً عِنْدَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ**))[١٢٦] واتە: کاتێــک ئــەو کاتــە دیاریکرابوو بۆیان بــۆ ئــەوەی خــوا لــەناویان ببــات، خــوا بــە جــۆرە بــەردێک بەردبارانی کردن و شار و گوندەکانیانی هەموو بەسەر یەکدا هاتن و بنەبڕ بوون قورئانی پیرۆز دەفەرموویێت ئێستاش دوور نیيیە ئەم سزایە بێتە سەر هەر گەل و نەتەوەیەک کە پەیڕەوی ئەم کردەوەیە بکات.

ئنجا با هەموو گــەل و نەتەوەیــەک پەنــد و ئامۆژ گــاری لــەم بەســەرهاتەی نەتەوەی (لوگ) وەربگرن، لەبەر ئەو سزا ســەختەی کــە خــوای گــەورە پــێی داون بە هەرجۆرێک بێت، ئنجا بــا دەســت هــەڵگرن لــەم کــردەوە ناشــیرین و بۆگەنە.

لە پێغەمبەرﷺ وەر گیراوە کە فەرموویــەتی: ((**لعن الله من عمل عمل قوم لوط وردها ثلاثاً**))[١٢٧] واتە: خوا نەفرەتی کردووە لە کەسانێک کە لەسەر رەفتــاری نەتەوەی (لوگ) دەڕۆن، وە سێ جار لەسەر یەک ئەوەی دووبارە کردۆتەوە.

وە دە گێڕدرێتەوە لە پێغەمبەرﷺ کە فەرموویەتی: ((**سبع يلعنهم الله تعالى ولا ينظر إليهم يوم القيامة ويقول ادخلوا النار مع الداخلين**))[١٢٨] واتــە: خــوای گــەورە نەفرەتی لە حەفت چین مرۆڤ کردووە، وە خوا بــە چــاوی بــەزەیی تەماشــایان ناکات، و فەرمان دەکات کە بیان بەنە دۆزەخ لەگەڵ ئەوانەی کــە دەچــنە نــاو ئاگر بە نەمری و هەتاهەتایی.. ((**الفاعل والمفعول به -يعــني اللــواط-، ونــاكح البهيمة، وناكح الأمر وبنتها، وناكح يده، إلاّ أن يتوبوا**))[١٢٩] واتە: ئەوانەی دەچــنە

---

(١٢٦) سورة هود ئايەتی ٨٣

(١٢٧) رواه النسائي

(١٢٨) بڕوانە (كتاب الكبائر) لاپەڕە ٥٦

(١٢٩) رواه الطبراني

لای نێر یاخود مێ لـه پاشــەوە، وە ئەوانــەی دەچــنە لای چـوارپێ و، ئەوانــەی دەچنە لای دایک و کچی و، ئەوانەی بەدەست خۆیان ڕەحەت دەکـەن، بـەڵام ئەگەر ئەو جۆرە کەسانە پەشیمان ببنەوە لە گوناهەکانیان، خوا لێیان خـۆش دەبێ.

**سزای ئەوانە چیە کە کردەوەی نەتەوەی (لوط) دەکەن؟**

زانایان زۆر بیروڕایان هەیە دەربارەی ئەم کردەوە ناشیرینە، هەندێک دەڵێن دەبــێ دارکــاری بکــرێن و، هەنــدێکیان دەڵــێن دەبــێ بــەردباران بکــرێن و، هەندێکیان دەڵێن دەبێ (سەرکەوت و بن کـەوتو) بکـوژرێن. ئیمـام شـافعیش دەڵێت پێویستە سەرکەوتو بن کەوتو بکوژرێن، بەڵام (کوشـتنەکەی دەبـێ لـە بەرزاییەکەوە هەڵبدرێنە خـوارەوە، یـان دیـوارێکی بەسـەردا بـڕوخێنن یـان سەری ببڕن).

(**حافظ المنذري**)[130] دەڵێت: چوار خەلیفە (ابوبکر و علی و عبدالله بن زبیـر و هشـام بـن عبـدالملک) نێربازیـان بـە ئـاگر سـوتاندووە، (بـەڵام لـە کتێبـی شەریعەتدا) دەڵێت: نابێ هیچ گیان لەبـەرێک بـە ئـاگر بسـوتێنرێت، چـونکە ئێش و ئازاری زۆر تێدایە، بەڵام ئەم خەلیفانە ئەو شتەیان کـردووە بـۆ ئـەوەی ببێ بە پەند و ئامۆژگاری بۆ خەڵک).

---

(١٣٠) خاوەنی کتێبی (ترغیب وترهیب)ە، زانایەکی زۆر بەرز بووە لە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ

# تاوانی دوازدەهەم

## ســوو (الربــا)

خوا دەفـەرمووێت: ((الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إِلاَ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُـهُ الشَّيْطَانُ مِنْ الْمَسِّ))[131] واتە: ئەو کەسانەی کە سوو وەردەگرن، بـەناڕەوا مـاڵی خەڵک دەخۆن و لێی پەشیمان نابنەوە، ڕاست نابنەوە لـە گـۆڕ بـۆ پرسـیار و پاداشی دواڕۆژ، تەنها بەشێوەی شتێک کە شـەیتان دەسـتی لـێ وەشـاندبێ و شێت بووبێ.

خوا دەفەرمووێ لە ئایەتێکی تـردا: ((يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَذَرُوا مَا بَقِيَ مِنْ الرِّبَا إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ(٢٧٨)فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا فَأْذَنُوا بِحَرْبٍ مِنْ اللَّهِ وَرَسُـولِهِ))[132] واتە: ئەی ئـەو کەسـانەی کـە باوەڕتـان بـە خـودا هێنـاوە، لـەخودا بترسـن و وازبهێنن لە سوو خواردن ئەو سووەی ماوەتەوە لەسەر خەڵک ئەگەر خۆتان بە موسڵمان دەزانن، ئەگەر وازناهێنن لە سوو خواردن، هوشیار بن بـۆ شـەڕکردن لەگەڵ خودا و پێغەمبەر لە دونیا و ڕۆژی دواییدا.

(شێخی ابن حجر) دەفەرموێ: سوو سێ جۆرە[133] واتە سێ جۆرە سوو لەناو خەڵکدا دەکرێ: (یەکەمیان) پێی دەوترێ (ربا الفضل)، (دووەم) پێی دەوتـرێ (ربا الید)، سێیەمیان پێی دەوترێت (ربا النساء). ئەم جـۆرە سـووانە هـەموویان دروست نین و مایەی تاوانبارین.

---

(١٣١) سورة البقرة ئایەتی ٢٧٥

(١٣٢) سورة البقرة ئایەتی ٢٧٩

(١٣٣) (ربا) لە زماندا بە مانا زیادەیە، لە شەرعدا بە مانا زیادە لە مامڵەیە لە تۆڵەی ماڵ لە کاتی مامڵەکردن، بە مەرجێك مامڵەکە جۆری یەك بێت.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((**لعن رسول اللهﷺ آكل الربا وموكله وكاتبه وشاهدايه وقال هم سواء**))[١٣٤] واتە: پێغەمبەری خوا نەفرەت و لەعنەتی کردووە لە سووخۆر و، لە وەکیلەکەی و، لەوەش کە پەیمانی هەردوولا دەنوسێتەوە و لە گەواهي‌یەکانی- شایەدی ئەدەن، فەرمووی ئەمانە هەموویان وەکو یەک گوناه بار و تاوانبارن.

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**لعن رسول اللهﷺ الواشمة والمستوشمة**)) واتە: پێغەمبەری خوا نەفرەتی لەو ژنانە کردووە کە لەشی مرۆڤ دەکوتن و شینی دەکەن و، لەو ژنانەش کە لەشی خۆیان دەکوتن.. ((**وآكل الربا وموكله**)) واتە: نەفرەتی کردووە لە سووخۆر و وەکیلەکەی.. ((**ونهى عن ثمن الكلب**)) وە قەدەغەی فرۆشتنی سەگی کردووە، چونکە ئاوەگڵاوە.. ((**وكسب البغيّ**)) وە ئەو کرێیەی کە ژنی داوێن پیس لە کردەوەی خراپ پەیدای دەکات.. ((**ولعن المصورين**))[١٣٥] وە ئەو وێنەگرانەی کە وێنەی قەدەغەکراو دەکێشن.

پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: ((**إذا ظهر الزنا والربا في قرية فقد أحلّوا بأنفسهم عذاب الله**))[١٣٦] واتە: ئەگەر بە ئاشکرا داوێن پیسی کرا و سوو خورا لە هەر شار و دێهاتێکدا، ئەوا سزای خوایان لەسەر خۆیان سەپاندوە.

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێت: ((**إياك والذنوب التي لا تُغفر: الغلول (السرقة في المغنم)، فمن غل شيئاً أتي به يوم القيامة، وآكل الربا، فمن أكل الربا بُعث يوم القيامة مجنوناً يتخبط. ثم قرأ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إِلاَ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنْ الْمَسِّ**))[١٣٧] واتە: خۆتان بپارێزن لەو گوناهانەی کە خوا

---

(١٣٤) رواه مسلم وابوداود والترمذي عن جابرؓ

(١٣٥) رواه البخاري عن ابي جُحيفة عن ابيه ؓ

(١٣٦) رواه الحاكم وقال صحيح الإسناد.

(١٣٧) رواه الطبراني

لێی خۆش نابێت، مەگەر پاشگەز بێتەوە: فڕوفێڵ کردن لەو ماڵەی لە غـەزادا چنگ دەکەوێ و هەرکەسێک فێڵ بکات چ بە دزین و چ بە فرت و فـێڵ بێـت بە هەر شێوەیەک بێت، دەبێ لە ڕۆژی دوایـی بیهێنەێتـەوە، وە ئـەو کەسـەی سـوو دەخـوات لـە ڕۆژی دوایی‌ـدا زینـدوو دەکرێتـەوە بـە شـێتی و سـەر لێشێواوی، لە پاشان ئەو ئایەتەی خوێنـدەوە ((**الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إِلاَ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنْ الْمَسِّ**.(١٣٨)))[١٣٩].

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**درهم ربا يأكله الرجل وهو يعلم اشد مـن سـتة وثلاثين زنيةً**))[١٤٠] واتە ئە کەسەی یەک درهەم سوو بخوات، لەگەڵ ئەوەش کە بزانێت خوا قەدەغەی کردووە، ئەمە بـاری گرانتـرە لـە ئـێش و سـزای داوێـن پیسێک بە سی و شەش جار.

**تێبینی:**

هەروەها بە بیروڕای هـەموو زانایـان (ربـا) واتـە سـوو خـواردن بـە تاوانـە مەزنەکان دەژمێردرێ و لەو گوناهانەیە کە مرۆڤ دەفەوتێنێ.. کەسێک (سـوو خواردن) بە حەڵاڵ بزانێـت، ئـەوا پـێی کـافر دەبـێ –واتـە بێبـاوەڕ دەبـێ و هەروەکو لە (زواجر)ی شێخ ابن حجر) دەفـەرموێ (**إن الربا حرام إجماعاً وهم من الكبائر المهملة وكفر مستظلة**)[١٤١].

(١٣٨) ئاگـادار بـە –خوێنـدەواری ئـازیز– ماناکـەی ئـەم ئایەتـە لەگـەڵ سـەرجەمی ئایەتەکـەی ڕابـردوو لێکدراوەتەوە.

(١٣٩) سورة البقرة ئایەتی ٢٧٥

(١٤٠) رواه الإمام احمد والطبراني عن عبدالله بن الحنظلة غسيل الملائكة‌رضي الله عنه

(١٤١) بڕوانە کتێبی (الزواجر) بەرگی یەکەم لاپەڕە ٢٢٨

**پاشکۆ:**

من جملـه) ڕیبـا واتـه سـوو خـواردن تـاوانێکی گەورەیـە تەنانـەت تاوانـە گەورەکان کە لە (حەوصەد) زیـاترن نۆیـان لـێ جیاکراونەتـەوە و لـەو نۆیشـە حەوتیان جیاکراونەتەوە و لـەناو ئـەو حەوتـە جیاکراوانـەدا (ڕیبـا) واتـە سـوو خواردن لە هەموویان نالەبارتر و ناڕەواترە، ئەم تاوانە ئەوەنـدە گرانـە شـاهێد و نووسەر و یارمەتی دەریش ئەگرێتەوە، واتە ئەم سـیانەش وەک سـوو خۆرەکـە تیا تاوانبار ئەبن و بەر نەفرینی خوا ئەکەون.

دەگێڕنەوە لە ڕۆژی قیامەتا، کە مـردوو زینـدوو ئەکرێتـەوە، سـووخۆرەکان لەسەر شێوەی (سەگ و بەراز) زینـدوو ئەکرێنـەوە، چـونکە ئـەمان بەشـێوەی فڕوفێڵ و ماڵی داماوانیان وەرگرتووە و بە ناهەق خواردوویانـە. ڕێـک خسـتنی ئەم (ڕیوایەتە) لەگەڵ ئایەتی ڕیبادا بەم جۆرە دەبێ، هەروەها سووخۆرەکان کە لە گۆڕ دەرچوون شێوەیان دێتە سەر شێوەی سەگ و بەراز لە پاش مـاوەیێکی کـەم وەک لـەوەو پـێش دەچـنەوە سـەر شـێوەی ئـادەمیزاد. لـەم بابەتـەوە فەرموودەی زۆر ڕیوایەت کراوە.[١٤٢]

---

(١٤٢) بڕوانە مەکتوباتی ئاك ئەحمەدی شێخ- مەلا عبدالکریمی مدرس وەریگێڕاوەتە سەر کوردی.. بەرگی سێهەم لاپەڕەی ٢٨٠، لەگەڵ دەستکاریدا.

# تاوانی سێزدەهەم

## خواردنی ماڵی هەتیو و ستەم لێ کردنی

### (اكل مال اليتيم وظلمه)

خوا دەفەرموێت: [١٤٣] واتـە: ئـەو کەسـانەی کـە مـاڵی کەسـانی بێبـاوک دەخۆن بە ستەم، لە پاشەڕۆژێکی نزیکدا دەخرێنە ئاگری بە کڵپــە و بڵێســەی دۆزەخەوە بەڕاستی پڕ بە سکی خۆیان ئاگری دۆزەخ دەخۆن.

لە ئایەتێکی تردا خوا دەفــەرمووێت: ((**وَلاَ تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ**))[١٤٤] واتە: نزیکی ماڵ و سامانی هەتیو مەکەون، ئەگەر نزیکیش کــەوتن بەشــێوەیەک بــێ کــە بــە مەبەســتی ئاگــاداری کــردن بــێ و نیــازی بێگەردبێ هەتا ئاشنایان دەبن و بیرو هۆش پەیدا دەکەن لە بارەیانەوە.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: لە حەوت گوناهی فەوتێنــەر نزیــک مەکەونــەوە.. یەک لەمانە ((**أكل مال اليتيم**)) واتە خواردنی ماڵێ هەتیوە..

هەروەها بڕوانە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرﷺ کـە چ موژدەیــەکی خۆشــی تێدایە بۆ ئیمانداران، وەک پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**أنا وكافل اليتيم في الجنة هكذا وأشار بالسّبابة والوسطى وفرّج بينهما**))[١٤٥] واتە: من و ئــەو کەســانەی کــە هەتیو دەگرنە لای خۆیان لە بەهەشتدا پێکەوەین، پێغەمبەرﷺ دەستنیشــانی ئەو شتەی کرد بە بڵندکردنی دوو پەنجەی پیرۆزی.

لە (زواجر)دا دەڵێــت: (**إن الله تعالى أوحى إلى داود عليه السلام: يــا داود كُــن لليتيم كالأب الرّحيم، وكُن للأرملة كالزوج الشفيق وأعلم أنك كما تــزرع كــذا**

---

(١٤٣) سورەتی النساء ئایەتی ١٠

(١٤٤) سورەی الانعام ئایەتی ١٥٢

(١٤٥) رواه البخاري وابوداود والترمذي عن سهل بن سعدؓ.

**تحصد**) واته: خوا پەیامی ناردووە بۆ داود —سلاوی خـوای لێبێـت- فـەرمووی: ئەی داود، بۆ هەتیوان وەک باوکێکی بە بەزەیی و دڵسۆز بە، بۆ بێوەژنـان وەک مێردێکی بەسۆز و بەزەیی و دڵسۆز بە.. بزانە تـۆ چـی بچـێنیت ئـەوە دروێنـە دەکەیتەوە.

پێغەمبەرﷺ دەفـەرمووێت: ((**خير بيت في المسلمين بيت فيه يتيم يُحسن إليـه، وشرّ بيت في المسلمين بيت فيه يتيم يُساء إليه**))[١٤٦] واتە: باشترین ماڵی موسـڵمانان ئەو ماڵەیە هەتیوێکی لیٚ بێت و بۆی باش بن، خراپترین ماڵی موسـڵمانان ئـەو ماڵەیە هەتیوێکی لیٚ بێت و بۆی خراپ بن..

**(تنبيه) إن أكل مال اليتيم من الكبائر المهلكة إتفاقا...الخ.**

**سەرنجێك:**

خواردنی ماڵی هەتیوان بـە بیـروڕای هـەموو زانایـان بـە تاوانـە مەزنـەکان دەژمێردرێت و چونکە مرۆڤ دەفەوتێنن، خواردنی ماڵ و سامانی هەتیو کەم و زۆر ئەکەر یەک دەنکە گەنم بێت، ئەگەر بە سـتەم بێـت بـە گونـاهی گـەورە دەژمێردرێت.

---

(١٤٦) رواه ابن ماجه عن ابي هريرةﷺ

# تاوانی چواردەهەم

## درۆکردن بە خوا و پێغەمبەر و درۆ کردن لەکاتی قسەکرن بەبێ هۆ

## (الكذب على الله وعلى رسوله ﷺ والكذب في غالب اقواله)

خوا دەفـەرمووێت: ((**وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ تَرَى الَّذِينَ كَـذَبُوا عَلَـى اللَّـهِ وُجُـوهُهُمْ مُسْوَدَّةٌ**))[١٤٧] واتە: ئەوانەی درۆیان بۆ خودا هەڵبەستووەو ئەڵێن خوا نەوەی کچ و کوڕی هەیە (یان هاوبەشی هەیە) بە ڕۆژی دواییـدا ئـەیان بینـی کـە چـۆن ڕوویان وەک قیر ڕەشە لەبەر (باری) خودادا.

پێغەمبەرﷺ دەفـەرمووێت: ((**من كذب عليّ متعمـداً فليتبـوأ مقعـده مـن النار**))[١٤٨] واتە: هەرکەسێک درۆ و بە عەمـەدن بـە زمـانی منـەوە هەڵبەسـتێ جێگایەک لە دۆزەخدا بۆ خۆی تەرخان دەکات.

(ئەی موسڵمانەکان) درۆ دوو جۆری هەیە: یەکەمیان تـاوانی گـەورەترە لـە دووەمیان، لە هەموو درۆیان خراپ تر ئەوەیە کە درۆ هەڵبەستێ بەناوی خـوا و پێغەمبەرەوە.

پێغەمبەرﷺ دەفـەرمووێت: ((**إِنَّ كَذِبًا عَلَيَّ لَيْسَ كَكَذِبٍ عَلَى أَحَدٍ مَنْ كَـذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ**))[١٤٩] واتە: بەڕاستی درۆ هەڵبەستن بـە نـاوی منـەوە وەک ئـەو درۆیـە نییـە کـە بـەناوی یـەکێکی تـرەوە هەڵدەبەسـترێ، هەرکەسێک درۆ بەزمانی منـەوە هەڵبەسـتێ، جێگایـەک بـۆ خـۆی تـەرخان دەکات لە ئاگری دۆزەخدا..

---

(١٤٧) سورەی الزمر ئایەتی ٦٠

(١٤٨) رواه البخاري ومسلم وغيرهما.

(١٤٩) رواه مسلم وغيره

خوا دەفەرمووێت: ((فَنَجْعَلْ لَعْنَةَ اللّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ))[150] واتە: ئاگادار بن خودا نەفرەتی کردووە لەو کەسانەی کە درۆزنن.

هەروەها لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێت: ((إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ))[151] واتە: بەڕاستی خوا ڕێگای ڕاست نابەخشێ بەو کەسانەی کە درۆزنن و بێباوەڕن.

هەروەها خودا دیسان دەفەرمووێت: ((إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ))[152] واتە: بەڕاستی خودا ڕێگای راست بە ئادەمیزادی زۆر درۆزن نیشان نادات.

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ فَإِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَصْدُقُ وَيَتَحَرَّى الصِّدْقَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ صِدِّيقًا وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ فَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَكْذِبُ وَيَتَحَرَّى الْكَذِبَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ كَذَّابًا))[153] واتە: ڕاستکۆ بن و ڕاستگۆیی بە پێویست بزانن، چونکە ڕاست گۆیی بەرەو کردەوەی باشتان دەبات و کردەوەی باشیش بەرەو بەهەشتتان دەبات، ئەگەر مرۆڤ ڕاستی ووت و بەردەوام بوو لەسەر ڕاستەکەی، خوا بە ڕاستگۆی دادەنێت.. ئێوە خۆتان دوور بخەنەوە لە درۆ کردن، چونکە درۆ بەرەو کردەوەی خراپتان دەبات، کردەوەی خراپیش ئاگری دۆزەختان بۆ مسۆگەر دەکات، ئەگەر مرۆڤ درۆی کرد و بەردەوام بوو لەسەر درۆکەی، ئەوا بێ گومان خودا بە درۆزنی دادەنێت.

پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: ((إِذَا كَذَبَ الْعَبْدُ تَبَاعَدَ عَنْهُ

(١٥٠) سورەتی آل عمران ئایەتی ٦١
(١٥١) سورەی الزمر ئایەتی ٣
(١٥٢) سورەی الغافر ئایەتی ٢٨
(١٥٣) رواه البخاري ومسلم عن ابن مسعودرضي الله عنه

**الْمَلَكُ مِيلًا مِنْ نَتْنِ مَا جَاءَ بِهِ))**[١٥٤] واتە: ئەگەر بەندەیەک درۆی کرد، فریشتەی خوا هێندەی یەک (میل) لێی بەدوور دەکەونەوە، لەبەر بۆگەنی دەم و زاری ئەو بەندە درۆزنە.

پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: ((**كَبُرَتْ خِيَانَةً أَنْ تُحَدِّثَ أَخَاكَ حَدِيثًا هُوَ لَكَ بِهِ مُصَدِّقٌ وَأَنْتَ لَهُ بِهِ كَاذِبٌ**))[١٥٥] واتە: گەورەترین خیانەت ئەوەیە کە تۆ قسەیەک بۆ برای خۆت بکەیت و ئەو بڕوات پێ بکات و تۆش بزانی درۆیە.

هەروەها لە ابو هریرە ڕیوایەت کراوە پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ**))[١٥٦] واتە: نیشانەی ناپاکان و دووڕوان سێ شتە: ئەگەر قسەی کرد درۆ بکات، ئەگەر بەڵێنێک بدات و بیشکێنێت و، ئەگەر ڕاسپاردەیان لەلا دانا خیانەت بکات.

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**لا تجتمع خصلتان في مؤمن البخل والكذب**))[١٥٧] واتە: ڕەزیلی و درۆ لە بڕوادار کۆنابێتەوە.

دووبارە دەفەرمووێت: ((**وَيْلٌ لِلَّذِي يُحَدِّثُ بِالْحَدِيثِ لِيُضْحِكَ بِهِ الْقَوْمَ فَيَكْذِبُ وَيْلٌ لَهُ وَيْلٌ لَهُ**))[١٥٨] واتە: قوڕ بەسەری و سزا بۆ ئەو کەسەیە کە درۆ دەکاو قسەو قسەڵۆک هەڵدەبەستن بەدرۆ بۆ ئەوەی خەڵک پێی پێبکەنن (سێجار ووشەی ویلی دووباری کردۆتەوە).

---

(١٥٤) رواه الترمذي عن ابن عمرﷺ
(١٥٥) رواه ابوداود عن سفيان بن اسيد الحضرميﷺ.
(١٥٦) متفق عليه
(١٥٧) رواه احمد
(١٥٨) رواه الترمذي

**تێبینی:**

بەڕاستی درۆکردن دەردرێکی زۆر گەورەیە، درۆ زیانی ئاین و دونیای هەیە سەرچاوەی هەموو گوناهێکە، بەڵێ هەر درۆ دەبێتە ناکۆکی هۆی لەنێوان خەڵکدا دروست دەکا و هەموو برادەر و دۆستێک لە یەک دەکات. لەبەر ئەوە ئیسلام ئەم گوناهەی بە تاوانە مەزنەکان داناوە.

وە لە کیتابی (زواجـر)دا دەڵێت: بەڕاستی بەلای هەندێ زانایان درۆ هەڵبەستێ بەناوی خودا و پێغەمبەرەوەﷺ بێبڕوایی و گومڕاهیـیە، چونکە مرۆڤ دەترازێنێ لە نەوەی ئیسلام.

**پاشکۆ:**

**هەروەها پێویستە بزانین درۆ کردن چەند جۆری هەیە، بەکورتی:**

**(یەکەم)** ئەمە بە تاوانێکی گەورە دائەنرێ سوێند خواردنی بە درۆ بۆ ئەوەی ماڵی خەڵک بە ناهەق بخوات، چ ماڵ و سامانی موسڵمان و چ ماڵ و سامانی ئینسانێکی (**ذیمی**) بێت، ئنجا چ بەبێ هوودە و بێسوود ئەو سوێندە بخوا یا بە هەر مەبەستێ بێ سوێندی درۆ بخوا.

هەروەها ریوایەت کراوە: هەرکەس سوێندی درۆ بخوا بۆ ئەوەی ماڵ و سامانی موسوڵمانان بخوا، خوای گەورە لە ڕۆژی (قیامدا غەزەبی لێ دەگرێ)، هەروەها ریوایەت کراوە حەزرەتﷺ فەرموویەتی: بەو خوایە کە گیانی منی لەدەست دایە، هەرکەس سوێندی درۆ بخوا، خاڵێکی ڕەش لەسەر دڵی پەیدا دەبێ هەتا ڕۆژی (قیامەت) لاناچێ.

**(دووەم)** هەروەها ڕیوایەت کراوە: هەرکەسێ سوێندی درۆ بخوات بیکاتە هۆی وەرگرتنی ماڵ و سامانی (حەرام)، ئەوە بەهەشت لەخۆی حەرام ئەکا و مادەم خوا عەفوی نەکا، چونکە موستەحەقی ئاگری دۆزەخ ئەبێ.. عەرزیان

کرد با ئەو ماڵ و سامانەش کـەم بـێ؟ فـەرمووی: بـا ئـەو ماڵـەیش بـە قـەدەر قەیتانی سۆلی ئینسان بێ تا بەو گوناهە نەسووتێ و حەقی ئەو سـوێندەی لـێ نەسەنرێ ناچێتە بەهەشتەوە..

لە ریوایەتێکی تردا ئەڵێ: ((**فليتبوأ مقعده من النار**)) واتە: با جێگای خـۆی لـە دۆزەخا بگرێ.. بێجگە لەمانە سوێند بە درۆ خواردن پیت و بەرەکـەتی دارایـی ناهێڵێ، چونکە فەرموودەی حەزرەتەﷺ ((**اليمين الفاجرة منفقة للسلعة ممحقة للكسب**))[159] واتە: سوێندی درۆ ماڵ و سامان ئەخاتە ڕەواجەوە بەڵام کاسبیی خاوەنەکەی بێ‌پیت ئەکا..

**(سێیەم)** هەروەها لە جوملەی تاوانی گەورەیـە درۆکـردن لـە حـەدیپی شەریفا هەیە درۆکردن بە نیشانەی (منـافق دانـراوە. هـەروەکوو لـەپێش ئـەم فەرموودەیە ڕابوورد. هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: چـاکەکردن لەگەڵ باوک و دایکا عومری ئینسان زیاد ئەکا و درۆکـردن ڕزق و ڕۆزی کـەم ئەکا.

(براکانم) زۆربەی تاوان و گوناهەکان زیانی قیامەتیان هەیە و زیانی دنیایان نیی‌یە یا کەمە، بەڵام درۆکردن زیانی بۆ دین و دنیا هەیە. تەنانـەت ئەگـەر بـە گاڵتە درۆ بکا و لە درۆکەدا (توریە) نەکا ئـەوە بـە تـاوان و گونـاهێکی گـەورە ئەنووسرێ لەسەری.[160]

---

(١٥٩) رواه ابوداود والترمذي والبيهقي.

(١٦٠) بڕوانـە (مـەکتووباتی کـاک ئەحمـەدی شـێخ- مامۆسـتا مـەلا عبـدالکریمی مـدرس- لـە فارسـی‌یەوە وەرگێڕاوەتە سەر کوردی) بەرگی سێهەم لاپەڕە ٣٣٠- لەگەڵ دەست ئێدان.

# تاوانی پازدەهەم

## هەڵاتن لە شەڕی کافراندا (الفرار من الزحف)

خوا دەفەرمووێت: ((**وَمَنْ يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلاَّ مُتَحَرِّفًا لِقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَى فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِنْ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ**))[161] واتە: هەرکەسێک لە ڕۆژی گەیشتن بە کافراندا پشتیان تێبکات و بگەڕێتەوە بەبێ ئەوەی پیلان و فێڵ بێت هەتا خۆی بشکێنێ لەلایەکی دیکەوە ڕێگا لە دوژمن بگرێت ئەوە بەڕاستی خودا لێی دەڕەنجێ و جێگەشی هەر دۆزەخ دەبێ و دۆزەخیش خراپترین جێگایە.

پێغەمبەرﷺ لەبارەی ئەم تاوانە دەفەرمووێت: ((**اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا هُنَّ قَالَ الشِّرْكُ بِاللَّهِ وَالسِّحْرُ وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَكْلُ الرِّبَا وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ الْغَافِلَاتِ**))[162] واتە: خۆتان بپارێزن لە حەوت تاوانی فەوتێنەر، ووتیان: کامانەن ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: هاوبەش بۆ خودا دانان و، جادو و، کوشتنی یەکێک کە خوا قەدەغەی کردووە تەنها بەڕەوا نەبێت، وە خواردنی سوو، وە خواردنی ماڵی هەتیوو، و هەڵاتن لە جەنگ و شەڕی کافراندا درۆ هەڵبەستن بەسەر ئەو ژنە پاکە موسڵمانانەی کە ئاگایان لە هیچ نییە.

لە (زواجر)دا ئیمام شافعی دەفەرمووێت: ئەگەر موسڵمانەکان جەنگیان کرد و پاشان تووشی بێهێزی هاتن لەلایەن دوژمنەوە ئەوە قەدەغەکراوە لەسەریان پشت لە پاش کەن و هەڵێن، تەنها ئەگەر بەشێوەی پیلان نەبێت و، بە فێڵ

---

(١٦١) سورەی الانفال ئایەتی ١٦

(١٦٢) رواه البخاري ومسلم عن ابي هريرةرضي الله عنه

خۆیان بشکێنن و پاشان بگەڕێنەوە سەر دوژمنەکەیان، یان لەلایەکی دیکـەوە بگەنەوە لای هاوڕێکانیان.

وە دەفەرمووێت ئەگەر بێت و گاورەکان زۆرتر بن لە موسڵمانەکان دیسـان بەش نیـیە ڕابکەن، ئەگەر ڕاش بکەن بەرەنگاری سزای خوا نابن بەلای منەوە، چونکە هەلاتن لەڕێزی غەزادا بەو مەرجەی نیوهەندەی کافران یان زیـاتر بـن، بەلام ئەگەر کەم تر بن لە ژمارەی دوژمنی ئیسلام هەلاتن و کۆڵ دان قەدەغە نیـیە.[١٦٣]

---

(١٦٣) بڕوانە پەرتووکی (الزواجر عن اقتراف الکبائر) تألیف احمد بن محمد بن علي بن حجر الهیتمي- بەرگی دووەم- لاپەڕە ١٧٢

# تاوانی شازدەهەم

## ناپاکی و ستەم کردنی پێشەوا بەرامبەر گەلەکەی

## (غش الإمام الرعية وظلمهم)

خوا دەفەرمووێت: ((وَلاَ تَحْسَبَنَّ اللّهَ غَافِلاً عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ الأَبْصَارُ))[١٦٤] واتە: وامەزانە کە خوای گەورە بێئاگایە لە کردەوەی خراپ و ستەمی ستەمکاران، بەڵکو خوا دوایان دەخات بۆ ڕۆژێک کە لە ترسا چاویان لە مۆلەق ڕاوەستێ و سەرسام دەبن.

خوای مەزن دەفەرمووێت: ((وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ))[١٦٥] واتە: لەمەولاش ئەو ستەم کارانە دەزانن و چاویان پێدەکەوێ بەچ هەڵسووڕانی هەڵدەسووڕێن و لە چ بارێکی بەرزی‌یەوە دەکەونە سەر باری کزی و داماوی و لەسەرباری رابواردنی دنیاوە دەکەونە سەر چ بارێکی سزای ڕۆژی دوایی.

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((من غشنا فليس منا))[١٦٦] واتە: هەرکەسێ فێڵمان لێبکات لە ئێمە نی‌یە.

دیسان دەفەرمووێت: ((الظلم ظلمات يوم القيامة))[١٦٧] واتە: زوڵم و ستەم تاریکاییە لە ڕۆژی دواییدا.

---

(١٦٤) سورە ابراهيم ئايەتی ٤٢

(١٦٥) سورەی الشعراء ئايەتی ٢٢٧

(١٦٦) رواه مسلم عن ابي هريرة رضي الله عنه

(١٦٧) رواه الشيخان عن ابن عمر رضي الله عنهما

هەروەها پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموویت: ((**كلكم راع وكلكم مسؤل عن رعيته**))[١٦٨] واتە: هەریەک لەئێوە شوانە و بەرپرسیارە لەوەی کە لەژێر چاودێریدایە.

وە لە فەرموودەیەکی تردا حەزرەت ﷺ دەفەرموویت: ((**إيّما راع غشّ رعيته فهو في النار**))[١٦٩] واتە: هەر شوانێک لەئێوە خیانەت و فێڵ لەگەڵ میللەتەکەی خۆی بکات، ئەوە بۆ ناو ئاگرە –خوا پەنامان بێت-.

**سەرنجێك:**

ئەوەش دانراوە بە تاوانە مەزنەکان ئەگەر هەر پێشەوایەک و سەرۆکێک فێڵ و خیانەت بکات لەگەڵ میللەت، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: ((**مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْتَرْعِيهِ اللَّهُ رَعِيَّةً يَمُوتُ يَوْمَ يَمُوتُ وَهُوَ غَاشٌّ لِرَعِيَّتِهِ إِلَّا حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ**))[١٧٠] واتە: هیچ بەندەیەک نیيە کە خوا بیکاتە شوانی کۆمەڵێک و فێڵیان لەگەڵ بکا و بمرێ لەو ڕۆژەدا کە ئەمری بێگومان خوا بەهەشتی لێ قەدەغە دەکات.

بەڵام ئەگەر هەر سەرۆک و پێشەوایەک بە یەکسانی بجوڵێتەوە پاداشی بەهیچ جۆرێک تەواو نابێت. پێغەمبەرﷺ بە ئەبوهورەیرەی فەرموو: ((**يا أباهريرة عدل ساعة خيرٌ من عبادة ستين سنة**))[١٧١] واتە: ئەی اباهریرە، یەک کات ژمێر بەڕاستی بە دادپەروەری خێرمەندترە لە شەست ساڵ خواپەرستی.

---

(١٦٨) متفق عليه

(١٦٩) رواه الطبراني

(١٧٠) متفق عليه

(١٧١) رواه الطبراني.

هەروەها حەزرەتﷺ لە فەرموودەیێکی تردا دەفەرموویّت: ((**یوم مـــن إمـــام عادل أفضل من عبادة ستين سنة**))[172] واتـە: پێشـەوا ڕۆژێـک بـە دادپـەروەری بجولێتەوە لە شەست ساڵ خواپەرستی باشترە واتە خواپەرستی (سونەت).

**پاشکۆ:**

هەروەها ڕیوایەت کراوە خزمـەتی ڕۆژێ لەلایـەن (حـاکمی) دادپـەروەرەوە خێر و پاداشی لە عیبادەتی شەست ساڵ زۆرتـرە هـەروەها لـە فـەرموودەیێکی تردا پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی کە جـەور و سـتەمی (حاکمـیّ) بـۆ تاقـە ڕۆژێ تاوانی زۆرتر و سزای توندترە لە تاوانی (عادەتی) ئینسانی لـە مـاوەی شەسـت ساڵدا.[173]

---

(172) رواه الطبراني ايضاً

(173) بڕوانە پەرتووکی مەکتووباتی کاك ئەحمەدی شێخ، بەرگی سێهەم لاپەرە 173.

# تاوانی حەڤدەهەم

## خۆ بەزل زانین (الكبر)

خوا دەفـەرمووێت: ((كَذَلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَى كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّـارٍ))[174] واتـە: خودای مەزن مۆری ناوە بە دڵیانا، ڕۆناکی دادپەرستی ناڕواتە ناو دڵیانەوە لەبەر دەمار گیری و خۆ بەزل زانین و گاڵتەپێکردن بە ئاین و هەرکەسێ خـۆی بـە زل بزانێ و ستەمکار بێت، بێ گومان ئەوانە خوا مۆر دەنێ بە دڵیانا..

لە ئایەتێکی تردا دەفـەرمووێت: ((إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَـيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ))[175] واتە: ئەو کەسانەی کە خۆیان بە گـەورە و زل دەزانـن لـە ئاست بەندەی مندا ئەبێ لەمەولا مل کەچکەن و بەداماوی بچنە ناو دۆزەخەوە.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ((إِنَّهُ لاَ يُحِـبُّ الْمُسْـتَكْبِرِينَ))[176] واتـە: بـە ڕاستی خودا خاوەن دەمار و بەفیزەکانی خۆش ناوێت..

ئایەتیش لەبارەی سەرزەنشتی فیزەوە زۆرن.

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَـالُ ذَرَّةٍ مِـنْ كِبْرٍ. قَالَ رَجُلٌ: إِنَّ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ ثَوْبُهُ حَسَنًا، وَنَعْلُهُ حَسَنَةً، قَـالَ: إِنَّ اللَّـهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ، الْكِبْرُ بَطَرُ الْحَقِّ وَغَمْطُ النَّاسِ))[177]واتە: هەرکەسێ هێندەی یەک خەردەل فیزی لەدڵدا بێت ناچێتە بەهەشت، پیاوێک ووتی: یەکێک حەز دەکات جلوبەرگ و پێڵاوی جوان بێت.. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەمووشـتێکی خوا جوانە و خوا هەموو شتێکی جوانی خۆش دەوێت. خـۆ بـەزل زانـین ئـەوە

(١٧٤) سورەی غافر ئایەتی ٣٥

(١٧٥) سورەی غافر ئایەتی ٦

(١٧٦) سورەی النحل ئایەتی ٢٣

(١٧٧) رواه مسلم والترمذي عن عبدالله بن مسعودؓ

نیـیه که ئادەمیزاد حەز لە شتی جوان بکات، بـەڵکو فیـزی و خۆبـەزل زانـین ئەوەیە خۆی بەگەورەتر بزانێ لەخەڵک، وە یاخی ببێت لە ڕاستی و بە چاوەکی سـووک و بـێنرخ تەماشـای خـەڵکی بکـات. وە لـە فەرموودەیـەکی تـردا دەفـەرمووێت: ((**لا يَدْخُلُ النَّارَ أَحَدٌ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ وَلا يَـدْخُلُ الْجَنَّةَ أَحَدٌ فِي قَلْبِهِ مِثْقَـالُ حَبَّـةِ خَـرْدَلٍ مِـنْ كِبْـرٍ**))[178] واتـە: پێغەمبـەرﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێ بە ئەندازەی واتە بەقەی دەنکی خەردەلێ ئیمان و باوڕ لە دڵیا بێ ناچێتە ناو دۆزەخ، هەرکەسێکیش بە قەی سەنگی دانەی خـەردەلێ دەعیە و فیز و دەمار لەناو دڵیا بێ ناچێتە ناو بەهەشت.

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەرﷺ دەفـەرمووێت: ((**بَيْنَمَـا رَجُـلٌ يَمْشِي فِي حُلَّةٍ تُعْجِبُه نَفْسه مُرجل رأسه يختال في مشيته إذ خُسِفَ الله بِهِ فَهُوَ يَتَجَلْجَلُ فِي الْأَرْضِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ**))[179] واتە: لە سـەردەمی ڕابـردوودا مرۆڤێـک هـەبووە بەرگی خۆی درێژ کردووە لەبەر فیـز و خۆبـایی بـوون سـەری خـۆی بەشـانە داهێناوە، لە ڕۆیشتندا زۆر لەخۆبایی و بەفیز ڕۆیشـتووە بەسـەر زەویـدا، لەبـەر ئەوە خوا لێی توورە بووە و نوقمی ژێر خاکی خستووە، ئێسـتاش لـە زەویـدا دەچێتە خوارەوە هەتاکو ڕۆژی دوایی.

خوا دەفـەرمووێت: ((**وَلاَ تَمْشِ فِي الأَرْضِ مَرَحًا إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ كُـلَّ مُخْتَـالٍ فَخُورٍ**))[180] واتە: بەسەر زەویدا بەفیز و خۆبـایی بوونـەوە ڕێ مەکـە، چـونکە خودا ئەو چەشنە کەسانەی خۆش ناوێت کە لووتیـان بڵنـدە و لـەخۆیان بـایی بوونە، چونکە بەڕاستی خودا مرۆی بەفیز و بە دەعیە و دەماری خۆش ناوێ.

هەروەها عەبدوڵای کوڕی عومەر (خوا لێی رازی بێت) دەڵێـت: گـوێم لـە پێغەمبەرﷺ بوو دەیفـەرموو: ((**مَنْ تَعَظَّمَ فِي نَفْسِهِ أَوْ اخْتَالَ فِي مِشْيَتِهِ لَقِـيَ اللَّـهَ**

---

(١٧٨) رواه الإمام مسلم والترمذي عن عبدالله

(١٧٩) متفق عليه

(١٨٠) سورەی لقمان ئایەتی ١٨

تبارك وتعالى وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ))[١٨١] واته: هەرکەسێ بە لەخۆباییەوە واتە لە ڕۆیشتندا لەسەر زەوی خۆی بە گەورە بزانێ و بە فیز و لەخۆباییەوە بڕوات، ئەوە خودا بە ڕق و ڕەنجان و کینەوە پێشوازی دەکات.

جا بێ گومان خوای گەورە لە فەرموودەیەکی (**قودسی**)دا لەسەر زوبانی پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**الْكِبْرِيَاءُ رِدَائِي وَالْعَظَمَةُ إِزَارِي فَمَنْ نَازَعَنِي وَاحِدًا مِنْهُمَا قَذَفْتُهُ فِي النَّارِ**))[١٨٢] واتە: گەورەیی و دەسەلأت هەر بۆ خوایە و، هەرکەسێک لەوانە بەربەرەکانێم لەگەڵ بکات، فڕێی دەدەمە ناو دۆزەخەوە.

**ڕوونکردنەوەیەك:**

لەبەر ئەوەی ((**الْكِبْرِيَاءُ رِدَائِي وَالْعَظَمَةُ إِزَارِي**)) ئەو دوو سیفەتە لە سیفەتەکانی خوا، هیچ ڕەوا نیە بۆ بەندەیەکی بێهێز و بێدەسەلأت خۆی بە فیز و زل بزانێ.. واتە بە کوردی (رداء و ازار) دوو پۆشاکن تایبەتن بە خاوەنەکەی خۆیان، کەسی تر مافی نیيە لەو دوو پۆشاکە هاوبەش بن، لەبەر ئەوە ئەم دوو سیفەتە هەر لایەقی خوان، هەرکەسێ داوای هەر یەکێک لەمانە بکات خوا فڕێی دەداتە ناو دۆزەخ.

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**يحضر المتكبرون يوم القيامة في صور الذّر**))[١٨٣] واتە: ئەوانەی خۆیان بە زل زانیوە و خەڵکیان بەکەم زانیوە، خوا حەشریان دەکات لەگەڵ مێروستان (مێروله).

---

(١٨١) رواه الحاكم وقال صحيح على شرط مسلم.

(١٨٢) رواه مسلم وابوداود عن ابي هريرةؓ

(١٨٣) رواه البزار وسنده حسن.

**تێبینی:**

شمس الدین الژهبی له (**کبائر**)دا دەڵێت: خراپترین فیز ئەو فیزەیە کە یەکێک فیز لێبدات بەسەر خەڵکدا بەهۆی زانین و زانیاریەوە، هەروەها خۆی بە گەورە بگرێ و، ئەو زانین و زانیاریە هیچ سوودی پێ ناگەیەنێت. هەرکەسێک داوای زانین و زانیاری بکات بۆ شانازی و سەرکردایەتی و لەخۆبایی، بەچاوێکی سووک و ناشیرین تەمەشای ئەو خەڵکە بکات، ئەوە لە گەورەترین فیزە (وە ئەو کەسانە ناچنە بەهەشت ئەگەر هێندەی یەک خەردەل –زیوان- فیزیان هەبێت، مەگەر پەشیمان ببنەوە).

**سەرنجێك:**

هەروەها ئەم تاوانەش واتە (فیز و لەخۆبایی بوون) ژماردراوە لە تاوانە مەزنەکان، هەروەک زاناکانیش بە ئاشکرا ئەوەیان بەڕاست داناوە.

(یەکەم) فیز ئەوەیە کە فیز لەسەر خوای دروستکار لێبدەیت، هەروەک فیزلێدانی (فیرعەون و نەمروود) کە داوای خوایەتیان دەکرد، بەلاَم جۆری (دووەم) ئەو فیزەیە کە ئێستا لەبارەیەوە دواین.

**پاشکۆ :**

لە جوملەی تاوانی گەورەی نادیارە (تکبر) واتە خۆ بەگەورە گرتن بەسەر خەڵکا، ئەم سیفەتە شتێکی زۆر نابار و ناپەسەندە و ئەبێتە هۆی گوێنەدان بە هەق و تەماشاکردنی موسوڵمانان بەچاوی بچووکی و کەم نرخی و جێبەجێ نەکردنی (**واجباتی ذیمة**) وەک وەلاَمی سەلاَم و فێرکردنی نەزانان و شارەزایی کردنی داماوان، هەروەها ئەبێتە هۆی بێڕەحمی و بێئینصافی دەربارەی

حەقی خەڵک و قصوور لەگەڵ خێزان و لەگەڵ خەڵکی تریشدا و ئەبێتە هـۆی گوێ نەدان بە حقووقی خودا لە (حەددە شەرعي‌یەکانە).

پوختەی قسە ئەوەیە خۆ بەگەورەزانین لای خوا بێجگە لە کوفر لـە هـەموو خووێکی بەد خراپترە. –پەنا بەخوا لەمە و لە صیفەتە ناهەموارەکانی تر–.[١٨٤]

---

(١٨٤) بڕوانە مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخ (ڕەحمەتی خوای لێبێ) بەرگی چوارەم لاپەڕە ١٠

# تاوانی هەژدەهەم

## گەواهی دان بەدرۆ (شهادة الزور)

خوای گەورە دەفەرموویّت: ((وَالَّذِينَ لاَ يَشْهَدُونَ الزُّورَ))[185] واتە: بەندەکانی خوا ئەوانەن ەکە گەواهی (شایەدی) بەدرۆ نادەن.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویّت: ((وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ))[186] واتە: خۆتان بپارێزن لە گەواهيدان بەدرۆ.

(ابو بكرة)ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێت: دانیشتبووین لەلای پێغەمبەرﷺ، فەرمووی: ((أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ؟ قلنا: بَلَى يَا رَسُولَ اللّهِ. قَالَ: الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ وشهادة الزور (أو قول الزور)! وَكَانَ مُتَّكِئًا فَجَلَسَ فَقَالَ (أَلَا وَقَوْلُ الزُّورِ) فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى قُلْنَا لَيْتَهُ سَكَتَ))[187] واتە: ابوبكرە دەگێڕێتەوە (خوا لێی رازی بێت) لە پێغەمبەرەوەﷺ دەیفەرموو: شیوەی گەورەترین تاوانتان پێ ڕاگەیێنم؟ هاوەڵەکانی ووتیان: بەڵی ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: هاوبەش دانان بۆ خوای تاک و تەنیا و، ئازاردانی دایک و باوک و، گەواهی دان بەدرۆ، هەتا سێ جار ئەوەی وتەوە، یەکەم جار پاڵێ دابوّوە، پاشان هەستاوە دانیشت هەر دەیفەرموو: گەواهی دان بەدرۆ.. چەند جار ئەوەی دووبارە کردەوە، ئێمەش گوتمان: خۆزگە بێدەنگ دەبوو.

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموویّت: ((من كتم شهادة إذا دعي إليها كان كمن شهد بالزور))[188] واتە: هەرکەسێ شایەدی نەدا کە بانگیان کرد بۆ شایەدی بە

(185) سورەی الفرقان ئایەتی 72

(186) سورەی الحج ئایەتی 30

(187) رواه الشيخان عن ابي بكرة ﷺ

(188) رواه الطبراني

مەرجێک شایەدیەکەش لەلای بێ و نەیدا، واتە مافی موسڵمانێک بفەوتێنێ، هەروەک شایەدی بەدرۆی دابێ وایە.

(ابوهریرە) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەرﷺ بوو دەیفەرموو: ((**من شهد على مسلم شهادة ليس لها بأهل فليتبوأ مقعده من النار**))[189] واتە: کەسێ شایەدی بدات لەسەر موسڵمانێک، شایەدییەکی وا بەدرۆ بە بوختان بێت، با جێگایەک ئامادە بکات بۆ خۆی لە دۆزەخ.

**تێبینی:**

زاناکان دانیان بەوە ناوە کە شایەدی دان بە درۆ لە تاوانە گەورەکان دەژمێردرێت بە مەرجێک شایەدییەکە بەدرۆ و بوختان بێت، لەبەر ئەوە خوا و پێغەمبەری خودا ئەوەیان قەدەغە کردووە.

**پاشکۆ:**

هەروەها لە (جوملەی) تاوانی گەورەیە (شایەدیدان) بەدرۆ لە فەرموودەی پێغەمبەرایەﷺ کە شەهادەتی (زوور) واتە درۆ لە تاوانە گەورە -هەرە- گەورەکان (حسێب) کراوە، جا من لەبەر توندی و سەختیی سزای ئەم تاوانە لە نامەیێکی تایبەتیدا باسم کردووە. هەروەها شاردنەوەی شایەتیش لە تاوانە گەورەکانە، واتە کەسێ ئاگای لەڕووداوێ بێ وەکو کڕین و فریشتنی ماڵێ، یان مارەبڕینێ، یان ڕووت کردنەوەی ڕێبوارێ.. لەکاتی پێویستیدا ئەو شایەتییە نەدا و (هەقی) خاوەن هەق بفەوتێ، ئەمە تاوانێکی گەورەی دێتە سەر.[190]

---

(١٨٩) رواه احمد عن ابي هريرةرضي الله عنه

(١٩٠) بڕوانە (مەکتوباتی کاک ئەحمەدی شێخ -ڕەحمەتی خوای لێ بێ-) مەلا عبدالکریمی مدرس وەریگێڕاوەتە سەر کوردی. بەرگی سێهەم، لاپەڕە ٣٢٩، لەگەڵ دەست لێدان.

# تاوانی نۆزدەهەم

## خواردنەوەی مەی (شرب الخمر)

خوا دەفەرمووێت: ((**يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ**))[191] واتە: ئەی ئەوانەی خاوەن باوەڕن، مەی خواردنەوەو قومار و بت پەرستی و تیر گرەوکردن کردەوە و کارێکی پیسن و لە کردەوەی شەیتانن، خۆتان بپارێزن و دووربگرن، تاکو خوا سەرتان بخات و ڕزگارتان بکات.

پاشان دەفەرمووێت: ((**إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمْ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنْ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنتَهُونَ**))[192] واتە: شەیتان دەیەوێت ڕکەبەری و دژایەتی بخاتە نێوانتانەوە بەهۆی سەرخۆشی و قومارەوە، وە لە یادیی خوا دوورتان بخاتەوە، ئیتر بەسە، دەست هەڵگرن لەم کردەوانە.

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**اجتنبوا الخمر فإنها مفتاح كلّ شر**))[193] واتە: دووربکەونەوە لە مەی خواردنەوە، چونکە کلیلی هەموو خراپە و ئاژاوەیەکە.

پێویستە ئێمە گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر بکەین و لە فەرمانیان دەرنەچین، ئەگینا زیان بەخش دەبین لە هەردوو دنیادا.

---

(١٩١) سورە مائدە ئايەتی ٩٠

(١٩٢) ديسان سورەی المائدە ئايەتی ٩١. قال الإمام الرازي في تفسيره واعلم ان هذه الآية دالّة على تحريم شرب الخمر. واتە: ئیمامی ڕازی (خوا لێی رازی بێت) ئەفەرمووێت: پێویستە بزانن ئەم ئايەتە (دەلالەت) ئەکا لەسەر قەدەغەکردنی خواردنەوەی (مەی).. بڕوانە تەفسیری ئیمامی ڕازی، بەرگی ١٢ لاپەڕە ٨١

(١٩٣) رواه الحاكم والبيهقي عن عبدالله بن عباس رضي الله عنه

له فەرموودەیەکی تر پێغەمبەرﷺ دەفـەرموویٚت: ((**مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلَا يَقْعُدْ عَلَى مَائِدَةٍ يُشْرَبُ عَلَيْهَا الْخَمْرُ**))[194] واتە: هەرکەسێک باوەڕی بـە خوا و بەڕۆژی دوایی هەیە، با لەسەر مێزی (مەی) خواردنەوە دانەنیشێت.

له فەرموودەیەکی تریش دەفەرموویٚت: ((**من شرب حسوةً من خمر لم يقبـل الله منه ثلاثة أيام صرفاً ولا عدلاً (فرضا ولا نفلا) ومن شرب كأساً لم يقبـل الله صـلاته أربعين صباحاً**))[195] واتە: هەرکەسێک قومێک مەی بخواتـەوە، خێـر و چـاکەی سێ ڕۆژی لەسەر یەک لێ وەرنـا گیرێ (چ واجـب چ سـونەت)، هەرکەسـێک یەک (بەرداغ) عەرەق واتە مەی بخواتـەوە، چـل ڕۆژ نوێـژ و خواپەرسـتی لـێ وەرنا گیرێ، مەگەر پەشیمان ببێتەوە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفـەرموویٚت: ((**ومدمن الخمر حقاً على الله أن يُسقيه نهر الخبال. قيل: يا رسول اللهﷺ، وما نهر الخبال؟ قال: صديد أهـل النـار**))[196] واتـە: کەسێک لەسەر مەی خواردنەوە بەردەوام بێت، ڕەوایە (حەقە) لەسەر خـوا کـە لە ڕووباری (خبال) تێری بکات. فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ، ڕووبـاری (خبال) چي‌یە؟ فەرمووی: کێم و خوێناوی خەڵکی دۆزەخە.

پێویستە لەسەر هەموو کەسێک کە گوێی لەم فەرموودانـەی پێغەمبـەرﷺ بێت و واز بهێنـێ لـەو کـردەوە ناشـیرین و ناپەسـەند و خراپانـە. وە پێویسـتە هاوڕێیەتی ئەو کەسانەش نەکەین کە بە دڵنیـایی دەزانـین (مـەی خـۆڕن) و بەردەوامن لەسەر ئەم کردەوە پیسە نابەجێیە.

هەروەها لە فەرموودەیەک ناوی ئەم کارە پیسە ناونراوە بە (**أم الخبائث**) واتـە دایکی خراپترین پیسە.

---

(١٩٤) رواه الطبراني

(١٩٥) رواه الطبراني ايضاً.

(١٩٦) رواه الطبراني ايضاً

ئیمامی عەلی (خوا لێی رازی بێت) دەڵێت: (**لو وقعت قطرة من خمر في بئر فبنيت مكانها منارة لم أوذن عليها**)[١٩٧] واتە: ئەگەر یەک دڵۆپ مەی بکەوێتە ناو بیرێک و لە شوێنەکەی منارەیەک دروست بکرێت، من بانگ لەسەر ئەو منارەیە نادەم.

لە فەرموودەیەکی تردا ئیمام عەلی (خوا لێی رازی بێت) دەڵێت: (**ولو وقعت في بحر ثم جفّ ونبت فيه الكلأ لم أرعه**) واتە: ئەگەر تنۆکێ لەو مەیيە بکەوێتە ناو دەریایەک، دەریاکەش وشک بێت و گیاو گوڵی لێ بروێت، من گیاو گوڵی ئەم شوێنە ناخۆم و خزمەتیشی ناکەم.

(عەبدوڵای کوڕی عومەر) (خوا لێی رازی بێت) دەیفەرموو: (**لو أدخلت أصبعي فيه لم تتبعني، أي لقطعتها**) واتە: ئەگەر پەنجەیەکم بکەوێتە ناو عەرەقەوە، نابێ ئەو پەنجەیە لەگەڵ مندا بێت هاوڕێیەتی ناکەم و دەی بڕمەوە.

**ئاگادارییەك:**

هەروەها پێغەمبەری نازدارمانﷺ دەفەرموێت: ((**يشرب ناسٌ من أمتي الخمر، يُسمّونها بغير اسمها**(١٩٨) **يُضرب على رؤوسهم بالمعازف** (آلات الملاهي) **والقينات** (أي المغنيات) **يخسف بهم الأرض ويجعل منهم قردة والخنازير**))[١٩٩] واتە: لە ئۆمەتی من هەندێ کەس مەی دەخۆنەوە و ناوی مەی دەگۆڕن بە ناوێکی تر (وەک بیرە) بەسەرسەریانەوە مۆسیقای ڕابواردن لێدەدرێ و، چەند ئافرەتێکی گۆرانيبێژ ئاوازیان بۆ دەڵێن لەبەر ئەوە دوور نيیە خوا نوقمی ژێر زەويیان

---

(١٩٧) ئەم فەرموودانە تا دوایی سودم وەرگرتووە لە پەرتووکی (ارشاد العباد إلى سبيل الرشاد) دانراوی (زين العابدين عبدالعزيز المليباری) لاپەڕە ١٤٠، وە (زواجر)ە شێخ ابن حجر.

(١٩٨) وابزانم ئەمەش (موعجیزەیەکی) حەزرەتەﷺ، کە ئەمەی فەرمووە، کە ئێستا بە چەند (نوع) واتە جۆر ناویان لە (عەرەق) ناوە وەك بیرە و (ویسکی و) شمپانیا و کۆنیاك و ڤۆدکا و ڕوم..هتد. بڕوانە پەرتووکی (الخطايا في نظر الإسلام) تأليف عفيف عبدالفتاح الطبارة، لاپەڕە ١٠٦.

(١٩٩) رواه ابن ماجه وابن حبان في صحيحه.

بکات و لەناویان ببات، وە هیچ دوور نیيیە خوای گەورە ئەوانە بگۆڕێ بە مەیمون و بەراز، یاخود دڵ و دەرونیان شێوە و ئارەزووبازیان و ڕەوشتیان وەک مەیمون و بەراز لێبکات، لەبەر ئەوەی وا دەرکەوتووە کە بەراز لەبارەی ئارەزووبازيیەوە زۆر (جنسيیە).

ئایینی پێغەمبەرمان موحەمەدﷺ هەموو خواردن و خواردنەوەیەک کە مرۆڤ بێهۆش بکات قەدەغەی کردووە، ئەوەش لە جوانی ئایینی ئیسلامدایە.[٢٠٠] هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**کل مسکر خمر، وکل خمر حرام**)) واتە هەر شتێک سەرخۆشی بکات مەیەو، هەموو مەیێکیش خواردنەوەی قەدەغەیە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**کل شراب اسکر فهو حرام**))[٢٠١] واتە: هەر خواردنەوەیەک ئادەمیزاد مەست بکات، ئەوە قەدەغەیە.

لە فەرموودەیەکی تر دەفەرمووێت: ((**وما اسکر کثیره فقلیله حرام**))[٢٠٢] واتە: ئەوەی کەم و زۆر مرۆڤ سەرخۆش بکات قەدەغەیە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**لعن رسول اللهﷺ في الخمر عشرة: عاصرها، ومعتصرها، وشاربها، وحاملها، والمحمولة إليه وساقيها(بائعها)، وآكل ثمنها، والمشتري لها، والمشتري له**))[٢٠٣] واتە: پێغەمبەری خواﷺ نەفرەت لە دە کەس کردووە لەبارەی مەیەوە: ئەو کەسەی کە دروستی دەکا و، ئەیگوشێت و، ئەوەی دەيخواتەوەو، یارمەتیان دەدات و، ئەو کەسەی هەڵی دەگرێ و بۆیان دەبات و، ئەوەی دەرخواردیان دەدا و، ئەو کەسەی دەيفرۆشێ و، ئەو

---

(٢٠٠) بڕوانە کتاب (روح الدين الإسلامي) عفيف طبارة

(٢٠١) رواه البخاري ومسلم.

(٢٠٢) رواه ابوداود والترمذي وابن ماجه

(٢٠٣) رواه ابن ماجة والترمذي عن ابن عباس بن مالكؓ

کەسەی نرخەکەی دەخوا و، ئەو کەسەی دەیکڕێ و، ئەو کەسە کە بۆی دەکڕێ.

**سەرنجێك:**

هەندێک لە نەزان و (دواکەوتوەکان) دەڵێن بیرە و مەی دەرمانە بۆ نەخۆشی گورچیلە، بەڵام ئیسلام ئەو شتە بە ناڕاست و هەڵە دەزانێ و هەموو سەرخۆشێکی مەی بە نەخۆشی و ئێش و ئازار داناوە. پێغەمبەرﷺ دەفەرموویت کە پرسیاریان لێی کرد ووتیان ئایا مەی بۆ دەرمان دەبێ یان نا؟ ئەویش فەرمووی: ((إنه داء وليست بالدّواء))[٢٠٤] واتە دەردە و دەرمان نیيە.

پێویستە بزانین مەی با بەئەندازەی یەک دڵۆپ بێ، خواردنەوەی قەدەغەیە و لە تاوانە مەزنەکان دەژمێردرێت، کەسێکیش بڵێت مەی خواردنەوە دروستە، ئەوا پێی کافر دەبێت، سزای مەی خۆریش چل دارە، دروستیشە بگاتە هەشتا دار، بە مەرجێک پێشەوای موسڵمانان، فەرمان بکات، چونکە بە وجهێکی تعزیر دادەنرێت.

---

(٢٠٤) رواه مسلم وابوداود والترمذي

# تاوانی بیستەم

## قومار کردن (القمار)

خوا دەفـەرموویٚت: ((يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ... إلى قولى تعالى فَهَلْ أَنْـتُمْ مُنتَهُـونَ))[205] واتـە: ئـەی ئەوانەی خاوەن باوەڕن، قومارکردن ڕەفتارێکی پیسە و کار و پیشەی شەیتانە..

بەم جۆرە هەموو شێوەیەکی (قومار) قەدەغەیـە وەک (کاغـەز و شـەترەنج و دامـەکردن و سێڕسـکانێ و نۆڕێسـکانی و دۆمینـە و کلاّوانـێ و فنجـانێن و گیزانێ و هێلکانێ و...هتد)، ئەگـەر هـاتوو ئـەو جـۆرە یاریيانـە لەسـەر پـارە بکرێت قەدەغەیە لە ئیسلامدا، بەلاّم ئەگەر لەسەر پارە نەکرێت ئـەوە قەدەغـە نيیە بە مەرجێک کات و ئەرکی ئاینیت بەفیڕۆ نەبات.

هـۆی قەدەغـەکردنی ئـەم جـۆرە یاريیـەش ئەوەیـە هـەروەک خـوا دەفەرموویٚت: ((وَلاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ))[206] واتە: ماڵی یەکتر مـەخۆن لەناو یەکدا بە ستەم و ناڕەوایی و گەزاف.

شێخ (موحەمەدی خاڵ)یش لە تەفسـیرێکا دەڵێـت: قومـار زیـانی یـەکجار زۆرە: یەکەم ئەوەیە کـە دوژمنایـەتی دروسـت دەکـات و، دووەم مـرۆڤ دوور دەخاتەوە لە نوێژ و خواپەرستی و، سێیەم مرۆڤ فێری تەمبەڵێ و تەوەزەلی و درۆ دەکـات و هەمیشـە چـاوەڕوانی یاریـەک دەکـات کـە لـەلای لابـەلاوە یاريیەکی بۆی بڕەخسێ و شتێک بباتەوە، ئـەو جـۆرە کەسـانەی کـە فێـری

---

(٢٠٥) دیسان سورەی المائده ئایەتی ٩١. قال الإمام الرازي في تفسيره واعلم ان هذه الآية دالّة على تحريم شرب الخمر. واتە: ئیمامی ڕازی (خوا لێی رازی بێت) ئەفەرموێت: پێویستە بزانن ئەم ئایەتە (دەلالەت) ئەکا لەسەر قەدەغەکردنی خواردنەوەی (مەی).. بڕوانە تەفسیری ئیمامی ڕازی، بەرگی ١٢ لاپەڕە ٨١

(٢٠٦) سورەتی البقره ئایەتی ١٨٨

قومار بوون، ئیتر کار و کاسبیان پێ ناکرێ لە کشت و کاڵ و بازرگانی و پیشە و دەست ڕەنگینی، کە هەر ئەوانەش مایەی ئاوەدانی وولاتن، چوارەم پارەو پولی بەدەستەوە ناهێڵێ، لە جگەرەکێشانێکدا هەزاران دینار دەدۆڕێنێت. لە هەموو شت خراپتریش ئەوەیە قومارچی کە بردي‌یەوە دەیەوێ زۆرتر بباتەوە، کە دۆڕانیشی دەیەوێ تۆڵە بسێنێت.. ئیتر بەم جۆرە بەهیچ شێوەیەک ناتوانێت خۆی لەم یاري‌یە ڕزگار بکات و لە کۆتايي‌یدا خۆی دەفەوتێنێت.

**تێبینی:**

قومارکردن گوناهێکی زۆر گەورەیە، ئەگەر یەکێک بە یەکێکی تر بڵێ وەرە قومار بکەین بێ‌ئەوەی بیکات، پێویستە کەفارەت بدات، هەروەک پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**من قال لصاحبه تعال أقامرك فليتصدق**))[207] واتە: هەرکەسێک هەر بڕوادارێک بە هاوڕێیەکی خۆی بڵێ وەرە قومار بکەین، با خێرێک بکات بۆ ئەوەی ببێتە کەفارەتی ئەو گوناهە. ئەگەر تەنها بە قسەکردن و یاری کردن بڵێیت قومار بکەین.

هەروەها ئەگەر ئەم کردەوەیە بکات دەبێت گوناهی چەند گەورەبێت.

---

(٢٠٧) رواه البخاري.

## تاوانی بیست و یەکەم

### بوهتان کردن بە ئافرەتی بێتاوان (قذف المحصنات)

خوای گەورە دەفەرمووێت: ((إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاَتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ)) واتە بەڕاستی ئەو کەسانەی کە قسەو بوختان هەڵبەستن بۆ ئەو ئافرەتە موسڵمانانە، ئەوانە نەفرەتیان لێ دەکرێ لە هەردوو (دنیادا) و سزا و ئازارێکی زۆر گەورەیان بۆ هەیە، ((يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ))[208] واتە: لەو ڕۆژەدا زوبان و دەست و پێیان گەواهی دەدات لەسەریان لەبەر ئەو کردارانەی کە کردوویانە.

هەروەها لە هەمان سورەتا، لەپێش ئەم دوو ئایەتەوە دەفەرموێت: ((وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلاَ تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ)) واتە: ئەوانەی کە بوختان دەخەنە پاڵ ئەو ئافرەتانەی کە داوێن پاک و خاوەن باوەڕن و هیچ تاوانیان نییە، پاشان چوار شایەد ناهێنن، هەشتا داریان لێبدەن لەبەر ئەوە بە هیچ جۆرێک هەتا هەتایە شایەدی ئەوانە وەرنا گیرێ و، ئەوانە بە گومڕا و ڕێبزربوو دەناسرێن. ((إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ))[209] واتە: تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە پەشیمان دەبنەوە لەپاش ئەو تاوانە گەورەی کە کردوویانە و، لەگەڵ ئەوەشدا و باری خۆیان چاک دەکەن، هەر خوایە بەخشندە و بەبەزەیی.

هەروەها لە فەرموودەی حەوت تاوانە مەزنەکەدا پێغەمبەرﷺ لە یەکێک لە تاوانەکان باسی ئەو گوناهەی کردووە کە دەفەرمووێت: ((وقذف المحصنات

---

(٢٠٨) سورەی النور ئایەتی ٢٥

(٢٠٩) سورەتی النور ئایەتی ٦

**الغافلات المؤمنات))**[210] واتە: ئەوەی خراپە و داوێن پیسی بخاتە پاڵ ئەو ئافرەتە موسڵمانەی کە بێئاگا و بێتاوانە.

هەروەها شێخ (ئیبنو حەجەر) بەزەیی خوای بیا بێتەوە، لە پەڕاوی (**الزواجر**)دا دەفەرموویت: زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە ئەو (**رمی**)یەی خوا باسی کردووە مەبەستی خستنە پاڵی ووشەی (داوێن پیسی)یە، وەک جنێودان بە ئافرەتی بێتاوان و بێئاگا، وەک وتنی ووشەی (داوێن پیس) یان بڵێت لە پشتەوە خراپیان کردووی، یا ووشەی نالەبار بڵێت وەک (قەحپە) یا بڵێت (قەحپەی کچی قەحپەی).. ئەم وشانە هەمووی ووتەی (قـژف) دەگرێتەوە، یاخود بە پێچەوانەوە ئافرەتەکە جنێو بە پیاوەکەی بدات، ئنجا بە هەرجۆرێک بێت.

**تێبینی:**

هەروەها ئەم تاوانە زللەش لە ڕیز و جوملەی تاوانە گەورەکان ژماردراوە، چونکە بەڕاستی بوهتان کردن بە ئافرەتی بێتاوان لە تاوانە گەورەکان دەژمێردرێت و، بە تاوانە (هیلاک) دەرەکان ناودەنرێت، هەروەکو حەزرەت ﷺ لەپێشەوە لە فەرموودەکە بەیانی کرد.

هەروەها شێخ ئیبنو حەجەر لە زواجردا دەڵێت: (**إن القذف حرام اجماعاً، بل هو من الكبائر المهلكة اتفاقاً**) واتە: بەڕاستی بوهتان کردن بە ئافرەتی بێتاوان و بێئاگا و داوێن پاک قەدەغەیە و بەڕای هەموو زاناکان، چونکە بێ گومان (**قذف**) واتە بوهتان کردنە بە ئینسان، واتە (نیسبەتی) زینا بەکەسێ بدا بێئەوەی (زینا)ی کردبێ و چ ژن چ پیاو، ئەمە بەڕاستی لە تاوانە (فەوتێنەرەکانە) و بە (اجماع)ی عولەما و زانایان.

---

(210) رواه البخاري ومسلم

هەروەها خاوەنی پەرتووکی (الکبائر) دانراوی (**الإمام الذهبي**) لە لاپـەڕە ١٠٥ دەڵێـت: (**وأما من قذف أم المؤمنين عائشة -رضي الله عنها-، بعد نزول براءتها مـن السماء، فهو كافر يكذب القرآن، فيقتل كفراً**)[٢١١] واتە ئەوانەی بوهتـان دەکـەن بـە دایکـی ئیمانـداران حـەزرەتی (عائیشـە) (خـوا لێـی رازی بێـت) لـەپاش هەناردنخوارەوەی قورئان و (تەبریە) کردنی (عائشـە) لـەلای خـوداوە، ئـەمانی بێباوەڕن و باوەڕیشیان نیە بە قورئان و ئەمانە پێویستە پەشیمان ببنـەوە لـەم تاوانە. (خودا پەنامان بێت لەم تاوانە گەورەیە) (**وقانا الله وإياكم شرِ السنتنا بمنّـة وكرمه إنه جواد كريم**).

(٢١١) بڕوانە پەرتووکی (الزواجر) الشيخ ابن الحجر لاپەڕە ٥٤ بەرگی دووەم.. وەیا بڕوانە پەرتووکی (ارشاد العباد إلى سبيل الرشاد) لاپەڕە ١٣٨ دانراوی زين الدين بن عبدالعزيز.

# تاوانی بیست و دووەم

## فرِوفێڵ لە ماڵی غەنیمەت

## (الغلول في الغنيمة)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفـەرموێت: ((**وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَغُلَّ وَمَنْ يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**))[٢١٢] واتە: نەبووە و نابێ بۆ پێغەمبەر، کە شتێ بەبێ شێوەی دابەشکردنی یەکسان وەربگرێ بۆ خۆی لە غەنیمەت. واتە ئەو ماڵ و سامانەی کە لە غەزادا وەچنگ دەکەوێ ئەمە دوورە لە پەروەردە و ڕەوشتی پێغەمبەری خواﷺ بەهیچ جۆرێک شتی وا ناکات، هەرکەسێ شتێ ببات بەبێ ئەوەی دابەش کرابێ بەسەریا، ئەبینی لە رۆژی دواییدا بەسەر شانیەوەیەو خۆی بە شەرمەزارییەوە دەیهێنێ بۆ مەیدانی لێپرسینەوە.

حەزرەتﷺ دەفەرموویت: ((**لا يغل مؤمن**))[٢١٣] واتە: بڕوادار فێڵ و (خیانەت) ناکات لە ماڵی غەنیمەت.

ئیمامی عومەر (خوا لێی رازی بێت) دەڵێت کە شەڕی خەیبەر بەرپابوو، هەندێک لە یارانی پێغەمبەرﷺ دەستیان کرد بە قسەکردن و دەیان ووت فلان شەهیدە فلان شەهیدە، هەتا بەلای پیاوێک تێپەڕین ووتیان فلان شەهیدە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((**كلاَّ إني رأيته في النار في بردة غلّها أو عباءة**)) واتە نەخێر من ئەو پیاوەم دیت لەناو ئاگرا بەهۆی ئەوەوە جلێکی یان (عەبایەکی) شاردبۆوە لەماڵی (غەنیمەت).

---

(٢١٢) سورەتی ال عمران ئایەتی ١٦١

(٢١٣) رواه الطبراني

پاشان حەزرەت ﷺ فەرمووی: ((**يا ابن الخطاب، إذهب فناد في النـــاس أنـــه لا يدخل الجنة إلاّ مؤمنون. قال فخرجت فناديت أنه لا يدخل الجنة إلا المؤمنـــون**))[٢١٤] واتە: ئەی كوڕی (**خطاب**) بچۆ بانگ ڕابێلە لەناو خەڵكدا كە بێجگـە لـە بـڕوادار كەسی دی ناچێتە بەهەشتەوە. ئیمامی عومەر فـەرمووی: چـووم بانگـەوازم دا لەناو خەڵكیدا و ووتم بێجگە لە بڕوادار كەسیشی ناچێتە بەهەشتەوە.

پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەكی تردا دەفـەرمووێت: ((**من جاء يوم القيامة بريئاً من ثلاث دخل الجنة، الكبر والغلول "الســـرقة في الغنـــائم" والـــدين**))[٢١٥] واتـە: هەركەسـێک لـەڕۆژی دوایيـدا بێـتن و دوور بێـت لـە سـێ شـت دەچـێتە بەهەشتەوە: فیزی و دزینیماڵێ (غەنیمـەت) و قـەرزاری، واتـە مـاڵی خـەڵک زەوت بكەی، پاشان نەیدەیەوە بەخاوەنی.

هەروەها (سومرەی كوڕی جونـدب) (خـوا لێـی رازی بێـت) دەگێڕێتـەوە ئەڵێت: چەترێكیان لەماڵی غەنیمەت بۆ حەزرەتﷺ هێنا، عەرزیان كـرد ئـەوە بۆ تۆبێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بیكە بە سێبەر بۆ ئەوەی هـەتاو كـارت لـێ نەكات. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((**أتحبون أن يستظل نبيكم بظل من نار؟**))[٢١٦] واتە: ئایا ئێوە حەز دەكەن پێغەمبـەرتان بچـێتە ژێـر سـێبەری ئـاگرەوە لـە ڕۆژی دوایيدا؟

**سەرنجێك:**

هەروەها (**غلول**) بەوە دەڵێن كە یەكێک لەوانـەی دەچـێت بـۆ غـەزاكردن، ئنجا چە سەرۆک بێت یاخود سەرباز بێت، شتێک ببات لەماڵی غەنیمەت بەبێ ئەوەی سەركردەی موسڵمانان ئامادە بێت و بیكا بـە پێـنج بەشـی یەكسـانەوە

---

(٢١٤) رواه مسلم

(٢١٥) رواه النسائي والحاكم

(٢١٦) رواه ابوداود

دابەشی بکات. ماڵیٚ غەنیمەت، ئەگەر کەمیشی لیٚ ببەیت هەر بە تاوانیٚکی مەزن دادەنریٚت، چونکە ئەم فەرموودانەی ڕابردوو هەڕەشە و گوڕەشەییٚکی زۆری تیایە بۆ ئەوانەی کە غلول واتە دزی دەکەن لە غەنیمەت و تالأنی جەنگ یا دزی دەکەن لە (بیت المال)ی موسڵمانان. هەروەها ئەم تاوانەش لەریٚز و (جوملەی) تاوانە گەورەکان ژماردراوە بە ڕای زاناکان.[٢١٧]

(٢١٧) فنسال الله التوفيق لما يحب ويرضى إنه جواد كريم.

## تاونی بیست و سآیەم

### دزی (السرقة)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفـەرموویت: ((وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْـدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِنْ اللَّهِ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ))[٢١٨] واتە: ئەوەی دزی دەکـات چ پیاو بێ یا ژن، دزیان لێ ئاشـکرا بـوو، ئنجـا چ بـەخۆیان ئاشـکرایان کـرد یـا شـایەدیان لەسـەر درا (بەمـەرجێک لـە چـارێکە دینارێـک زیـاتر بێـت)[٢١٩] دەستیان ببڕن لە جومکەی پشت پەنجەکانیانەوە. خوای گەورە دەسەڵات دارو و زاڵە و خاوەن (حیکمەتە) لەسەر کار و پیشەی خۆیدا.

هەروەها حەزرەتﷺ دەفەرموویت: ((لا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلا يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، ولكن التوبة معروضة))[٢٢٠] واتە: ئەو کەسەی داوێن پیسی دەکات لە کاتی داوێـن پیسـیەکەدا بـاوەڕی نییـە. ئـەو کەسـەی دزی دەکات لەکاتی دزیندا باوەڕی نییە. هەرکەسێ پەشیمان بێتـەوە، خـوا لێـێ وەردە گرێت.

**باسێك:**

هـەروەها بەڕاسـتی بـزانن ئـەی بـرای هێـژا و خوێنـدەوار، حـەزرەتی پێغەمبـەرﷺ چـەند داد و (عـادل) بـووە لـە جێبـەجێکردنی ئـەم یاسـا و فەرمانانەی خوای گەورە، بەهیچ جۆرێک جیاوازی نەکردووە لـەنێوان هـەژار و دەوڵەمەند و ڕەش و سپی و گەورە و بچووک دا، هەروەک دە گێڕنەوە لـەکاتی

---

(٢١٨) سورەتی المائده ئایەتی ٣٨

(٢١٩) واتە چارەکە مسقال ئاڵتوونێك

(٢٢٠) رواه البزار

پێغەمبەردا ﷺ ئافرەتێک تاوانبار کرا کە دزی کردووە، پاش ئەوەی بە تەواوی تاوانبارکرا، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دەرکرد کەوا دەستی ببڕن، لەبەر ئەوە (بنو مخزوم) ترسیان پەیداکرد لەبەر (عەیب) و ئابڕووچوونیان بە تاوانبارکردنی ئافرەتێک، کە یەکێک بوو لە ژنی گەورەکان، لەبەر ئەوە ویستیان تکا بکەن کە دەستی ئەو ژنە نەبڕن، چونکە لە ژنی یەکێک لە گەورەکانیان بوو، گەڕان نێزیکترین کەسیان لە پێغەمبەر ﷺ دۆزییەوە کە (أسامەی کوڕی زەید) بوو، بۆ ئەوەی داوای تکا بکات لە پێغەمبەر ﷺ. بەلآم پێغەمبەر ﷺ وەلآمی ئەوەبوو فەرمووی: ((**يا أسامة، أَتَشْفَعُ فِي حَدّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ؟ -وفي رواية أخرى- وأنا بين أظهركم؟**)) واتە: ئەی ئوسامەی کوڕی زەید، ئایا تکا دەکەیت لە یاسا و فەرمانێکی خوایيدا؟ کاتێک من هێشتا ماوم لەناوتاندا.

لە پاشان پێغەمبەر ﷺ خەڵکی بانگ کرد هەتا بۆیان بدوێت و ئامۆژگارییان بکات، فەرمووی: ((**أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمْ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمْ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ وَالذي نفسي بيده، لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا**))[221] واتە: ئەی خەڵکینە، بەهیلاک چوونی پێش ئێوە لەبەر ئەوەبوو، ئەگەر گەورەیەک یا خانەدانێک دزی بکردایە چاویان لێ دەپۆشی و، ئەگەر هەژارێک یان بێهێزێک دزی بکردبایە سزایان دەدا. بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر فاتیمەی کچی محمد دزی بکات دەستی دەبڕم.

هەروەها لە کتێبی (الکبائر)دا داڵێت: دەستی ژنە (مخزومیەکەیان) بڕی.[222]

---

(٢٢١) رواه البخاري ومسلم وابوداود والنسائي والترمذي

(٢٢٢) بڕوانە پەرتووکی (الكبائر) دانراوی الشمس الدين الذهبي لاپەڕە ٩٥ چاپی مصر.

**تێبینی:**

هەروەها زانایـانی ئیسـلام دەڵـێن پـاش دزی بـەهیچ جۆرێـک پەشـیمانی کەڵکی نىيـيە، بەمەرجێک ئەگەر ماڵە دزراوەکە بـۆ خاوەنەکـەی نەگێڕێتـەوە. ئەمەش دەقی یاساکەیە کـە لـە پـەرتووکی (زواجـر و کبـائر)دا دەڵێـت: (قـال العلماو: ولا تنفع السارق توبته إلاّ أن يردّ ما سـرقه)، هـەروەها لـە شـەریعەتی ئیسلامدا دەفەرمووێت: ئەگەر ئەو کەسەی دزی کرد هیچی بەدەست نـەمابوو بۆ ئەوەی خاوەن ماڵەکە لێی خۆش بێت، پێویستە گەردەنی ئازاد بکـات (**والله أعلم**) خوا زاناترە.

دیسان لە شەریعەتی (**ئیسلام**)دا ئەفەرمووێ: بزانن لە هەموو ئـەو شـوێنانەدا کە دەستی دزیان تیا نابڕێ و دزەکە (تەعزیر) دەکرێ.[٢٢٣]

هەروەها حەزرەتی عائیشە (خـوا لێـی رازی بێـت) دەڵێـت: پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: ((**تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَـــاعِدًا**))[٢٢٤] واتـە: دەسـتی دز دەبڕێ کە بایی چارەکە دیناری بدزێ یا زیاتر.

سەرنجێک:

((**عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ جرير قَالَ سَأَلْنا فَضَالَةَ بْنَ عُبَيْدٍ عَنْ تَعْلِيقِ الْيَدِ فِـي عُنُـقِ السَّارِقِ أَمِنْ السُّنَّةِ؟ قَالَ أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِسَارِقٍ فَقطِعَ يَدُهُ ثُـمَّ أَمَرَ بِهَا فَعُلِّقَـتْ فِـي عُنُقِـهِ**))[٢٢٥]واتـە: لـە (عەبـدوڕەحمانی کـوڕی جـەریر) دەگێڕێتەوە دەڵێت: پرسیارمان کرد لە (فەچالەی کوڕی عوبەید) کـە دەسـتی دز دەبڕن و لە دواییدا هەڵیدەواست بە ملیەوە، ئایا ئەوە (سـوننەتە) یـا نـا؟ ئنجا فەرمووی: دزێکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەرﷺ ئنجا لەسەر ئەمر و فـەرمانی

---

**(٢٢٣) بروانە پەرتووکی (شەریعەتی ئیسلام) بەرگی چوارەم، لاپەڕە ١٤٧ دانراوی مامۆستا عبدالكريمی مدرس**

**(٢٢٤) متفق عليه**

**(٢٢٥) رواه ابوداود**

پێغەمبەرﷺ دەستیان بڕی و لەپاشان پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا دەستە بڕاوەکە هەڵواسن بە ملیەوە بۆ ئەوەی ببێت بە پەند و (عیبرەت) بۆ خەڵک.

**الحاصل:**

هەروەها بۆمان دەرکەوت لەم فەرموودانەی پێشـوو بـە بەڵگـەی (ئایـەت) و فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ کە دزيکردن (السرقه) لە ماڵ و سامانی خەڵکیـدا و لە ڕیز و (جوملە)ی تاوانە گەورەکان ژماردراوە بە بیروڕای زاناکان.

(فنسأل الله المنان بكره وبفچله أن يغفر لناژنوبنا وكفر عنا سيئاتنا وتوفنـا مع الأبرار، إنه جواد كريم.).

# تاوانی بیست و چوارەم

## ڕێگری (قاطع الطریق)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێت: ((إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلاَفٍ أَوْ يُنفَوْا مِنْ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ)) واتە: پاداشتی ئەو کەسانە سزایەکە دوژمنایەتی و بێفەرمانی خوا دەکەن و بێ شەرمی و بێئابڕوویی لە (دنیادا) دەکەن، ئەوەش ئەگەر هەر خەڵکیان کوشتبێ و ماڵیان نەبردبێ پێویستە بکوژرێن و لەپاش کوشتن لەدار بدرێن بۆ پەند و ئامۆژگاری، ئەگەر کوشتار و دزیان کردبێ، پێویستە دەست و پێیان بە شێوەی ڕاست و چەپ ببڕێت لە جاری یەکەمدا، بەڵام ئەگەر هەر ماڵیان بردبێ و کەسیان نەکوشتبێ، دەبێت دەست و پێی چەپیان ببڕێت یاخود دەربەدەر بکرێن بەجۆرێک دامەزران و ئارامیان نەبێ لە شوێنێکدا، ئەگەر هەر ڕێبواریان ترساندبێ، ئەما کوشتن و دەربەدەسکردن و هەڵواسران و ڕیسوایی ئەوانە لە (دونیادا) وە لە پاشەڕۆژیشدا سزا و ئازارێکی زۆریان بۆ هەیە.

((إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ))[٢٢٦] واتە: تەنها ئەوانە نەبێ کە پەشیمان دەبنەوە بۆ لای خوا و لەپێش ئەوەی کە ئێوە دەستتان بڕوا بەسەریانا و بیگرن، ئێوەش دەبێ بزانن خوای گەورە پۆشندەی گوناهی ئەوانە و ڕەهبەرە بەوان، بەمەرجێک واز بێنن لە خراپەکاری.

هەروەها لە تەفسیری (نامی) دەڵێت:[٢٢٧] ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە دەرهەق بە کۆمەڵێ لە هۆزی (عکل) و (عرینە) کە هاتن بۆ مەدینەی مونەوەرە و

---

(٢٢٦) سورەتی المائدە ئایەتی ٣٤

(٢٢٧) بڕوانە تەفسیری نامی، بەرگی سێیەم، لاپەڕە ٣٩، دانراوی مامۆستا مەلا عبدالکریمی مدرس.

موسڵمان بوون، پاش ماوەیەک هەوای مەدینـەیان پێنەکـەوت. پێغەمبـەرﷺ فەرمانی کرد چەند وشترێ شیرداریان بدەنێ و کە لە دەرەوەی مەدینەدا بژین لەگەڵیانا و لە شیر و سەرتوێژی ئەو ووشترانە بخۆن و بخۆنەوە، هـەتا سـکیان دەکەوێتە ڕێ و لەو نەخۆشـیانە ڕزگـار دەبـن، ئـەوانیش چـەند ڕۆژێ چـوونە دەرەوە و لە شیر و سەرتوێژی وشترەکانیان دەخواردەوە، بەڵام ڕۆژێ لە ڕۆژان دەست و پێی شوانەکەیان بڕی و دڕکیان کـرد بـە چـاوەکانیا هـەتا مـرد، ئـەو شوانە ناوی (بسار) بوو، خەڵکی (نوبە) بوو، ئەوەیان کـرد، ووشـترەکانیان دایـە بەر بۆ وڵاتی خۆیان و هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، کە پێغەمبەرﷺ بەم کارەساتەی زانی (جەریری کـوڕی عەبـدوڵا) لەگـەڵ کۆمـەڵێ یـارانی پێغەمبـەردا (ڕەزای خوایان لێبێت) نارد بەشوێنیان. لەڕێگادا پێیان گەیشتن و بەدیلیان گـرتن و هێنایانەوە بۆ مەدینە، جا پێغەمبـەرﷺ چـاوەڕێی فـەرمانی خـوای گـەورەی دەکرد، تا ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە.

**تێبینی:**

زانایان بیروڕایەکی بە (کۆمەکیان) نیيە دەربارەی چـۆنیەتی کوشـتنەکە و هەڵواسینی، بەڵام ئیمامی شافعی (بەزەیی خوا پیابێتەوە) دەفـەرمووێت: ڕێگـر دەکوژرێ و پاشان دەشورێ و کفن دەکرێ و نوێژی مردووی لەسەر دەکرێـت و پاشان هەڵدەواسرێ لەسەر دارێکی پاندا تا سێ ڕۆژ، بۆ ئەوەی ببێت بە پەنـد و ئامۆژگاری. پاشان دەشاردرێتەوە و (دفن) دەکرێ.[٢٢٨]

هـەروەها (قاطع الطریـق) واتـە ڕێگريکـردن لـە ڕێـز و (جوملـەی) تاوانـە گەورەکان ژماردراوە بەڕای عولەما و زاناکان، جا شێخ ئیبنـو حەجـەر دەڵێـت: (مجرد) ڕێگری تاوانێکی گەورەیە و بەڵام ئەگەر خەڵکیان ترساندوبێ یـا مـاڵ و

(٢٢٨) بڕوانە کتێبی (الزواجر) دانراوی شیخ ئیبنو حەجەر ڕەحمەتی خوای لێبێ، بەرگی دووەم ل١٤٦

سامانی خەڵکیان بردبێ و بە ستەم یا خەڵکیان زامدار کردبێ و یا خەڵکیان کوشتبێ، ئنجا سەرەڕای ئەمەش نوێژ و ڕۆژووشیان لەسەردا چواندبێ، ئەمە دەبێ ئەنجام و دوارۆژی ئەمانە چۆن بێ و، تاوان لەسەر تاوان (عدە کبائر) أعاذنا الله منهم بمنّه وکرمه.

**(فنسأل الله العافية من كل بلاء ومحنة، إنه جواد كريم غفور رحيم).**

# تاوانی بیست و پێنجەم

## سوێند خواردن بەدرۆ (الیمین الغموس)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفـەرمووێت: ((إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً أُوْلَئِكَ لاَ خَلاَقَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ وَلاَ يُكَلِّمُهُمْ اللَّهُ وَلاَ يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ))[٢٢٩] واتـە: ئەوانـەی دەکـڕن و دەفرۆشـن سـوێند دەخۆن بۆ نرخێکی کەم، ئـەو کەسـانە هـیچ سـوود و قازانجێکیـان بەدەسـت ناکەوێ (لە قیامەتدا) خوای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکات و تەماشـایان ناکـات بەچاوی بەزەیی و چاکەیان لەگەڵ ناکات و پاکیان ناکاتەوە و ئازارێکی تونـد و تیژیان بۆ هەیە.

هەروەها (عەبدوڵای کوڕی مەسعوود) (خوا لیێی رازی بێت) دەڵێت: گـوێم لە پێغەمبەرﷺ بوو دەیفـەرموو: ((مَنْ حَلَفَ على مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بغير الحق لَقِــيَ اللَّهَ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ)) واتە: هەرکەسێ بەدرۆ سوێند لەسەر مـاڵی موسـڵمانێک بخوات، خودای لیێی دەرەنجێ لەکاتی پێ گەیشتنیا.. پاشان پێغەمبەرﷺ ئـەم ئایەتەی خوێنـدەوە ((إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ ..ولهم عــذاب ألــيم))[٢٣٠] تـا دوایی ئایەتەکە.

هەروەها حەزرەتﷺ لە فەرموودەیێکی تردا دەفەرمووێت: ((مَنْ اقْتَطَعَ حَــقَّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِهِ فَقَدْ أَوْجَبَ اللَّهُ لَهُ النَّارَ وَحَرَّمَ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ)) واتـە: هەرکەسـێک بەسوێندی درۆ مافی پیاوێکی موسڵمان داگیر بکات، ئەوا خوا ئاگری دۆزەخی بۆ پێویست دەکات و بەهەشتی لێ قەدەغەی دەکـات. پیاوێـک ووتـی: ئەگـەر

(٢٢٩) سورەتی ال عمران ئایەتی ٧٧

(٢٣٠) رواه الشیخان

شتێکی کەمیش بێت ئـەی پێغەمبــەری خـوا؟ فـەرمووی: ((**وَإِنْ قَضِــيبًا مِــنْ أَرَاكٍ**))[231] واتە: ئەگەر (لقە) دارێکیش بێت.

**باسێك:**

هەروەها، ئەی برای خاوەن باوەڕ، واتە بەڕاستی دەبێت تەنها سوێند بـەناوی خوداوە بخورێت یان بە سیفەتێک لـە سـیفەتەکانی ئـەوەوە، ئـەویش سـوێند خواردن وەک بڵێت سوێند بە خودا یان سوێند بەو کەسەی کـە گیـانی منـی بەدەستە..هتد. ئەم جۆرە سوێندانە دروستە لە ئاینی ئیسلامدا.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفـەرمووێت: ((**إِنَّ اللَّهَ تعالى يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، فمَنْ كَانَ حَلف فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ أَوْ لِيَصْــمُتْ**))[232] واتـە: بەڕاسـتی خـوای گـەورە سوێند خواردنی بە باوک و باپیر قەدەغـە کـردووە، ئەگـەر سـوێندتان خـوارد سوێند بە خوا بخۆن یان بێ‌دەنگ بن.

هەروەها حەزرەتﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفـەرموێت: ((**مَنْ حَلَفَ بِمِلَّــةٍ غَيْرِ الْإِسْلَامِ كَاذِبًا مُتَعَمِّدًا فَهُوَ كَمَا قَالَ**))[233] واتە هەرکەسێک سوێند بخـوات بـە میللەت بێجگە لە ئیسلام وەک بڵێت ئەگەر ئـەوە وانـەبێ (گـاور) بـم یـاخود جولەکە بم، ئەوە ئەو کەسە چ شتێکی وتبێت وایە.

هەروەها لە کتێبی شەرعدا دەڵێت ئەگەر درۆ بکات (گـاور) دەبێـت، بـەلام ئەگەر درۆ نەکات (گاور) نابێت.

---

**(٢٣١) رواه مسلم**

**(٢٣٢) متفق عليه**

**٢٣٣ رواه الشيخان**

**تێبینی:**

هەروەها سوێندی بەدرۆ قەدەغەیە و بە تاوانی مەزن دادەنرێت و بەڕای هەموو زانایان، بەڵام ئێمە ئەگەر وردبینەوە لەم فەرموودەیەی حەزرەت ﷺ، ئەمە کیفایەتە بۆ ئەم باسە، وەک دەفەرمووێت: ((**أَكْبَرِ الْكَبَائِرِ الشِّرْكُ بِاللَّهِ وَالْيَمِينُ الْغَمُوسُ**))[٢٣٤] واتە: گەورەترین تاوان هاوبەش دانانە بۆ خودا و سوێندی ماڵوێرانکەر[٢٣٥] بەدرۆ و بە (ناهەق) بخورێ. چونکە بەڕاستی ئەو کەسەی سوێندی بەدرۆ بخوات، واتە سوێندخۆرەکە لە تاوان نوقم ئەبێ یا لەناو ئاگری دۆزەخ نوقم ئەبێ.

هەروەها زۆر لە زانایان بڕیار و فتوایان پێداوە و دەفەرموون: (**اليمين الفاجرة حرام بل هي كبيرة اتفاقاً**) واتە سوێندی بەدرۆ (حەرامە) و قەدەغەیە و لە تاوانە گەورەکانە بە (اجماع)ی زانایان، چونکە لە ڕیز و (جوملەی) تاوانە گەورەکان ژماردراوە.

(**أللهم أنا نعوذ بك من منكرات الأخلاق والأعمال السيئة والنفاق ونسألك العفو العافية في الدنيا والآخرة وصلى الله على سيّدنا محمد وآله واصحابه أجمعين**).

---

(٢٣٤) رواه الطبراني

(٢٣٥) قال في كتاب (الكبائر) الغموس هي التي يتعمد الكذب فيها سميت غموساً لأنها تغمس الحالف في الإثم وقيل تغمسه في النار.

بڕوانە (کبائری ذەهەبی) ل ١١٥ و، بڕوانە کتێبی (الزواجر عن اقتراف الكبائر) دانراوی بەڕێز شێخ ابن حجر الهيتمي، بەرگی دووەم ل١٨١

# تاوانی بیست و شەشەم

## ستەم كردن (الظلم)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفـەرموویت: ((**وَلاَ تَحْسَبَنَّ اللَّهَ غَافِلاً عَمَّـا يَعْمَـلُ الظَّالِمُونَ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ الأَبْصَارُ**))[٢٣٦] واتە: بێ گومان بن كە خودا ئەوە لەیاد ناكات و بێئاگا نیە لـە كـردەوەی سـتەمكاران، بـەڵكو خـوا ئەوانـە فـەرامۆش ناكـات و دوایـان دەخـات بـۆ ئـەو ڕۆژەی كـە لەترسـان چـاویان دەردەپەڕێ و بێبینا دەبن.

لە ئایەتێكی تردا دەفەرموویت: ((**وَلاَ تَرْكَنُوا إِلَـى الَّـذِينَ ظَلَمُـوا فَتَمَسَّـكُمْ النَّارُ**))[٢٣٧] واتە: پەنا مەبەنە بـەر سـتەمكاران لەوانـەی كـە سـتەم دەكـەن بـۆ ئەوەی ئازاری ئەوان ئێوە نە گرێتەوە.

لە ئایەتێكی تردا دەفەرموویت: ((**مَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلاَ شَفِيعٍ يُطَـاعُ**))[٢٣٨] واتە: بۆ ستەمكاران لە ڕۆژی دواییدا تكاكاریان نيیە كە تكایان بـۆ بكـات لای خوا.

هەروەها خوای گەورە لە فەرموودەیەكی (**قودسیدا**) لەسەر زوبانی پێغەمبەرﷺ دەفەرموویت: ((**يَا عِبَادِي إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا فَلَا تَظَالَمُوا**))[٢٣٩] وات: ئەی بەندەكانم، من ستەم كردنم لە سەر خۆم قەدەغە كردووە و لەسەر ئێوەش قەدەغەم كردووە، ستەم مەكەن لە یەكتر.

---

(٢٣٦) سورەتی ابراهیم ئایەتی ٤٢

(٢٣٧) سورەتی هود ئایەتی ١١٣

(٢٣٨) سورەتی غافر ئایەتی ١٨

(٢٣٩) رواه مسلم والترمذي

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمووێت: ((اتَّقُوا الظُّلْمَ فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ))[240] واتە: خۆتان بپارێزن لە ستەم کردن، چونکە بەڕاستی ستەم تاریکی ڕۆژی دواییيە.

لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: ((أَتَدْرُونَ مَنْ الْمُفْلِسُ؟ قَالُوا الْمُفْلِسُ فِينَا مَنْ لا دِرْهَمَ لَهُ وَلَا مَتَاعَ. فقَالَ: إِنَّ الْمُفْلِسَ مِنْ أُمَّتِي مَنْ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِصَلَاةٍ وَصِيَامٍ وَزَكَاةٍ)) واتە: حەزرەت ﷺ بە هاوڕێیانی فەرموو: ئایا ئێوە دەزانن بێپارە و سامان یانی (مفلس) کێیە؟ فەرموویان بێپارە و سامان لەناو ئێمەدا یە کێکە کە پارە و ماڵی نەبێت. حەزرەت ﷺ لە وەڵاما فەورمووی: بێپارە و سامان لە ئومەتی من ئەو کەسەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا لەکاتی (مەحاسەبەدا) سەوابی نوێژ و ڕۆژو و زەکاتی بۆ (حیساب) دەکەن..

لە کۆتایی فەرموودەکەدا دەفەرمووێت: ((وَيَأْتِي قَدْ شَتَمَ عِرْضَ هَذَا وَقَذَفَ هَذَا وَسفكَ دمَ هَذَا وضرب هذا، فيعطى هَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ وَهَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ وَهَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ، فَإِنْ فَنِيَتْ حَسَنَاتُهُ قَبْلَ أَنْ يَقْضِيَ مَا عَلَيْهِ أُخِذَ مِنْ خَطَايَاهُمْ فَطُرِحَتْ عَلَيْهِ ثُمَّ طُرِحَ فِي النَّارِ))[241] واتە: کە تەماشای نامەی کردەوەی خراپی دەکەن، لەلایەک لە خەڵکی داوە و لەلایەکی دی جنێوی داوە و بوختانی بەوەوە کردوە و ماڵی ئەوی خواردووە و خوێنی ئەم و ئەوی بە ناڕەوا ڕشتووە، ئنجا لەم کاتەدا خێر و چاکە و پاداشی ئەو (زاڵمە) دەدرێتە (مەزلوومەکە)، ئنجا ئەگەرکردەوە باشەکانی تەواو بوو، مافی ستەم لێکراوەکانی هەر لەسەر مابوو، ئەوە تاوان و کردەوە خراپەکانی ئەو ستەم لێکراوە ئەدرێتە دەست (زاڵمە)کە لەجیاتی وان سزا و ئازارێکی توند دەدرێ و فڕێی دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخ بە ماڵ وێرانی و خەجاڵەت مەند و (موفلیس)، واتە بە دەست واڵایی دەمێنێتەوە.

---

(٢٤٠) رواه احمد والبيهقي

٢٤١ رواه مسلم

**(تێبینی)**

هــەروەها (بــرا موســڵمانە ئیمــان دارەکــان)، ئــەوا بــە بەڵگــەی ئایــەت و فەرموودەی پێغەمبەرﷺ بۆمان ڕوون بۆوە کە ســتەم کــردن قەدەغــەکراوە لــە ئاینی ئیسلامدا، چونکە ستەم کردن لــە ڕێــز و (جوملــە)ی تاوانــە گــەورەکان ژماردراوە و بەڕای هەموو زاناکان، ئنجــا ســتەم کــردن جــۆری زۆرە. هــەروەها پێویستە خۆمان دوور بگرین لــە هــەموو جۆرەکانیــەوە، بەڕاســتی ســتەم(ظلم) کردن لادانە لە ئاینی ئیسلامەتی و لادانە لــە ڕاســتی و (عەدالــە) و لادانــە لــە سنووری یاسای خوای گەورە. داواکارم لەخوای مەزن بمان پارێزێ لــەم تاوانــە زلە، (ئامین) خوایە بە میهرەبانی خۆت گیرای بکەیت.

**(حفظنا الله من شرور الظالمين وحمانا من مكايد الكافرين وأن تجعلنا من عباد الصالحين)**

# تاوانی بیست و حەفتەم

## سەرانە و باج (المكاس)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفـەرمووێت: ((إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَظْلِمُونَ النَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي الأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ أُوْلَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِـيمٌ))[٢٤٢] واتـە: ڕێگـەی لۆمـە لەسەر ئەوانەیە کە ستەم لە ئادەمیزاد دەکەن و زیادەڕۆیی دەکەن لە زەویدا بە ناڕەوا، ئەوە ئەوانە لە دوارۆژدا سزا و ئازارێکی توند دەچێژن.

هـەروەها پێغەمبـەریش ﷺ دەفـەرمووێت: ((لا يَـدْخُلُ صَـاحِبُ مَكْـسٍ الْجَنَّةَ))[٢٤٣] واتە: ئـەو کەسـەی سـەرانە و بـاج دەسـتێنێ لـە خـەڵک ناچـێتە بەهەشت.

لە فەرموودەیێکی تردا حەزرەت ﷺ دەفەرمووێت: ((تفتح أبواب السماء نصف الليل فينادي منادٍ: هل من داعٍ فيستجاب له)) واتە: دەرگـای بـەزەیی خـوا هـەی موو نیوەشەوێک دەکرێتەوە، بانگ دەکرێت کێ نزا دەکـات هـەتا لێـی گیـرا بکرێت. ((هل من سائل فيعطى، هل من مكروب فيفرج عنه)) واتـە: ئایـا ................ ئایا کێ ناخۆشی و نارەحەتی هەیە تا لەسەری لاببـەم. ((فلا يبقى مسلم يـدعو بدعوة إلا استجاب الله عز وجل له، إلاّ الزانية تسعى بفرجها أو عشاراً))[٢٤٤] واتـە: هیچ موسڵمانێک نامێنێت تکا و نزا بکات و خوا وەڵامی نەداتەوە، تەنها ئەو ژنە نەبێت کە داوێن پیسی کردووە، یا ئەو کەسـە نـەبێ کـە ١/١٠ دەسـێنێت یـا وەری دەگرێ، خوا لەوانە خۆش نابێت. (مەگەر پەشیمان ببنەوە).

---

(٢٤٢) سورەتی الشوری ئایەتی ٤٣

(٢٤٣) رواه ابوداود

(٢٤٤) رواه احمد والطبراني

**باسێك:**

هەروەها بەڕاستی مرۆڤی باج وەرگر ستەم کەر و تاوانبارە لەبەر ئەوەی یارمەتی ستەمکار دەدات بەناڕەوا ماڵی خەڵک دەخوات. هەر لەبەر ئەو هۆیەیە حەزرەتﷺ دەفەرمووێت: ((باج وەرگر ناچێتە بەهەشت))، هەروەها لە (عوسمانی کوڕی عاسەوە) (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەرﷺ بوو دەیفەرموو: (حاڵی) داود پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێ) وابوو کاتێکی وای تەرخان کردبوو (ماڵ) و منداڵەکانی خۆیی هەڵدەساندەوە بۆ خواپەرستی و دەیفەرموو: ((**يا آل داود، قوموا فصلّوا، فإن هذه الساعة يستجيب الله فيها إلا لساحر أو عشّار**))[٢٤٥] واتە: ئەی (ئالی) داوود، هەڵسن بۆ خواپەستی و نوێژکردن، چونکە خوا کاتێکی وای داناوە تکا و نزای لێ گیرا ئەبێت، مەگەر لە جادوکەر نەبێت و ئەو کەسەی لە (١/١٠) دەیەک وەردەگرێت بە ناڕەوا.

**تێبینی:**

بەڕاستی سەرانە و باج قەدەغەیە بەڕای هەموو زانایان، ئەو کەسەی ئەم کارەی پێ (حەلاڵ) بێت ئەوە پێی کافر دەبێت، یاخود بڵێت ئەوە مافی پاشایە لەلای وابێ ئەم باج دانە مافێکی شەرعیـیە. لە کتێبی (الزواجر)دا شێخ ئیبنو حەجەر دەڵێت: (**عزالدين عبدالسلام**) زانای بەناوبانگ فەرموویەتی: قەدەغەیە ئەو کەسەی نووسینەوە و بیرکاری (الحساب) بزانێت، یارمەتی ستەمکاران بدات، واتە ئیشی (باج)دان، ئەوا خوا و پێغەمبەر نەفرەتیان کردووە لەو جۆرە کەسانە.[٢٤٦]

(**فنسأل الله العفو والعافية انه جواد كريم**).

---

(٢٤٥) رواه احمد

(٢٤٦) بڕوانە کتێبی (الزواجر) دانانی الشیخ ابن حجر الهیتمی، بەرگی یەکەم ل١٨١

# تاوانی بیست و هەشتەم

## خواردنی شتی حەرام (أكل الحرام)

خـوای گـەورە لـە قورئانـدا دەفـەرموويّت: ((**وَلاَ تَـأْكُلُوا أَمْـوَالَكُمْ بَيْـنَكُمْ بِالْبَاطِلِ**))[٢٤٧] واتە: ماڵی یەکتر مەخۆن بەنێوان یەکتریدا و بەشێوەیەکی ناڕەوا.

عەبدوڵای کوڕی ئیمامی عەباس لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموویّت: بـە سوێند خواردنی درۆ ماڵی یەکتری مەخۆن و ماڵی خەڵکی بـە سـتەم و نـاڕەوا داگیر مەکەن و دەفەرموویّت: سامان و ماڵ خورادنی ناڕەوا بەدوو شێوە دەبێت، یـەکێکیان بەشـێوەی سـتەم کـردن و داگیرکـردن و (خیانـەت) و دزی و دووەمیان بەشێوەی یاری و فڕوفێڵ وەک قومارکردن و شتی تر.

هـەروەها پێغەمبـەریش ﷺ دەفـەرموویّت: ((**إن رجـالا يتخوضـون -أي يتصرفون- في مال الغير بغير الحق، فلهم النار يوم القيامة**))[٢٤٨] واتە: هەندێ کـەس ماڵ و سامانی خەڵکی دەستکاری دەکەن و (خەرجی) دەکەن بەناڕەوا و سـتەم و خۆڕایی، ئەو جۆرە کەسانە ئاگری دۆزەخ جێگایان دەبێ لـە ڕۆژی دوايي‌دا ئەگەر واز نەهێنن لەم کردەوانە.

لە ئەبوهورەیرەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ((**ذَكَرَ الـنبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلاً يُطِيلُ السَّفَرَ أَشْعَثَ أَغْبَرَ يَمُدُّ يَدَيْهِ إِلَى السَّمَاءِ يَا رَبِّ يَـا رَبِّ وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ وَغُذِيَ بِـالْحَرَامِ فَـأَنَّى يُسْـتَجَابُ لَه**))[٢٤٩] واتـە: پێغەمبـەر ﷺ باسـی پیاوێکمـان بـۆ دەکـات کـە ڕێبـوارە وەک (ڕێبواری حەج و غەزا) مووەکانی سەری گرژ بووە و ڕەنگی تۆزاوی و خـۆڵاوی

---

(٢٤٧) سورەی البقرە ئایەتی ١٨٨

(٢٤٨) رواه البخاري

(٢٤٩) رواه مسلم

بووە، هەردوو دەستەکانی بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان و دەڵێت: پەروەردگارم پەروەردگارم.. لەگەڵ ئەوەشدا خواردنەکەی حەرامە و خواردنەوەکەی (حەرامە) و جل و بەرگەکەی (حەرامە) و بە (حەرامی) بەخێو کراوە. باشە ئەوانە چۆن نزا و تکایان گیرا دەبێت؟

هەروەها (ئەنەسی کوڕی مالیک) (خوا لێی رازی بێت) دەڵێت: گوتم بە حەزرەت ﷺ: ((**يا رسول الله أدع الله أن يجعلني مستجاب الدعوة. فقال صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" يا أنس، اطب كسبك تجب دعوتك، فإن الرجل ليرفع اللقمة من الحرام إلى فمه فلا يستجاب له دعوة أربعين يوماً**))[٢٥٠] واتە: ئەی پێغەمبەری خوا، نزام بۆ بکە لە خودا نزام گیرا بکات، واتە لەریزی ئەوانەدا دامینێ کە تکا و نزایان گیرا دەبێت. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەنەس، ئیش و کارێکی ڕەوا و حەلاڵ بکە، خوا نزات گیرا دەکات، بەڕاستی ئەگەر پیاوێک یەک پاروو نانی حەرام بۆ دەمی بەرز بکاتەوە، خودا هیچ تکا و نزایەکی گیرا ناکات هەتا چل ڕۆژ.

**سەرنجێك:**

هەروەها خواردنی شتی (حەرام) لە ریز و (جوملەی) تاوانە گەورەکان ژماردراوە بەڕای زاناکان، چونکە حەزرەت ﷺ لە فەرموودەیەکدا دەستنیشانی کردووە و دەفەرمووێت: ((**لا يدخل الجنة جسد غُذي بالحرام**))[٢٥١] واتە لەشێک بە خواردنی حەرام گەشەی کردبێ ناچێتە بەهەشتەوە.

ئنجا شێخ ئیبنوحەجەر لە (الزواجر)دا دەڵێت: بەگوێرەی فەرموودەی خوا و پێغەمبەر ﷺ، خواردنی حەرام لە گوناهە مەزنەکانە، جا خواردنی شتی

---

(٢٥٠) رواه الطبراني . هەروەها لە هەندێ ریوایەتا وا دەردەکەوێ ئەوەی داوای (دوعا) و نزای کردوە لە حەزرەت ﷺ سەعدی کوڕی وەقاص بووە (خوا لێی رازی بێت). بڕوانە کتێبی (الكبائر) ل١١٥.

(٢٥١) رواه الترمذي

(حــەرام) جــۆری زۆرە و زۆر شــت دەگرێتــەوە، وەک ســەرانە و خیانــەت و دزيكــردن و ســووخواردن و مــاڵی هــەتیو و شــایەدی بــەدرۆ و بوختــان و داگیرکردنی ماڵ و سامانی خەڵکی بە ستەم و بەرتیل خواردن و فێڵ کردن لە کێشە و تەرازوودا و ئەوەی جادو و (نوشتە)[252] دەکا و ئەوەی قومـار و ئـەوەی کرێی داوێن پیسی وەردەگرێ و...هتد. ئەوانە هەمووی خواردنی ماڵی خەڵکە بە ستەم دەژمێردرێت لە شەریعەتی ئیسلامدا دروست نيیە.

(فنسال الله تعالى العفو والعافية والتوفيق لما يحب ويرضى انه جواد كــريم رؤوف رحيم).

(٢٥٢) بەڵام ئەگەر نوشتەیەك بۆ ڕەزابوونی خوا بیکەی، واتە (الله) و (دوعا) و نزای چاکی لێ بنووسیەوە، ئەم دروستە نوشتەکردن بە ئایەتی قورئان، هەروەها ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێت: ((رخص رسول الله ﷺ في الرقية من العين والحُمّة والنملة)) متفق عليه. واتە: حەزرەت ﷺ ڕێگای داوین بۆ (دوعای) نوشتەکردن وەك چاوزار و دەم بەستی دووپشك و مار و مێرو و جانەوەری ژەهراوی.

# تاوانی بیست و نۆیەم

## خۆکوشتن (الانتحار)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموویت: ((**وَلاَ تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ**)) واتە: خۆتان مەکوژن، هەندێکتان با هەندێکتان نەکوژێ، چونکە لەپاش هاوبەشی بۆ خودا دانان کوشتنی مرۆڤ لە هەموو گوناهەکان نالەبارترە.. ((**إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا**)) واتە: بەڕاستی خودا بەرامبەر ئێوە بە بەزەیی و میهرەبانە، ((**وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ عُدْوَانًا وَظُلْمًا**)) واتە: هەرکەسێ کاری وابکات کە خوا قەدەغەی کردووە، دەبێتە دژایەتی و ستەم کردن لە خەڵک، ((**فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَارًا وَكَانَ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرًا**))[253] واتە: لەمەولا دەیانخەینە ناو ئاگرەوە، ئەمەش لەلای خوا ئاسانە.

هەروەها پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموویت: ((**مَنْ تَرَدَّى –أسقط نفسه– مِنْ جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهُوَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ يَتَرَدَّى فِيهِ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا**)) واتە: ئەو کەسەی بەئەنقەست خۆی لە چیایەک فڕێ دەدات بە مەبەستی خۆکوشتن، ئەو کەسە هەتاهەتایە لەناو ئاگری دۆزەخ دا هەر دەکەوێتە خوارەوە، ((**وَمَنْ شرب سُمًّا فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَسُمُّهُ فِي يَدِهِ يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا**)) واتە: هەرکەسێک ژەهر بخواتەوە و خۆی پێ بکوژێت، ئەوا ئەو کەسە لە ئاگری دۆزەخدا هەتاهەتایە دەمێنێتەوە و بەو ژەهرە سزا دەدرێ، ((**وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ فَحَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ يَتوجأُ بِهَا فِي بَطْنِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا**))[254] واتە: هەرکەسێ بە ئامێرێکی تیژ یا بە ئاسنێک خۆی بکوژێ، ئەوا

---

(٢٥٣) سورەتی النساء ئایەتی ٣٠.

(٢٥٤) رواه البخاري ومسلم

بەو ئامێرەی دەستی هەتاهەتایە لە لەشی خۆی پێ دەدات لەناو ئاگری دۆزەخدا و هەر لە دۆزەخیشدا دەمێنێتەوە.

**سەرنجێك:**

ئەی خوێندەواری هێزا و خۆشەویست، ئاگادار بە لەم فەرموودەی ڕابردوو تۆزێک پاش و پێش هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا کار لە مانای فەرموودەکە ناکات. هەروەها لە فەرموودەیەکی ڕاستەوە وەرگیراوە، هەروەک دەفەرمووێت: ((**عن الرَجُلَ الذي ألمه جراح فَاستَعْجَلَ الْمَوْتَ فَقتل بذُبَابَ سَيْفِهِ، فقال رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هو مِنْ أَهْلِ النَّارِ**))[٢٥٥] واتە: پیاوێک لە جەنگێکدا و لەسەردەمی پێغەمبەرﷺ بریندار دەبێ و (سەبرو) ئارامی نامێنێت، پەلە دەکا بۆ مردن بەنووکی شیرەکەی خۆی دەکوژێ، کە پێغەمبەرﷺ بەمەی زانی ووتی: ئەوە بۆ ناو ئاگرە.. ئەم پیاوەش ناوی (قزمان) بووە، هەروەکو لە (اصابە)ی شێخ (ابن حجر)دا[٢٥٦] وا دەفەرمووێت.

**تێبینی:**

هەروەها بێ گومان خۆکوشتن تاوانێکی زۆر گەورەیە و لەرێز و (جوملە)ی تاوانە گەورەکان ژماردراوە بەڕای هەموو زاناکان بە بەڵگەی ئایەت و فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ. ئنجا شێخ ئیبنوحەجەر لە (زواجر)دا دەفەرمووێت: ڕوون و ئاشکرایە کە خۆکوشتن لە تاوانە گەورەکانە و هیچ کەسێکم نەدیوە بەرەنگاری ببێت و بڵێت تاوانێکی گەورە نییە.[٢٥٧]

(**فنسال الله أن يُلهمنا رشدنا وأن يُعدنا من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا إنه جواد كريم غفور رحيم**).

---

(٢٥٥) رواه البخاري.

(٢٥٦) بڕوانە کتێبی (الإصابة في تميز الصحابة) دانراوی شێخ ابن حجر العسقلانی، بەرگی سێیەم، ل٣٥٢

(٢٥٧) بڕوانە (الزواجر عن اقتراف الكبائر) دانراوی شێخ ابن حجر الهیتمی، ل٩٦ ج٢

# تاوانی سی‌یەم

## درۆکردن (الكذب)

خوای گەورە لە قورئانـدا دەفـەرموویّت: ((فَنَجْعَلْ لَعْنَةَ اللَّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ))[٢٥٨] واتە: ئاگادار بن دەگیّرین نەفرەتی خودا لەسەر درۆزنان.

لە ئایەتیّکی تردا دەفـەرموویّت: ((قُتِلَ الْخَرَّاصُونَ[٢٥٩]-أي الكـاذبون)) واتـە: خودا بیانکوژیّ یا بکوژریّن ئەو درۆزنانە.

لە ئایەتیّکی تردا خوای گەورە دەفەرموویّت: ((إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ))[٢٦٠] واتە: بەڕاستی خـودا ڕیّگـای ڕاسـت بـە ئـادەمیزادی زۆر درۆزون نیشان نادات.

هەروەها پیّغەمبەریشﷺ دەفەرموویّت: ((عَلَيْكُمْ بالصِّدْق فَإِنَّ الصِّدْقَ يَهْـدِي إِلَى الْبِرِّ وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَصْدُقُ وَيَتَحَرَّى الصِّـدْقَ حَتَّـى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ صِدِّيقًا)) واتە: ڕاستکۆ بن و ڕاستگۆیی بە پیّویست بزانن، چـونکە ڕاست گـۆیی بـەرەو کـردەوەی باشـتان دەبـات و کـردەوەی باشـیش بـەرەو بەهەشـتتان دەبـات، ئەگـەر مـرۆڤ ڕاسـتی ووت و بـەردەوام بـوو لەسـەر ڕاستەکەی، خوا بە ڕاستگۆی دادەنیّت.. ((وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ فَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَكْذِبُ وَيَتَحَرَّى الْكَذِبَ حَتَّـى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ كَذَّابًا))[٢٦١] ئیّوە خۆتان دوور بخەنەوە لە درۆ کردن، چـونکە درۆ بەرەو کردەوەی خراپتان دەبـات، کـردەوەی خـراپیش ئـاگری دۆزەختـان بـۆ

(٢٥٨) سورەتی ال عمران ئایەتی ٦١
(٢٥٩) سورەتی الذاريات ئایەتی ١٠
(٢٦٠) سورەتی غافر ئایەتی ٢٨
(٢٦١) رواه البخاري ومسلم عن ابن مسعود رضي الله عنه

مسۆگەر دەکات، ئەگەر مرۆڤ درۆی کرد و بەردەوام بوو لەسەر درۆکەی، ئەوا بێ گومان خودا بە درۆزنی دادەنێت.

هەروەها حەزرەت ﷺ لە فەرموودەیێکی تردا دەفەرمووێت: ((**آيَـةُ الْمُنَـافِقِ ثَلَاثٌ وإذا صلى وصام وزعم أنه مسلم، إِذَا حَدَّثَ كَـذَبَ وَإِذَا وَعَـدَ أَخْلَـفَ وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ**))[٢٦٢] واتە: نیشانەی ناپاکان و دووڕوان سێ شتە، ئەگەریش نوێـژی کرد و ڕۆژووی گرت و وا گومان ئـەبا موسـڵمانە، ئەگـەر قسـەی کـرد بـەدرۆ بیکات، ئەگەر بـەڵێنێک بـدات و بیشـکێنێت، ئەگـەر راسـپاردەیان لـەلا دانـا خیانەت بکات.

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفـەرموێت: ((**إياكم والكـذب، فـإن الكذب مجانبة للإيمان**)).[٢٦٣]

واتە: ئێوە خۆتان دوور بخەنـەوە لـە درۆکـردن، چـونکە درۆکـردن لەگـەڵ باوەڕی و (ئیمان) لێک دوورن.

**تێبینی:**

درۆکردن دەردێکی زۆر گەویەرە، چونکە درۆکردن زیانی (دیـن) و دونیـای تێدایە بەڕاستی سەرچاوەی هەموو گوناهێکە، هـەر لەبـەر ئـەم هۆیانـە ئـاینی ئیسلام ئەم تاوانەی لەڕیز و (جوملـەی) تاوانـە مەزنـەکان دانـاوە بـە بیـروڕای گەلێک لە زانایان، هەروەها ئەوەندە بەسە بۆ ئینسانی درۆزن کە خوای گـەورە لـە قورئـانی پیـرۆزدا نـەفرەت و لەعنـەتی کـردووە لـە ئینسـانی درۆزن و حەزرەتیش ﷺ مرۆڤی درۆزنی بە نیشانەی (منافق) داناوە.

**(جنبنا الله من الكذب والكذابين وحشرنا الله في زمرة الصديقين وأوليائه المقـربين الذين لا خوف عليهم ولا هم يحزنون) امين.**

---

(٢٦٢) رواه البخاري ومسلم

(٢٦٣) رواه احمد

# تاوانی سی و یەکەم

## دادوەری خەراپ (القاضي السوء)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموویێت: ((وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْكَافِرُونَ))[٢٦٤] واتە: هەرکەسێک حوکم بەوە نەکات کە خوا ناردوویەتی و ڕەوانەی کردووە، ئەوە بێگومان لە ڕیزی بێباوەڕانە، چونکە ئەوان کەسان بە کردەوەی نابار و بیروباوەڕی خۆیان ڕازین.

هەروەها لە هەمان سورەتا دەفەرموویێت: ((وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الظَّالِمُونَ))[٢٦٥] واتە: هەرکەسێک حوکم نەکا بەوەی خوا ڕەوانەی کردووەتە خوارەوە، ئەمیش چی‌یە کە قورئانە بێگومان، ئەمانە لە ستەمکاران دەژمێردرێن.

هەروەها لە ئایەتێکی تردا لە هەمان سورەتدا دەفەرموویێت: ((وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْفَاسِقُونَ))[٢٦٦] واتە: هەرکەسێک حوکم نەکا بەوەی کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە، ئەوە بە (فاسقێکی) تۆخ ئەناسرێن، واتە بە کەسانێ کە دەرچوونە لە فەرمانی خوای گەورە.

((عن طلعة بن عبداللهﷺ عن النبي صلى الله عليه وسلم، أنه قال: لا يقبل الله صلاة امام حكم بغير ما أنزل الله))[٢٦٧] واتە: دەگێڕێتەوە (تەلحەی کوڕی عوبیدوڵا) (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوەﷺ دەفەرموویێت: خوای

(٢٦٤) سورەتی المائده ئایەتی ٤٤

(٢٦٥) سورەتی المائده ئایەتی ٤٥

(٢٦٦) سورەتی المائده ئایەتی ٤٧

(٢٦٧) رواه الحاكم

گەورە نوێژی (ئیمامێک) کە (حوکم) بکات بە (غیر) نـازل کـراوی خـوا گیـرا ناکات.

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا ئیبنو بورەیدە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە (خوا لێی رازی بێت) ئەویش لە حەزرەتەوەﷺ کە دەفەرمووێت: ((**القضـــاة ثلاثـــة، واحد في الجنة وأثنان في النار. فأما الذي في الجنة فرجل عرف الحق فقضى به ورجـــل عرف الحق فجار في الحكم فهو في النار ورجل قضى للناس على جهل فهو في النار – وفي رواية– قالوا فما ذنب الذي يجهل؟ قال: ذنبه أن لا يكون قاضياً حتى يعلم**))[٢٦٨]. واتــە: ســێ جــۆرە قــازیی هەیــە، یــەکێک لەمانــە بەهەشــتي‌یە و دوانــیش (جەهەنەمین) واتە دۆزەخین. یەکەمیان کـە بەهەشـتي‌یە و مرۆڤێکـی دانـا و زانایە و هەق پەرستە و شارەزای ئاینی‌یە ڕاستی بەکار ئـەهێنێ بـۆ کاروبـاری موسڵمانان بە هەق و ڕاستی (حـوکم) دەکـات، دوانەکـەی تـریش یـەکێکیان مرۆڤێکە شارەزای ڕاستي‌یە بـەڵام لـە ڕاسـتی لادەدات و فرمـانی پێ‌ناکـات و بەگوێی هەواو ئارەزووی خۆی دەکات و جیاوازی ئەخاتە نێوان موسڵمانانەوە، ئەمەش دۆزەخي‌یە، ئەوەی تریشیان مرۆڤێکە بـە نـەزانی و نـەفامی (حـوکم) دەکات، هەق و مافی موسـڵمانان ئەفـەوتێنێ. ئـەمیش هـەر دۆزەخي‌یـە.. لـە گێڕانەوەیێکی تردا (عەرزی) پێغەمبەریان کرد بۆ ئەمە تـاوانی چـي‌یە ئـەوەی حوکم دەکات بە نەزانی؟ حەزرەت لـە وەڵامـدا فـەرمووی: تـاوانی ئـەو کەسـە ئەمەیە پێویستە نەبێت بە قازی تا باش شارەزا نەبێت.

((**عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ طَلَبَ قَضَاءَ الْمُسْلِمِينَ حَتَّى يَنَالَهُ ثُمَّ غَلَبَ عَدْلُهُ جَوْرَهُ فَلَهُ الْجَنَّةُ وَمَنْ غَلَبَ جَــوْرُهُ عَدْلَــهُ فَلَــهُ النَّارُ**))[٢٦٩] واتــە: لـە ئـەبوهورەیرەوە ڕەزای خـوای لێبێـت، دەگێڕێتـەوە لـە

---

**(٢٦٨) رواه ابوداود والترمذي .. بڕوانە (الكبائر) ل١٢٥ چاپی مصر، دانراوی (الإمام الحافظ محمد بن احمد عثمان الذهبي).**

**(٢٦٩) رواه ابوداود**

پێغەمبەرەوەﷺ دەفەرمووێت: هەر کەسێک تێبکۆشێ و هەوڵ بدات بۆ ئـەوەی ببێتە قازی موسڵمانان بەو مەرجەی کە داد و ڕاستی زاڵ ببـێ بەسـەر جـەو و (**ظلم**) یا واتە ستەمیا، ئەوا خوا بەهەشـتی ئـەداتێ و هـەر کەسـێکیش ئەگـەر ستەم و جەوری زاڵ ببێت بەسـەر داد و ڕاسـتيدا ئـەوا ئەخرێتـە نـاو ئـاگری دۆزەخەوە. (خوا پەنامان بێت بە گەورەیی خۆی) ئامین.

**ئاگاداریێك:**

ئەم تاوانەش لەڕێز و(جوملەی) تاوانە گەورەکان ژماردراوە بـەڕای زاناکـان، چونکە هەر دادوەر و قـازی کـە بەپێچـەوانەی شـەرعەوە (حـوکم) بکـا و ئـەم (ئایەت) و فەرموودانـە ئەیگرێتـەوە، هـەروەها ڕۆن و ئاشـکرایە خـوای گـەورە لەگەڵ (قاچی) واتە دادوەر دایە ئەو دادوەری بە داد و یەکسانی بـە کارەکـەی هەڵسێ و ستەم نەکات. بەڵام ئەگەر لاي‌ـدا لەڕاسـتی و عەدالـەت و دەسـتی دایە جیاوازی بینی موسڵمانان ئەوا خوای گەورە دەستی لـێ بەرئـەدا و رووی لێ وەرئەگێڕێ و شـەیتانیش باوەشـی بـۆ ئەکاتـەوە. هـەروەک پێغەمبـەرﷺ دەست نیشانی کردوە بە فەرموودەیێک لە فەرموودەکانی خۆی و دەفەرمووێت: ((**إِنَّ اللَّهَ مَعَ الْقَاضِي مَا لَمْ يَجُرْ فَإِذَا جَارَ تَخَلَّى عَنْهُ وَلَزِمَـهُ الشَّـيْطَانُ**))[٢٧٠] واتـە: بەڕاستی خوای گەورە لەگـەڵ دادوەردایـە هـەتا دوور بێـت لـە بێشـەرعی و ناڕەوایی، بەڵام ئەگەر دەستی کرد بە ناڕەوایی کردن، ئنجا خوا دەست بـەردار ئەبێ لێی و شەیتان باوەشی بۆ ئەگرێتەوە.

**(فنسال الله العفو العافية والتوفيق لما يحب ويرضى إنه جواد كريم)**

---

**(٢٧٠) رواه الترمذي وابن ماجه**

# تاوانی سی و دووەم

## بەرتیل وەرگرتن (أخذ الرشوة)

خوای گەورە دەفەرمووێت: ((**وَلاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ وَتُدْلُوا بِهَا إِلَى الْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا فَرِيقًا مِنْ أَمْوَالِ النَّاسِ بِالْإِثْمِ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ**))(٢٧١) واتە: ماڵی یەكتری مەخۆن لەناو خۆتانا بە ناڕەوا و بەبەرتیلی بدەن بە فەرمان داران بۆ ئەوەی بەشێك لە ماڵی خەڵك بخۆن بە گوناه و ئێوەش ئەزانن.

لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕنەوە و دەڵێت: حەزرەتﷺ فەرموویەتی: ((**لعن الله الراشي والمرتشي في الحكم**))(٢٧٢) واتە: پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: خوای گەورە نەفرینی كردووە لەو جۆرە كەسانە كە (بەرتیل) دەدەن و وەردەگرن لە دادگا و دەوائیردا بە ناڕەوا . (**قال العلماء فالراشي هو الذي يعطي الرشوة والمرتشي هو الذي يأخذ الرشوة**) واتە زانایان فەرموویانە (ڕاشی) ئەوەیە كە بەرتیلەكە وە یا دیاريیەكە دەبات و (مرتشی) ئەوەیە كە وەری ئەگرێ.

لە فەرموودەیەكی تردا حەزرەتﷺ دەفەرمووێت: ((**إن لعنة الله على الراشي أيضا وهو الساعي بينهما**))(٢٧٣) واتە لەو كەسەش نەفرەتی كردووە كە ڕابەريی بەرتیل دەكات لەناوەنیانا و دەكەوێتە ناوەندیان بۆ ڕێكخستنیان.

باسێك:

((**عن أبي أمامة الباهلي ﷺ قال: قار رسول الله صلى الله عليه وسلم: من شفع لرجل شفاعة فأهدى له عليها هدية، فقد أتى بابا كبيراً من أبواب الرّبا**))(٢٧٤)

---

(٢٧١) سورەی البقرە ئایەتی ١٨٨

(٢٧٢) رواه الترمذي والحاكم وابن حبان في صحيحه

(٢٧٣) اخرجه ابوداود والترمذي واحمد وقال حسن صحيح.

دەگێڕنــەوە لــە ئــەبو ئومامــەی باهلیــەوە (ڕەزای خــوای لێبێــت) ئــەڵێت: پێغەمبەرﷺ دەفەرموویت: هەرکەسێ تکا بکات بۆ مرۆڤێک بە تکـایێکی وا بـە بەرتیل دیاری بۆ کاربەدەست ببات و هەق بکات بـە ناهـەق، بەڕاسـتی ئەمـە هەڵساوە بە تاوانێکی مەزن و دەرگاییێکی کردوەتـەوە لـە دەرگاکـانی (ســوو). (خوای گەورە پەنامان بێت).

**سەرنجێك:**

هەروەها بەڕاستی بێ گومان بەرتیل دەر و بەرتیل خۆر تاوانبار ئەبن، **ئە گـەر** دەست لەم کارە ناپەسندە هەڵ نەگرن و پەشیمان نەبنەوە، بەبەر نەفرینی **خوا** و پێغەمبەر ﷺ دەکەون. چونکە لەڕێز و جوملـەی تاوانـە گەورەکانـە بـەرتیل وەرگرتن و بـەرتیل دان بـە ڕای زاناکـان. هـەروەها بـەرتیل دان قەدەغەیـە و حەرامە بۆ ئەو کەسەی کە هەق بکا بەناهەق یا ناهەق بکا بە هـەق، ئنجـا بـەم شێوەیە (حەرامە) دیاری و بەرتیل بۆ هەرسێکیان (ڕاسی) واتە کـە بەرتیلەکـە دەبا و (مرتشی) واتە وەری دەگرێت و (ساعی) واتە هاتووچۆ دەکات لە بەینیانا بـۆ ڕێکخســتنیان، چـونکە نەفرینەکـەی حـەزرەتﷺ بەتونـدی هەرسـێکیان ئەگرێتەوە (خوا پەنامان بێت).

هەروەها دیاری و بەرتیل بۆ قازی و حاکم واتە دادگـەر بـە هـیچ جۆرێـک دروست نیە، چونکە پێشەوای (**الذهبي**) دەفـەرمووێ: (**أمــا الحــاكم والقاضــي فالرشوة عليه حرام**). بەڵام ئەگەر مەبەس لە دیاری و بـەرتیل دەر ئـەوەبێ کـە بگا بە حەق و مافی خۆی وەیا لابردنی ستەمێک، ئەمە لای هەندێ زانایان بە بەر نەفرینەکەی حەزرەت ﷺ ناکەوێ.[٢٧٥]

**(فنسال الله العفو والعافية من كل بلاء ومكروه)**

---

**(٢٧٤) رواه ابوداود.**

**(٢٧٥) بڕوانە کتێبی (الکبائر) لاپەڕە ١٤٩ دانراوی پێشەوای بەڕێز (الذهبي)**

# تاوانی سی و سآیەم

## ئەو ژنانەی وێنەی خۆیان وەك پیاوان لێ دەكەن
## و ئەو پیاوانەی وێنەی خۆیان وەك ژنان لێ دەكەن

(تشبه النساء بالرجال وتشبه الرجال بالنساء)

هەروەها ئیمامی بوخاری (خوا لێی رازی بێت) دەگێڕێتەوە لە (**صحیحا**) وەک دەفەرمووێت: ((**عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمُتَشَبِّهِينَ مِنْ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ وَالْمُتَشَبِّهَاتِ مِنْ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ**))(٢٧٦) لە ئینبوعەباسەوە (ڕەزای خوای لێبێت) ئەڵێت: پێغەمبەرﷺ نەفرینی کردووە لەو پیاوانەی کە خۆیان ئەکەن بە ژن، واتە جل و بەرگی ژنان لەبەر ئەکەن، یا خۆیان ئەڕازێننەوە وەک ئافرەتان لە دەنگ و وێنە، هەروەها نەفرینی کردووە لەو ژنەی کە خۆی ئەباتە سەر وێنەی پیاوانەوە.

لە فەرموودەیەکی تردا ئەبی هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: ((**لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الرَّجُلَ يَلْبَسُ لِبْسَةَ الْمَرْأَةِ وَالْمَرْأَةَ تَلْبَسُ لِبْسَةَ الرَّجُلِ**))(٢٧٧) واتە: پێغەمبەرﷺ نەفرینی کردووە لەو پیاوە کە بەرگی ژنانە لەبەر دەکا و هەروەها لەو ئافرەتەش نەفرینی کردووە کە بەرگی پیاوان لەبەر دەکات.

هەروەها حەزرەت ﷺ لە فەرموودەیێکی دڵتەزێن دەفەرمووێت: ((**صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا: قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ، وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مُمِيلَاتٌ مَائِلَاتٌ رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ، لا يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ**

---

(٢٧٦) رواه البخاري وابوداود والترمذي

(٢٧٧) رواه ابوداود والنسائي

وَلا يَجِدْنَ رِيحَهَا، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا))[٢٧٨] واته: دوو تاقم هەن (دۆزەخین) من نەمدیون هەتا ئێستاکە، چونکە فەرموودەکەی حەزرەت ﷺ وادەگەیەنێ کە لە وەختی حەزرەتا نەبوونە، لە پاشان پەیا ئەبن، ئەوەش (موعجیزەیەکی) حەزرەتی پێغەمبەرە ﷺ، کە بە چاوی خۆمان ئەبینین تاقمی یەکەمیان پیاوانێ جۆرە قەمچیەکی وایان بەدەستەوەیە وەک کلکی مانگایە و خەڵکی پێ دەکوتن، واتە پێی لێ ئەدەن. تاقمەکەی تر ئافرەتانێکن کە سەرخۆشن بە ناز و (نیعمەتی) خواوە، دوورن لە سوپاس گوزاری خوا، چونکە ڕووت و قووتن، جل و بەرگیان ناتەواوە، یان جل و بەرگی وا لەبەر دەکەن هەندە تەنک بەشێوەییێکی وا هەموو ئەندام و لەشیان دەر ئەکەوێ، ئەڕۆن بەڕێدا خۆیان بائەدەن بەلارو لەنجەوە هەنگاو هەڵئەنێن، قژ و پرچیان وا خڕ کردووەتەوە، وەک دووگی سەر پشتی ووشتر وایە، (تاس و لووسی) ئەدەن. ئەوانە ناچنە بەهەشت و بۆنیشی ناکەن، کە بۆنی بەهەشتیش چەندەها ساڵەڕێ ئەڕوات.

**تێبینی:**

ئایینی ئیسلام ڕێنادات بۆ ئافرەتان جل و بەرگی پیاوان لەبەر بکەن بەجۆرێ لاسایی پیاوان بکەنەوە بەبێ (عوزر) و بەهانە، چونکە هەندێ جل و بەرگی وا هەیە تەسک و تروسکە، بەهیچ شێوەیەک ناگونجێت پێی بپۆشێت. هەروەها بە پێچەوانەوە بۆ پیاوانیش نەهاتووە جل و بەرگی ئافرەتان بپۆشن، ئەگەر بەبێ بەڵگەی (شەرعی)یەوە بیپۆشن ئەمە وا لەقەڵەم ئەدرێن بە پیاوی ژنانی و ژنی نێرکوڕکە و نزیکە نەفرینەکەی خوا و پێغەمبەر ﷺ بیانگرێتەوە، هەروەک لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆمان دەرکەوت لەپێشەوە.

(فنسأل الله أن يقينا فتنتهن وأن يصلحهن وإيانا بمنه وكرمه آمين).

(٢٧٨) رواه مسلم

# تاوانی سی و چوارەم

## گەوادی و دەوێتی (الدیوث)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: ((**الزَّانِي لاَ يَنكِحُ إِلاَ زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لاَ يَنكِحُهَا إِلاَّ زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ**))[٢٧٩] واتە: پیاوی زیناکاری (کافر) ژنێ مارەناکا کە زیناکار نەبێ یا (مشریک) نەبێ، وە ژنی زیناکاری (کافر) مارەی ناکا پیاوێکی زیناکار یا (موشریک) نەبێ، وە حەرامە لەسەر موسوڵمان ژنی زیناکاری بەدڕەفتار مارە بکا.

عەبدوڵای کوڕی عومەر(ڕەزای خوایان لێبێ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرموێت: ((**ثلاثة لا يدخلون الجنة: العاق لوالديه والديوث ورجلة النساء**))[٢٨٠] واتە سێ کەس هەن ناچنە بەهەشتەوە: یەکیان ئەوەیە بێفەرمانی داک و باوکی بکا و دووەمیان ئەو کەسەیە کە بزانێ (زینا) دەکرێت لەگەڵ خێزانی و یا خزم و کەسیا، خۆی بێدەنگ بکات، واتە ڕازی بێت بەم کارە خراپە، سێیەمیان ژنێکە جل وبەرگی پیاوان بپۆشێت خۆی بێنێتە سەر وێنەی پیاوان.

لە فەرموودەیەکی تردا حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((**ثلاثة قد حرم الله عليهم الجنة، مدمن الخمر والعاق لوالديه والديوث الذي يقر الخبث في أهله**))[٢٨١] واتە بەڕاستی سێکەس هەن خوای گەورە بەهەشتی لێ حەرام کردوون بە

---

(٢٧٩) سورەتی النور ئایەتی ٣

ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لە (شانی) هەندێ (موهاجیری) بێ ماڵدا کە ویستیان هەندێ ژنێ بخوازن لەوانە کە (مشهور بوون) بە زیناکردن لەناو خەڵکدا و ئنجا خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە.. (بڕواتە تەفسیری نامی، بەرگی ٥ ل٣١٦ دانراوی مامۆستا مەلا عبدالکریمی مدرس).

(٢٨٠) رواه الحاكم والبزار

(٢٨١) رواه احمد والبزار

مەرجێک بەو شێوەیە بمرن، یەکێکیان ئەوەیە بەردەوام بێت لەسەر (مەی) خواردنەوە، یەکێکیان ئەوەیە دڵی دایک و باوکی ئازار بدات، یەکێکیان ئەو کەسەیە دەنگ نەکا کە داوێن پیسی ئەکرێ لە خاووخێزانی دا و سەرەڕای هەندێش بزانی. خوا پەنامان بێت.

**ئاگادارییەك:**

هەروەها هەندێ لە زانایان فەرموویانە بە (زاهیری) فەرموودەی پێغەمبەرﷺ، ئینسانی (**دەیوث**) واتە گەواد ناچێتە بەهەشتەوە، چونکە خوا لەسەر دەرگای بەهەشتی نووسیوە ئەی بەهەشت ئەتۆ حەرامی لە مرۆڤی (**دە یوث**) واتە گەواد، مرۆڤی (**دەیوث**) ئەوەیە کە بە ئیشی نالەبار و (فاحشە) بزانێ و لە ماڵێ خاووخێزانی خۆیدا و ئیشی خەراپ دەکرێ و دەنگ نەکات، چونکە بەڕاستی ئەمە لە تاوانە گەورەکان دەژمێردرێت. هەندێکی تر لە زانایان فەرموویانە (دەیوپ) بە کەسێک دەڵێن کە ڕازی بێت خەڵک بچێ بۆ لای ژنەکەی دەنگ نەکا و یا ژنی کوری (فیسق) و (فجور) بکا و با ئەو (فیسقەش) تەنها بەوەبێ کە بروا لەگەڵ پیاوان هەڵپەرکێ و شایی و زەماوەند بکا یا ماچیان بکا و ماچیان بداتێ، هەروەها بەڕاستی براکانم هەرکەسێ منداڵ و خێزانی خۆیی بەرەڵا بکا و بەشێوەی بێ(ئەخلاقی) و بێئابڕویی، بۆ ئەمە توشی (ئیشی (فاحشە) ببن و ئەمەش لە ڕیز و جوملەی تاوانە گەورەکان ژماردراوە بەڕای زاناکان.

(**اللهم وفقنا للهدى وأعصمنا من أسباب الجهل والردى وسلمنا من آفات النفوس فإنها شر العدا**).

# تاوانی سی و پێنجەم

## مارە بەجاش (المحلل والمحلل له)

عەبدوڵای کوڕی مەسعود (خوای لیٚڕازی بێت) دەگێڕێتەوە، بەڕاستی لە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**لعن الله المحلل والمحلل له**))[٢٨٢] واتە: نەفرینی خوا لەو کەسە بێ کە ژنی تەڵاقدراوی مرۆڤ مارە ئەکاتەوە بۆ ئەوەی دوای تەڵاقدانی دروست بێ شوو بکاتەوە بە مێردەکەی و نەفرینی خوا لەو کەسە بێ کە ژنی تەڵاقدراوی خۆی مارە دەکات لە یەکێک تا لەپاشا بۆ خۆی دروست بێ مارەی بکاتەوە.

هەروەها شێخ ئیبنو حەجەر (بەزەیی خوای پیابێتەوە) لە کتێبی (زەواجر)دا[٢٨٣] دەڵێت: حەزرەتﷺ فەرموویەتی لە فەرموودەیێکدا و ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە: ((ان رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: **أَلا أُخْبِرُكُمْ بِالتَّيْسِ الْمُسْتَعَارِ؟ قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: هُوَ الْمُحَلِّلُ لَعَنَ اللَّهُ الْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّلَ لَهُ**))[٢٨٤] واتە: بەڕاستی پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی بە ئەصحابان واتە یاران (ڕەزای خوایان لیٚبێت): ئایا پێتان بڵێم کە تەگەی خواستن و خوازڕاو کامەیە؟ گوتیان: بەڵێ بەفەرموو ئەی خۆشەویستی خودا. فەرمووی ئەوە (جاشە) نەفرینی خودا لەو کەسە کە جاشە و لەو پیاوەش کە تەڵاقی ژنی خۆی بە مارەجاش چاک دەکاتەوە.. هەروەها لە هەمان سەرچاوەدا ئەفەرمووێت: ((**وروى ابن المنذر وابن أبي شيبة وعبدالرزاق والأثرم عن عمر (رضي الله عنه) أنه قال: لا أوتي بمحلل ولا محلل له إلاّ رجمتها**)) واتە ڕێوایەت کراوە لە

---

(٢٨٢) رواه النسائي والترمذي

(٢٨٣) بڕوانە کتێبی (الزواجر عن اقتراف الكبائر( لاپەڕە ٢٨ بەرگی دووەم، دانراوی شێخ ابن حجر الهيثمي.

(٢٨٤) رواه ابن ماجه باسناد صحيح

ئیبنو مونز و ئیبنو ئەبوشەیبەوە وە عەبدوڕەزاقەوە لە ئەسرەمەوە کە هەرچواریان فەرموویانە و وەریان گرتووە لە حەزرەتی عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) واتە بەڕاستی فەرموویەتی هەر ژن و جاشێک ببینم فەرمان ئەدەم بە بەردەبارانیان تا مردن.. وە لە کۆتایی فەرموودەکەدا دەفەرمووێت: ((فسئل ابن عمر عن ژلک؟ فقال کلاهما زان)) واتە پرسیاریان کرد لە کوڕی ئیمامی عمر (ڕەزای خوایان لێبێ) لە ڕەواو ناڕەوایی لە ژنەمارەکراوەکە بە فرۆفێڵ و لەو کەسەی کە پێی ئەڵێن (جاش)، فەرمووی هەردووکیان وا لەناو زینادان.[285] (خوا پەنامان بێت).

سەرنجێک:

بەڕاستی ئەم جۆرە (نکاحە) واتە مارە بەجاش حەرامە و بەتاڵە بەڕای هەموو زانایان و لە ڕێز و جوملەی تاوانە گەورەکان ژمارد‌راوە، چونکە بەڕاستی حەزرەتی پێغەمبەرﷺ نەفرین و لەعنەتی کردووە لە جاشەکەش و لە ژن و مێردەکەش، هەروەها دیارە حەزرەتﷺ نەفرینێک ناکات لەسەر کارێکی شەرعی یا لەسەر گوناهێکی بچووک، بەڵکو لەعنەت و نەفرینی لەسەر گوناهێکی زۆر زل و گەورە ئەکات.

(فنسأل الله أن یوفقنا لما یرضیه ویجنبنا معاصیه انه جواد کریم غفور رحیم).

---

(285) هەروەها مامۆستای بەڕێز شێخ محمدی خاڵ لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: ئەم ئایەتانە پڕ بەدەم هاوار ئەکەنە مسڵمانان کە هیچ کەس سێجار ژنەکەی تەڵاق نەدات وە هەر ژنێك سێ جار تەڵاق درا نابێ بچێتەوە لای مێردەکە، مەگەر شوو بکات بە مێردێکی تر بە ئێجگاری و ئەو مێردە بەڕێکەوت تەڵاقی بدات یا بمرێ. بەڵام ئەگەر بێت و ژنەکەی مارەبکات لە کابرایەك هەر بۆ ئەوەی کە مارەی بێتەوە لە مێردە کۆنەکەی، ئەوە نە مارەی لەو کابرایە دێ و نە لە مێردەکەی. بەڵام داخی بەجەرگم هەندێ کەس لە گیانی ئایەتەکان و فەلسەفەی قورئانەکە نەگەیشتوون و فێڵ لە خوا ئەگەن بەم ڕەنگە ئەو ژنەی سێبەسێ تەڵاقی کەوتبێ مارەی ئەکەن لە کابرایەك کە پێی ئەڵێن جاش بۆ تاقە شەوێك، لە پاشا کە تەڵاقی داو عدەی بەسەر چوو مارەی ئەکەنەوە لە مێردە کۆنەکەی.. جارێ (یەکەم) ئەو فەلسەفەی کەسێ تەڵاقەی بۆ دانراوە لەمەدا نییە، (دووهەم) مارەکردن کە بۆ ماوەیەك بێ -کەم یان زۆر- وەك نکاحی متعە دروست نییە. (سێهەم) پێغەمبەرﷺ نەفرینی(لعنە)ی کردووە لە جاشەکەش و لە ژن و مێردەکەش.. (بڕوانە تەفسیری شێخ محمدی خاڵ، بەرگی دووهەم لاپەڕە ١٥٣)

# تاوانی سی و شەشەم

## خۆ پاك نەكردنەوە لە میز و كمێزدا

## (عدم التنزه من البول)

خوای گەورە لە قورئاندی دەفەرموویت: ((**وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ**))[٢٨٦] واتـە بـەرگ و پۆشاكەكەت پاک بكەرەوە لە هەر شتێ كە لەگەڵ بەندەیی خودادا ناگونجێ.

((**عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ** (رضي الله عنهما) **قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ بِقَبْـرَيْنِ فَقَالَ: إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ وَأَمَّا الْآخَرُ فَكَانَ لا يَسْتَبِرئ مِنْ الْبَوْلِ أو يتحرز منه.**))[٢٨٧] واتە لـە ئیبنـو عەباسـەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) دەگێڕێتەوە دەڵێت: جارێكیان پێغەمبەرﷺ تەشریفی رابوورد بەلای دوو (قەبرا) واتە دوو گۆڕا، وە فـەرمووی: خـاوەنی ئـەم دوو گـۆڕە سـزا ئەدرێن، واش نیـیـە لەبـەر تـاوانێكی گـەورە بـێ (عـەزاب) دەدرێـن. پاشـان فەرمووی (بەڵێ) یەكێكیان لەبەر ئەوە سزا دەدرێت چونكە خـۆی لـە گمێـزی خۆی نەدەپاراست و لەكاتی میزكردنا خۆی نەدەشاردەوە لەپێش چاوی خەڵك یان واتە خۆی پاک نەدەكردەوە لە گمێزەكەی و بەرگ و لەشی پیس ئـەبوون، ئەوی تریشیان دووزمانی دەكرد و قسەی لە بەینی خەڵكی دەهێنا و دەبرد بـە (وجهی) ئاژاوە و ئیفساداتەوە.

هەروەها حەزرەت دەفەرموویت: ((**استنزهوا من البول فان عامة عـذاب القـبر منه**))[٢٨٨] واتە: خۆتان لە میز و پیسییا پاک بكەنەوە، چونكە بەڕاستی زۆربـەی سزای (قەبر) پەیدا ئەبێ بەهۆی خۆ پاک نەكردنەوە لەكاتی خۆپاک كردنەوەدا.

---

(٢٨٦) سورەتی المدثر ئایەتی ٤

(٢٨٧) رواه البخاري ومسلم

(٢٨٨) رواه الدار قطني

**تێبینی:**

هەروەها هەر کەسێ خۆی لە میز و پاش میز پاک نەکاتەوە بە جل و بەرگی پیسەوە نوێژ بکات، ئەمە لە تاوانە گەورەکان لە قەڵەم دەدرێت، هەروەکو کۆمەڵێک لە پێشەوایان وایان فەرمووە.[٢٨٩]

(٢٨٩) بڕوانە الزواجر ل١٢٦ بەشی یەکەم

# تاوانی سی و حەفتەم

## ڕواڵەت و بەرچاوی (الرياء)[٢٩٠]

خوای گەورە دەفەرموێت لەبارەی ناپاکان و دووڕوانەوە: ((**يُرَاءُونَ النَّـــاسَ وَلاَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ إلاَّ قَلِيلاً**))[٢٩١] واتە بۆ ئەوە نوێژ ئەکەن کە خەڵکی چاوی لێیانـەوە بێ و بە موسوڵمانیان بژمێرن و ناوی خودا نابەن و (تەقدیسی) ناکـەن مەگـەر جاربەجار، ئەویش زۆر بەکەمی لەبەرچاوی موسوڵمانان بەڕواڵەت.

هەروەها خوا لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ((**يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُـــوا لاَ تُبْطِلُـــوا صَدَقَاتِكُمْ بِالْمَنِّ وَالأذَى كَالَّذِي يُنفِقُ مَالَـــهُ رِئَـــاءَ النَّـــاسِ**))[٢٩٢] واتـە: ئـەی ئـەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە بەتاڵ مەکەنەوە پاداشتی خێرەکانتان بـە (سـەبەب) منەت و ئەزیەت وەکو ئەو کەسە کەماڵی خۆی سـەرف ئـەکا و بـۆ (ڕیـایی) و چاوپێکەوتنی خەڵک.

لە ئایەتێکی تردا دەفـەرمووێت: ((**فَمَنْ كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحًا وَلاَ يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا**))[٢٩٣] **-أي لا يرائي بعمله-** واتە هەرکەسـێک بـەهیوای گەیشتنە بە خودا با کار و کردەوەی چاک بکات و بەهیچ جۆرێک لە پەرستندا هاوبەش بۆ خودا پەیدا نەکات، خواپەرستنەکە تەنها بۆ خودای پاک و بێگەرد بێ.

---

**(٢٩٠) خوێندەوارانی بەڕێز ئێمە لە سەرەتایی بەرگی یەکەمدا لە تاوانە گەورەکان دا باسێکمان نووسیبوو بە ناوونیشانی (جۆرێك لە هاوبەشی بچووك (الشرك الأصغر) ئەگەر ئارەزوو ئەکەیت بچۆ بیخوێنەرەوە.**

**(٢٩١) سورەتی النساء ئایەتی ١٤٢**

**(٢٩٢ ) سورەتی البقرە ئایەتی ٢٦٤**

**(٢٩٣) سورەی الكهف ئایەتی ١١٠**

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**مَنْ سَمَّعَ سَمَّعَ اللَّهُ بِهِ وَمَنْ يُرَائِي يُرَائِي اللَّهُ بِهِ**))[٢٩٤] واتە هەرکەسێ بۆ ناوبانگ و شۆرەت کردەوەی چاکی خۆی (ئەنجام) بدا، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا خودا ئابرووی ئەبا و ڕیسوای ئەکا لەناو خەڵک، وە هەرکەسێ بۆ ڕواڵەت هەر کارێ بکا لەڕۆژی دواییدا خودا شەرمەزاری ئەکا و پەردەی لەڕوو لائەبا لەناو خەڵکا و ڕواڵەتەکەی ئاشکرا ئەکا و بە چاو و گوێچکی خاوەنەکەی ئەداتەوە.

هەروەها حەزرەتﷺ دەفەرمووێت: ((**اليسر في الرياء شرك**))[٢٩٥] واتە کەمێکیش لە ڕواڵەت هاوبەش دانانە بۆ خودا.. حەزرەتﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: ((**إِذَا جَمَعَ اللَّهُ النَّاسَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لِيَوْمٍ لا رَيْبَ فِيهِ نَادَى مُنَادٍ مَنْ كَانَ أَشْرَكَ فِي عَمَلٍ عَمِلَهُ لِلَّهِ أَحَدًا فَلْيَطْلُبْ ثَوَابَهُ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ فَإِنَّ اللَّهَ أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنْ الشِّرْكِ**))[٢٩٦] واتە: لەڕۆژی دوایدا کاتێ کە خوای گەورە ئەم خەڵکە کۆدەکاتەوە بۆ لێپرسینەوە، چونکە ئەو ڕۆژە هیچ گومانی نیە و ئینجا (ئەمرو) فەرمانی خوا بەم ڕۆژە بانگ کەرێک بانگ دەکات لەناو خەڵکەکەدا: هەرکەسێ لەدنیادا کارێکی کردووە بۆ خودا و لە ڕاستیدا کەسێکی تری کردووە بە هاوبەشی لەو کارەدا، با داوای چاکە و پاداشی خۆی لە (غەیری) خودا داوا بکات، چونکە بەڕاستی خوای گەورە بێباک و بێنیازە لە هاوبەش پەیداکردندا.

تێبینی:

بەڕاستی ئەی خاوەن باوەڕان، هەر کارو کردەوەیەک بەڕواڵەتەوە بکرێت، ئەوە خوای مەزن وەری ناگرێت و لە خاوەنەکەی (قەبول) ناکات.

---

(٢٩٤) متفق عليه

(٢٩٥) رواه الحاكم

(٢٩٦) رواه الترمذي

قەتادە (بەزەیی خوای لیٚ بیٚت) دەفـەرموویٚت: ((**إذا راءى العبـــد يقـــول الله انظروا إلى عبدي كيف يســـتهزئ بي**)) واتـە: ئەگـەر بەنـدەی مـن بـە ڕواڵـەت جولاٚیەوە، خوا دەفەرموویٚت: بڕوانن بۆ بەندەی من، چۆن گاڵتە بـەمن ئـەکات. -خوا پەنامان بیٚت-.

هەروەها هاوبەشی بچووک بریتییە لە ڕواڵەت (**الرياء**)، ئەمەش جۆریٚکـە لـە هاوبەش پەیداکردن بۆ خودا (**الشرك الأصغر**)، ئەمەش تاوانیٚکی گەورەیە بەڕای هەموو زانایان و دەفەرموویٚت (**فضەیلی کوڕی عیاض**) بەزەیی خوای پیا بیٚتەوە، کەسیٚ واز بهیٚنیٚ لە کاروکردەوە لە بەرووی خەڵکا، ئەمە ڕواڵەتـە، کەسـیٚکیش کار بکا بۆ خەڵک مەبەستی بۆ خوا نەبیٚ ئەمە هاوبەشە بۆ خوا دانان.

(**فنسأل الله المعونة والإخلاص في الأعمار والأقوال والحركات والسكنات إنه جواد كريم**)

# تاوانی سی و هەشتەم

## فێربوون بۆ جیهان و بەس و شاردنەوەی زانین

## (التعلم للدنیا وكتمان العلم)

خوای گەورە دەفەرمووێت: ((إنما يخشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ))[297] واتە: ئەوانەی کە بەڕاستی زۆر لەخوا دەترسن، بەتەواوی بەندە زاناکان و (عالمەکانن).

هەروەها (موجاهید و شوعەبی) (ڕەزای خوایان لێبێت) ئەفەرموون: **(العالم من خاف الله تعالى)** واتە: زانایی بەڕاستی ئەوەیە کە لەخوای گەورە بترسێ.. (ڕەبیعی کوڕی ئەنەس) (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرمووێت: **(من لم يخش الله فليس بعالم)** واتە هەر زانایەک بیم و ترسی لەخودا نەبێ ئەمە بە زانا ناژمێردرێت.

هەروەها خوای گەورە لە قورئانەوە دەفەرمووێت: لەبارەی زانین و زانیاریيەوە کە کەتمی ئەکەن، واتە دەیشارنەوە و بە خەڵکی ڕانا گەیەنن دەفەرمووێت: **((إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنْ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِنْ بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُوْلَئِكَ يَلْعَنُهُمْ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمْ اللاَّعِنُونَ))**[298] واتە بەڕاستی ئەو زانایانە کە ئەشارنەوە ئەوەی ئێمە کە ناردوومانەتە خوارەوە لە ئایاتی ڕووناک لە ئایاتێ کە هۆی شارەزاکردنی ئادەمیزادن بۆ ڕێگەی ئایین، پاش ئەوە کە ڕۆشنمان کردۆتەوە بۆیان بە کورتی یا بە درێژە پێدانیان، ئەوانە هەموویان خوای گەولە

(٢٩٧) سورەتی الفاطر ئایەتی ٢٨

(٢٩٨) سورەتی البقرە ئایەتی ١٥٩

(لەعنەت) و نەفرینیان لێ ئەکا و هەموو ئەو کەسانەیش کە خـاوەن (**شعووری**) ئاینن.[299]

هەندێک لە موفەسیرەکان ئـەڵێن: ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوارەوە بـۆ زانایـانی (جولەکەکان)، بەڵام لە ڕاستيدا هەموو ئەو کەسانە دەگرێتـەوە کـە کـار بـەم ئایەتە ناکەن (خوای گەورە پەنامان بێت).

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموویت: ((**مَنْ تَعَلَّمَ عِلْمًا مِمَّا يُبْتَغَى بِهِ وَجْهُ اللَّهِ لَـا يَتَعَلَّمُهُ إِلا لِيُصِيبَ بِهِ عَرَضًا مِنْ الدُّنْيَا لَمْ يَجِدْ عَرْفَ الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَـةِ**))[300] واتـە: هەرکەسێ زانینێ فێر ببـێ لـەو شـتانەی کـە بـە زانینـی ئـاینی دادەنـدرێن مەبەست لە فێربوونیان بۆ ڕەزامەندی خوا بـێ، بـەڵام ئەگـەر بـۆ ئـەوەبێ کـە سامانێکت دەس کەوێ ئـەوە بێگومـان ئـەو کەسـە لـە ڕۆژی دوایيـدا بـۆنی بەهەشت ناکا.

وە حەزرەتﷺ لە فەرموودەیێکی تردا دەفـەرموویت: ((**مَنْ ابتغى الْعِلْمَ لِيُبَاهِيَ بِهِ الْعُلَمَاءَ أو لِيُمَارِيَ بِهِ السُّفَهَاءَ أو يَصْرِفَ بِهِ وُجُوهَ النَّاسِ إِلَيْهِ أَدْخَلَهُ اللَّهُ النار**))[301] واتە: هەرکەسێ بۆ ئەوەی فێرە زانین و زانست ببێ بۆ ئەوە خۆی هەڵکێشـێ و شانازی بکات لەسەر زانایان یـان بـۆ ئـەوە دەمەتـەقێ و دەمـەوەڕی پێـی بکـا لەگەڵ نەزان و نەفامان یان بۆ ئەوە کە خەڵک ڕووی خۆی تێ بکەن و ناوبانگ و شوورەت دەربکا لەناویان، ئەوە بێگومان ئەو کەسە خوا دەیخاتە نـاو ئـاگری دۆزەخەوە.

---

(٢٩٩) لـەم ئايەتـەوە دەرئەکـەوێ هـەر زانايـەکی موسـوڵمانيش ئەگەرشـتێك بشـارێتەوە لـە ديـن، لەوانـە کـە پێويست بێ بە باسکردن، گوناهێکی زۆر گەورەی پێ ئەکات.. (بڕوانە تەفسيری خاڵ، ل٢٦ بەشی ٢ دانراوی شێخ محمدی خاڵ).

(٣٠٠) رواه ابوداود وابن ماجه

(٣٠١) رواه الترمذي وابن ماجه

هەروەها لە فەرموودەییێکی تردا دەفەرمووێت: ((**مَنْ سُئِلَ عَـــنْ عِلْـــمٍ فَكَتَمَـــهُ أَلْجَمَهُ اللَّهُ بِلِجَامٍ مِنْ نَارٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**))[٣٠٢] واتـه: هەرکەسـێ لـه عـیلم و زانسـتێ پرسیاری لێ بکەن و بێ‌شـارێتەوە و وەڵام نەداتـەوە، ئـەوە لـه ڕۆژی دواییـدا خوای گەورە لغاوێکی ئاگرینی لەدەم ئەکا. (خوا پەنامان بێت)

لە فەرموودەییێکی تردا دەفەرمووێت: ((**وكان من دعاء رسول الله ﷺ: أعوذ بك من علم لا ينفع**)) واتە: هەروەها یەکێک لە تکا و پاڕانـەوەی حـەزرەت ﷺ ئەمـە بووە کە دەیفەرموو: خودایە خۆم دەپارێزم بەتۆ لە عیلم و زانستێک کە قازانج و سوودی نەبێت.

**تێبینی:**

هەروەها شێخ ابن حجر (ڕەزای خـوای لێ‌بێـت) ئەفـەرمووێت لـە کتێبـی (زەواجر)دا: (**عُد هذا كبيرة**) واتە ئەمەش دەژمێردرێ لە تاوانە گەورەکان، یـانی هەرکەسێ عیلم و زانستێ فێر بێ بۆ غەیری ڕەزابوونی خودا یان بۆ جیهان بـێ بایەخ یان کەتمی زانتسێ بکەیت و بی شارێتیەوە لە فێرخوازان و ئامانە هەموو لە ڕێز و جوملەی تاوانە گەورەکان دەژمێردرێن.

(**فنسأل الله السلامة من كل بلاء والتوفيق لما يحب ويرضى انه جواد كريم**)

---

(٣٠٢) رواه ابوداود والترمذي باسناد صحيح

# تاوانی سی و نۆیەم

## خەیانەت یا ناپاکی کردن لەگەڵ خەڵکدا (الخيانة)

خوای گەورە دەفەرموویت: ((يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَخُونُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُوا أَمَانَاتِكُمْ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ))[٣٠٣] واتە ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، خیانەت مەکەن لە خوا و پێغەمبەر و خیانەتیش مەکەن لە ئەمانەتەکانی خۆتان (لە کاروباری ئاینی و غەیری ئاینیش) وە ئێوە دەزانن کە خیانەت شتێکی خەراپە.

هەروەها لە جێگایەکی تردا خوای گەورە دەفەرموویت لە قورئاندا ((وَأَنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي كَيْدَ الْخَائِنِينَ))[٣٠٤] واتە بەڕاستی خودا (هدایەتی) ئەو کەسانە نادات کە فرووفێڵ و خیانەت دەکەن.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموویت لە فەرمایشتێکا: ((آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ))[٣٠٥] واتە نیشانە و عەلامەتی ئینسانی مونافیق و ناپاک سێ شتە، کە قسەی کرد درۆ بکا و کە وەعدە و بەڵێنی دا بەجێی نەهێنێ و کە ئەمانەتێکیان پێ سپارد خیانەتی تێدا بکا.

لە فەرموودەیێکی تردا حەزرەتﷺ دەفەرموویت: ((أَدِّ الْأَمَانَةَ إِلَى مَنْ ائْتَمَنَكَ وَلَا تَخُنْ مَنْ خَانَكَ))[٣٠٦] واتە: (ئەمانەت) سپاردە بدەرەوە دەستی ئەو کەسەی بە ئەمینی داناوی و خیانەت مەکە لەگەڵ ئەو کەسەش کە خیانەتیان لەگەڵ کردووی.

---

(٣٠٣) سورەتی الانفال ئایەتی ٢٧

(٣٠٤) سورەتی یوسف ئایەتی ٥٢

(٣٠٥) رواه البخاري ومسلم

(٣٠٦) رواه احمد وابوداود.

دەفەرمووێت لە فەرمایشتێکی تردا: ((**أَنَا ثَالِثُ الشَّرِيكَيْنِ مَا لَمْ يَخُنْ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ**))[٣٠٧] واتە/ خوای گەورە لە حەدیسی قودسیا دەفەرمووێت: **ئەگەر دوو** کەس بوون بە شەریک واتە هاوبەش، من سێیەمیانم بە مەرجێک ئەگەر خیانەت نەکا لە هاوبەشەکەی.

لە هەندێ سەرچاوەدا فەرموودەکە بەمە کۆتایی دێت ((**فَإِذَا خَانَهُ خَرَجْتُ مِنْ بَيْنِهِمَا**)) واتە ئەگەر خیانەتیان لەگەڵ یەک کرد، من لێیان ئەکشێمەوە.

بەڵێ ئەمە شتێکی ڕۆن و ئاشکرایە ئەگەر خوای گەورە لەم بەینە کشایەوە، ئەمان تووشی زیان و زەرەر دەبن.

هەروەها حەزرەتﷺ لە فەرموودەیێکی تردا دەفەرمووێت: ((**من خان شريكا ائتمنه عليه واسترعاه له فأنا بريء منه**))[٣٠٨] واتە: هەرکەسێ خیانەت بکا لەگەڵ هاوبەشەکەی، ئەویش بە ئەمین و دەست پاکی داناوبێ، پێغەمبەرﷺ ئەفەرمووێت من لە ڕۆژی دواییدا لەو خائینە بەریم.

حەزرەتﷺ لە فەرمایشتێکی تردا دەفەرمووێت: ((**إياكم والخيانة فانها بئست البطانة**))[٣٠٩] واتە ئێوە خۆتان بپارێزن لە خیانەت، چونکە بەڕاستی خراپترین ڕەووشتی شارراوەی ناو زگ و دەروونە.

**تێبینی:**

بەڕاستی خیانەت تاوانێکی گەورەیە بەتایبەتی لەگەڵ خوا و پێغەمبەردا بکرێت، هەروەها خیانەت لەگەڵ خودادا ئەوەیە ئەو فەرز و واجبات و پێویستیانەی کە لەسەرت فەرزکراوە جێبەجێی نەکەیت و بە پێچەوانەوە ڕوو بکەیە ئەو شتانەی کە خوای گەورە قەدەغەی کردووە لێت، خیانەت لەگەڵ

(٣٠٧) رواه أبوداود والحاكم وقال صحيح الاسناد.

(٣٠٨) رواه البيهقي وابو يعلى

(٣٠٩) رواه ابوداود

پێغەمبەریشـــدا ئەوەیـــە گـــوێ نەدەیـــە فـــەرموودەكانی و كـــار بـــە ئـــاین و شەریعەتەكەی نەكـەی. هـەروەها خیانـەتیش لەگـەڵ یەكتري‌ـدا موسـوڵمان لەگـەڵ موسـوڵمان ئەمـەش تـاوانێكی زۆر گەورەیـە وەك هاوبـەش لەگـەڵ هاوبەشەكەی بكا و ژن خیانەت لەگەڵ مێردەكەی بكا و كوڕ خیانەت لەگـەڵ باوكی بكا و باوك خیانەت لەگەڵ كوڕ بكا و ئیتر بەپێچەوانەوە هتد... لە ژمـارە نایەت و بەڕاستی ئەوەی خۆی بە موسوڵومان بزانێ دەبێ خیانەت لەگەڵ بـرا و خوشكی موسوڵمانیدا نەكا و بە هیچ شێوە و جۆرێك چونكە خیانەت كردن لـە تاوانە گەورەكان ژماردراوە و دانراوە بە رأی زاناكان.

**(اللهم عاملنا بلطفك وتداركنا بعفوك آمين يا رب العالمين)**

## تاوانی چلەم

### منەت کردن لەسەر ئەو کەسەی کە چاکەی لەگەڵ دەکەی

### (المنان)

خوای گەورە لە قورئاندی دەفەرموویّت: ((يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تُبْطِلُوا صَدَقَاتِكُمْ بِالْمَنِّ وَالأَذَى))[310] واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە، ئێوە بەتاڵ مەکەنەوە پاداشی خێرەکانتان بەهۆی (مننەت) کردنتانەوە بەسەر خەڵکەوە کە پێیان ئەبەخشن، چونکە بەڕاستی دەبێتە هۆی ئازاردانی دڵی ئەو کەسە کە خێر و چاکەتان لەگەڵ کردووە.

هەروەها حەزرەت ﷺ دەفەرموویّت: ((ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمْ اللَّهُ وَلا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ولا يزكيهم ولهم عذاب أليم، المسبل والمنان والمنفق سِلْعَته بالحلف الكَاذِبٌ))[311] واتە: سێ کەس هەن خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا (قیامەت) خوا قسەیان لەگەڵ ناکا و بەچاوی ڕەحمەت تەماشایان ناکا و خاوێنیان ناکاتەوە، واتە پاک نابنەوە لە گوناهان تا بیان بووریّ، چونکە بەڕاستی ئەوان عەزابێکی زۆر بە کوشندەیان هەیە لە قیامەتا، یەکەمیان ئەو کەسەیە کە جلّ و بەرگی ئەخشێنیّ بەسەر خاک و زەویدا لەبەر تەکبر و فیزەوە خۆ بەزلّ دائەنێت، دووەمیان ئەو کەسەیە کە منەت بکا بەسەر ئەو کەسەی کە شتی پێ ئەبەخشیّ و ئەیداتیّ، سێهەمیان ئەو کەسەیە کە بە سوێندی درۆ نۆخ و ڕەواج پەیدا بکا بۆ ماڵ و سامانەکەی بۆ ئەوەی پێی بفرۆشێت.

(310) سورەتی البقره ئایەتی ٢٦٤

(311) رواه مسلم

له فەرمایشتێکی تردا حەزرەتﷺ دەفـەرمووێت: ((**ثلاثة قد حرم الله علـيهم الجنة، العاق لوالديه ومدمن الخمر والمنان**))[312] واتە سێ کەس ناچنە بەهەشـتەوە ئازاردانی دایک و باوک، بەردەوامی لەسەر مەی خواردنەوە، یـەکێ شـتێکی دا بە کەسێ منەتی بەسەرا بکا و (بەچاوی دابداتەوە)، چونکە بەڕاستی ئەم جـۆرە کەسانە هیچ خێر و پاداشێکیان بۆ نامێنێتـەوە بـەهۆی منـەت کـردن و بـاس کردنی خێر و چاکەکەیان لەناو خـەڵکا و ئەبێتـە دڵ ئێشـانی ئـەو کەسـە کـە چاکەت لە گەڵ کردووە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفـەرمووێت: ((**لا يدخل الجنـة خب ولا بخيل ولا منان**))[313] واتە ناچـێتە بەهەشـتەوە ئینسـانی فـڕوفێڵ بـاز و ئینسانی ڕژد و ئینسانی منەت بکا بەسەر ئەو کەسەدا کە شتی ئەداتێ.

حەزرەت لە فەرموودەیەکی تردا دەفـەرمووێت: ((**لا يَدْخُلُ الْجَنَّـةَ صَـاحِبُ خَمْسٍ مُدْمِنُ خَمْرٍ وَلا مُؤْمِنٌ بِسِحْرٍ وَلا قَاطِعُ رَحِمٍ وَلا كَاهِنٌ وَلا مَنَّـانٌ**))[314] واتـە خاوەنی پێنج شت ناچنە بەهەشتەوە، ئەو کەسەی بەردەوام بێت لەسـەر مـەی خواردنەوە، ئەوەی باوڕی بە جادوو گەڕ بێت، ئەو کەسەی کە (سـیلەی) ڕەحـم بەجێ ناگەێنێ، ئەوەی کو ئیشی (غەیب) زانـی ئـەکات یـا خەبـەر دەدات بـە شتی نەهێنیی و نادیار،[315] ئەو کەسەی منەت بکا بەسەر ئـەو کەسـەی کـە شتی ئەداتێ.

---

(٣١٢) رواه النسائي

(٣١٣) رواه الترمذي.

(الخب) هو المكر والخديعة والمنان هو الذي يعطى شيئا او يتصدق به ثم يمنّ به. (بڕوانە کتێبی الكبائر، ل١٧٢ دانراوی محمد بن احمد بن عثمان الذهبي)

(٣١٤) رواه الإمام احمد

(٣١٥) بەڕێز (الن منظور) لە کتێبی (اللسان)دا دەڵێت: الكاهن الذي يتعاطى الخبر عن الكائنات في مستقبل الزمان ويدعي معرفة الأسرار. (بڕوانە کتێبی لسان العرب، مادە كهن، ل ٣٠٩ ج٣ دانراوی ابن منظور).

**سەرنجێك:**

هـەروەها بۆمـان دەركـەوت بـە بەڵگـەی ئایـەتی قورئـان و فـەرموودەكانی پێغەمبەرﷺ كە گوناهێكی چـەن زل و گەورەیـە منـەت كـردن لەسـەر ئـەو كەسەی كە شتی پێئەدەی و ئازاری دڵی ئەو كەسـە بـدەی بـەجۆرێک لـەناو خەڵكا باسی بكەی بـەم شـێوە دڵـی بڕنجـێ و پەرێشـان ببێـت، چـونكە لـەم حاڵەتەدا هیچ خێر و پاداشی بۆ خاوەنەكەی دەست ناكەوێت و بەڕاسـتی هـەر خێر و چاكەیەک بۆ ڕەزامەندی خواوە نـەبێت، خـوا وەری ناگرێـت و گیـرای ناكات، هەروەها (خولاصە)ی واتە ئەمەش لە تاوانـە گـەورەكان ژمـاردراوە بـە رأی زانایان واتە منەت كردن بەسەر ئەو كەسەی كە شتێ پێ ئەدەی.

(نسأل الله العفو والعافية والتوفيق لما يحب ويرضى إنه جواد كريم).

# تاوانی چل و یەکەم

## باوڕنەکردن بە قەزاوقەدەر

## (تكذيب القضاء والقدر)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفـەرموویت: ((إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ))[٣١٦] واتـە ئێمە هەموو شتێکمان پەیدا کردووە بە تەقدریی خۆمان.

(قال المفسرون في سبب نزول هذه الآية أن مشركي مكـة أتـوا رسـول اللهﷺ يخاصمونه في القدر...الخ.) واتە موفەسیرەکان دەڵێن هۆی هاتنـەخوارەوەی ئـەم ئایەتە ئەمە بوو واتە بێباوەڕەکان ئـەهاتن بـۆ لای پێغەمبـەرﷺ موجادەلـەیان دەکرد لەبارەی قەزاو قەدەرەوە، ئەیان گوت هەموو شت (مستأنفه)[٣١٧] واتە خوا تەقدیر و دروستی نەکردووە، یان ئەیان گوت چارەنووس و (سەرنڤیشت) نیە و هەر ئیش و کاروبارێـک هـەتا روو نـەدا کـەس لـەوەپێش نایزانـێ. ئنجـا خـوا (تەکزیبی) کردن، واتە بەدرۆی خستنەوە ئەم چـەن ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە فەرمووی: ((إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ، يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَـى وُجُـوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ، إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ))[٣١٨] واتە بێگومان ئەو تاوانبارانـە وان لەناو گـومڕاهی و نەفامیـدا لـە دنیـادا و لـە پاشەڕۆژیشـدا وان لـەناو ئـاگری بڵێسەداری دۆزەخدا، ئەو رۆژەی کە ڕادەکێشرێن لەسـەر ڕوویـان لـەناو ئـاگر پێیان دەڵێن بچێژن گەرمی دۆزەخ، بێگومان ئێمە هـەموو شـتێکمان لەسـەر زانیاری و بڕیاری خۆمان لەسەر حیکمەت دروست کردووە..

---

(٣١٦) سورەتی القمر ئایەتی ٤٩

(٣١٧) وان الأمر انف اي مستانف لم يقدره الله ولا قضاه بل العبادة تقع اعمالهم بلا قدر سابق.. (بڕوانە کتێبی (الكبائر) دانراوی (الإمام الحافظ محمد بن عثمان الذهبي) لاپەڕە ١٧٦

(٣١٨) سوره القمر ئایەتی ٤٩

هەروەها ئیمامی (موسلیم) ریوایەت ئەکا لە ئیبنو عومەرەوە(ڕەزای خوای لیٚبیٚت) دەڵیٚت: پیٚغەمبەرﷺ دەفەرموویٚت: ((**كُلُّ شَيْءٍ بِقَدَرٍ حَتَّى الْعَجْزِ وَالْكَيْسِ**)) واتە هەموو شت بە (سەرنڤیشت) دروست کراوە تا ژیٚر و پەکەوتوش.

((**قال ابن عباس رضي الله عنه كل شيء خلقناه بقدر مكتوب في اللوح المحفوظ قبل وقوعه**)) واتە ئیبنوعەباس (ڕەزای خوای لیٚبیٚت) دەفەرموویٚت: خوا دەفەرموویٚت ئیٚمە هەموو شتیٚکمان دروست کردووە بە قەدەر، چونکە لە (لوح المحفوظ)دا نوسراوە.

پیٚش ئەم ئایەتە بیٚتە خوارەوە خوای گەورە فەرموویەتی ((**وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ**))[319] المعنى والله خلقكم وعملكم، واتە خوداش ئیٚوە و کردەوەی ئیٚوەی دروست کراوی ئیٚوەی خەلق کرد.

((**عَنْ ابن عمر رضي الله عنهما قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لِكُلِّ أُمَّةٍ مَجُوسٌ وَمَجُوسُ هَذِهِ الأُمَّةِ الَّذِينَ يَزعُمونَ أن لا قَدَرَ وأن الأمر آنف، قال فإذا لقيتهم فأخبرهم أني منهم بريء وأنهم براءٌ مني. ثم قال: والذي نفسي بيده لو أن لأحدهم مثل أحد ذهبا فأنفقه في سبيل الله ما قبل منه حتى يؤمن بالقدر خيره وشرّه)) ثم ذكر حديث جبرائيل وسأله النبيﷺ قال مَا الإِيمَانُ؟ قَالَ أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَتُؤْمِنَ بالقدر خيره وشرَه**))[320] وە لە ئیبنو عومەرەوە (خوایان لیٚ ڕازی بیٚت) دەڵیٚت: پیٚغەمبەرﷺ دەفەرموویٚت: هەموو ئۆمەتیٚک مەجووسی هەیە و مەجووسی ئەم ئومەتە ئەمانەن کە گومان ئەبەن قەدەر نیيە، واتە سەرنڤیشت نیە و هەموو شتیٚک مستأنفە خوا تەقدیر و حوکمی پیٚنەکردووە. حەزرەتﷺ دەفەرمووێ: کاتیٚ ئەگەیت بەوانە پیٚیان بڵیٚ کە من لەو کەسانە بەریم و ئەوانیش لەمن بەرین. ئنجا لەپاشان عەبدوڵای کوڕی عومەر (ڕەزای

(٣١٩) سورەی الصافات ئایەتی ٩٦

(٣٢٠) رواه مسلم وابوداود واحمد

خوایان لێبێت) سوێند دەخوات ئەڵێت قەسەم بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە ئەگەر یەکێک لەمانە بەقەد چیای ئوحود ئالتون بکات بەخێر و لەڕێی خودادا خوا لێی گیرا ناکا هەتا باوەڕ بە قەدەر نەکا چ چاکی و چ خراپی. لەپاشان ئەم فەرمایشتەی حەزرەتی جبرائیلی باس کرد کە پرسیاری لە پێغەمبەر کرد و فەرمووی: باوەڕی چی‌یە؟ ئەمیش لە وەڵامدا فەرمووی: واتە باوەڕی ئەمەیە باوەڕت ببێت بەخوا و بە فریشتەکانی خوا و بە کیتابە پیرۆزەکانی خوا و بە ڕۆژی دوایی قیامەت و بە قەزاوقەدەر لە چاکە و لە خراپە کە هەموو لە خواوەیە.

(فصل) أجمع سبعون رجلاً من التابعين وأئمة المسلمين والسلف وفقهاء الأمصار على أن السنّة التي توفي عليها رسول الله ﷺ أولها الرضاء بقضاء الله وقدره والتسليم لأمره والصبر تحت حكمه والأخذ بما أمر به والنهي عما نهى الله عنه واخلاص العمل لله والإيمان بالقدر خيره وشرّه وترك المراء والجدال والخصومات في الدين والمسح على الخفين والجهاد مع كل خليفة براً أو فاجراً والصلاة على من مات من أهل القبلة والإيمان قول وعمل ونية يزيد بالطاعة وينقص بالمعصية والقرآن كلام الله نزّل به جبرائيل على نبيه محمدﷺ غير مخلوق والصبر تحت لواء السلطان على ما كان منه من عدل أو جور ولا نخرج على الأمراء بالسيف وإن جاروا ولا نكفر أحداً من أهل القبلة وإن عمل بالكبائر إلا أن استحلوها ولا نشهد لأحد من أهل القبلة بالجنة لخير اتي به إلاّ من شهد له النبيﷺ والكف عما شجر بين أصحاب رسول اللهﷺ وافضل الخلق بعد رسول اللهﷺ ابو بكر ثم عمر ثم عثمان ثم علي بن أبي طالب (رضي الله عنهم أجمعين) ونترحم على جميع أزواج النبيﷺ وأولاده وأصحابه (رضي الله عنهم أجمعين)..

**باسێکی گرنگ:**

واته کۆبوونەتەوه حەفتا له پیاوانی گەوره وەک چینی دوایـی و پێشـەوایانی موسوڵمانەکانی رابوردوو و گەلێک فوقەها و زانا ئاینیانی شارەکان کۆبوونەتەوه و یەک گرتوو بوونه لەسەر ئەم رێگه و سوننەتەی که حـەزرەتی پێغەمبـەرﷺ لەسەری وەفاتی کردووه. یەکەم شت ئەوەیه رازی بوون به قەزاوقەدەری خوا و ملکەچ بوون بۆ فەرمانی خودا و خۆ راگرتن لەژێر حـوکم و فـەرمانی خـودادا. هەروەها ئـەو شـتەی کـه خـوا فـەرمانی پـێ کـردووه وەری بگـری و ئـەوەی قەدەغەی لێ کردووه نەکەیت و بەدڵسۆزی کار بکەی بۆ خوا و باوڕ بکەیت بـه قەدەر واته سەرنڤیشت چ چاکه و چ خراپه. پێویسته وازهێنان لـه دەمـەقالی و دەمەوەری و مجادەله له ئاینی نەکەیت.. هەروەها پێویسته بیروباوەڕت وابێ که دروسته دەست به تەڕی بەسەر خوفەدا بێنیت، بیروباوەڕت وابێ که غەزاکردن دروسته لەگـەڵ هـەموو جێنشـینی چ بـاش بێـت چ خـراپ بێـت، پێویسـته بیروباوەڕت وابێ ئەو کەسه که ئەمرێت له ئەهلی روو گه بێ نوێـژی جـەنازەی لەسەر ئەکرێت. ئنجا هەروەها واته باوەڕیش وتەیـه و کردەوەیـه و نیـازه، زیـاد ئەبێ به (گاعەت) واته پەیڕەوی کردن و هەروەها کەم ئەبێ به تاوان و گوناه و مەعصیەت، واته به دەرچوون له فەرمانی خودای مەزنەوه.. هـەروەها پێویسـته بیروباوەڕت وابێ که قورئان فەرمووده و وته و کلامی خودایه و ڕەوانەی کردووه خودای مەزن به فریشتەی دەست پاک به حەزرەتی جوبرائیل (علیـه السـلام) بۆ سەر پێغەمبەری ئازیز و خۆشەویستﷺ. وه قورئان (غیرة مخلوقة) و پێویسته باوەڕت وابێ خۆراگربی لەژێر ئالای کاربەدەست بەهەر شێوەیەک بێت داد بـێ یان جەور بێ، پێویسته ئێمه بەهیچ جۆرێک لانەدەین و دەرنەچین لەژێر ئەمر و فەرمانی کاربەدەست و دژایەتی نەکەین به شیر و به چەک ئەگـەر خـراپ و جەوریش بێت.[٣٢١] هەروەها پێویسته ئێمه باوەڕمان وابێت که هـیچ کەسـێک

---

(٣٢١) (تێبینی) هەروەها دەمانەوێ رۆن کردنەوەیەك بخەینه بەرچاو بەم چەند خاڵانەی خوارەوە:

-خاوەنی کتێبی الکبائر ئەم چەند دێرەی نووسیوه وەك دەفەرموێت:

(الصبر تحت لواء السلطان على ما كان منه من عدل أو جور ولا نخرج على الأمراء بالسيف وإن جاروا)

له ئەهلی روگه بە کافر نەزانین و ئەگەر تاوان و گوناهی گەورەشی کردبێ، مەگەر بە دروست و ڕەوای زانیبێ، پێویستە بیروباوەڕیان وابێ شایەدی بۆ هیچ کەسێک نەدەین لە ئەهلی رۆگە بە بەهەشت بۆ ئەوەی خێر و چاکەێکی ئەنجام دابێت، مەگەر پێغەمبەرﷺ شایەتی بۆ دابێت. پێویستە بەهەر جۆرێک ناوی یاران و هەوالاَنی پێغەمبەرﷺ نەبەین مەگەر بە چاکە نەبێت، چونکە پێویستە ئێمە دەم کوت بین لەم ڕووداوانەی واقیع بوە لە بەینی یارانی پێغەمبەرداﷺ. هەروەها پێویستە ئێمە باوەڕمان وابێت کە چاترینی ئینسان لەدوای پێغەمبەرەﷺ حەزرەتی ئەبوبەکری (صەدیقە) لە پاشان حەزرەتی عومەرە لە پاشان حەزرەتی عوسمانە لە پاشان حەزرەتی عەلیِیە کوڕی ئەبوگالب (خوا لێیان ڕازی بێت). وە پێویستە ئێمە بیروباوەڕمان وابێت بەزەییمان پێیان بێتەوە بە هەموو خێزان و ئەولادانی پێغەمبەرﷺ و هەموو یاران و دۆستانی (خوا لە هەموان ڕازی بێت) و لە ئێمە و دایک و باوک و خزم و کەس و کارمان و دۆست و برادەران و باقی موسوڵمانان ڕازی بێت (ئامین یا رب العالمین).

**ئاگاداریيەك:**

پێویستە ئێمە بزانین ئەو بیروباوەڕەی (قەدەرییەکان) و (مورجیئەکان) بڕیاری پێ ئەدەن ئەمە بیروباوەڕێکی فاسیدە و لە ڕیزی تاوانە گەورەکان دەژمێردرێن بە بەر نەفرینی خوا و پێغەمبەرﷺ ئەکەون، هەروەها قەدەریە و مرجئە دوو تاقمن، قەدەرییەکان واتە ئەوانەی کە نەفی قەدەر دەکەن و دەڵێن

---

ئەوەی ڕاسیبێ من نم توانیوە دەس کاری تێدا بکەم چونکە دەقی عبارەتەکە وا ئەڵێت من بەگوێرەی نوسراوەکە ترجومەم کردووە.

بەلاَم ئەوەی ڕاستبێ هەروەك لە پێشەوە گوتمان پێغەمبەریشﷺ لە فەرموودەیەك دا دافەرمووێت: ((لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق))رواه أحمد وحاكم عن عمران بن حصين. واتە: نابێ بەقسەی کەس بکرێت بۆ شتی گوناه و ناڕەوا، هەروەها ئەبوداود و نەسائیش بەم شێوەیە ریوایەتیان کردووە ((لا طاعة لأحد في معصية الله، إنما الطاعة في المعروف)) وە لە ریوایەتێکی تردا (امامی ئەحمەدا) دەفەرمووێت: ((لا طاعة لمن لم يطع الله)) بڕوانە کتێبی (کشف الخفا) دانراوی شێخ اسماعیل العجلونی، بەرگی دووەم لاپەڕە ٤٩٢

سەرنڤیشت و چارەنووس نیە، (مورجیئەکان) ئەڵێن تاوان لەگەڵ ئیمانـا زەرەر و زیانی نیيیە وەکو چۆن کار و ئیشی باش لەگەڵ کوفرا سودی نیيیە.

**(فنسأل الله المنان بلطفه أن يتوفانا على الكتاب والسنة أنه أرحم الراحمين).**

## تاوانی چل و دووەم

### گوێی لە قسەی خەڵك ڕاگرێ و نهێنییان ئاشكرا بكەین

### (التسمع على الناس وما يسرون)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: ((يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلاَ تَجَسَّسُوا وَلاَ يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ))[٣٢٢]

واتە: ئەی ئەوانەی كە باوەڕیتان هێناوە خۆتان دوور بخەنەوە لە گومانی خراپ، چونكە بەڕاستی هەندێک گومانی خراپ هەن گوناهن (وەكو گومانی بەد دەر هەق بە پیاوێكی باش) و بەدوای عەیبی خەڵكدا مەگەڕێن (و تەفتیشی عەیبی موسڵمانان مەكەن) و پاشملەش باسی یەكتر مەكەن، واتە با هەندێكتان ناوی هەندێكتان نەهێنێت، ئایا یەكێک لەئێوە حەز دەكات گۆشتی برای خۆی بە مردوویتی بخوات؟ دیارە ئێوە حەز لە شتی وا ناكەن و دەیكرهێنن، چونكە پاش ملە غەیبەت كردن لە ڕیزی خواردنی گۆشتی برایە. وە پێویستە لەخوا بترسن و خۆتان بپارێزن لەو شتانەی كە خوا پێی ناخۆشە و بزانن خودا تەوبە وەرئەگرێ لە هەركەسێ پەشیمان ببێتەوە و تەوبە بكا، چونكە بەڕاستی خوا میهرەبانە.

هەروەها پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ اسْتَمَعَ إِلَى حَدِيثِ قَوْمٍ وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ صُبَّ فِي أُذُنِهِ الْآنُكُ يوم القيامة))[٣٢٣] واتە هەر كەسێ گوێی بگرێت لە قسەی گەلێک ئەوانیش پێیان ناخۆش بێت بەجۆرێک كە گوێی لە پسەیان ڕائەگرن و ئەمە لە ڕۆژی قیامەتا هەردوو گوێچكەیان پڕی مسی تاواوە ئەكەن —خوا پەنامان بێت-.

هەروەها حەزرەت ﷺ لە فەرمایشتێكی تردا دەفەرموێت: ((إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ وَلا تَجَسَّسُوا وَلا تَنافسُوا وَلَا تَحَاسَدُوا وَلَا تَبَاغَضُوا ولا

---

(٣٢٢) سورەی الحجرات ئایەتی ١٢

(٣٢٣) اخرجه البخاري. (الأنك) الرصاص المذاب، واتە مسی تواوە.

تدابروا وَكُونُوا إِخْوَانًا))[٣٢٤] واتە: گومکانی بەد چونکی گومانی بەد درۆزنتــرین ووتە و قسەی (ظهننة)، هەروەها گوێی ڕامە گرن بۆ قسەی خەڵک بۆ ئــەوەی بیگرێنەوە وەک سیخوڕی و جاسوسی، یا عــەیب و عــار و نهێنــی موســوڵمانان مەخەنە روو و ئاشکرای مەکەن، هەروەها (بغچ) و کینەتان نــەبێ بەرامبــەر بــە یەکتری و میچوڕێن لە گەڵ یەکتریا بەهۆی ئەوەوە پشت لــە یــەکتریا بکــەن و هەموو عەبد و بەندەی خوا بــن و بــبن بــە بــرای یــەکتری، چــونکە بەڕاســتی موسڵمان بۆ موسڵمان برایە.

**سەرنجێك:**

هەروەها بە هیچ جۆرێک نابێت ئێمە گوێ لە ووتەو قسەی خەڵک ڕابگــرین کە نایانەوێ لە گفتو گۆیان تێبگەین، چونکە ئەوە تــاوانێکی گەورەیــە کــە بــە دزییەوە گوێ لە گفتو گــۆی ئــەم و ئــەو ڕابگــرین و بچــین بــڵاوی بکەینــەوە. هەروەها (سووئی ظەنیش) بەرامبــەر بــە موســوڵمانانی بێتــاوان و بێ گونــاه زۆر گوناهە و لە ڕیز و جوملەی تاوانە گەورەکان ژماردراوە. هەروەها دیسان لە ڕیز و جوملەی تاوانە گەورەکان ژماردراوە. (غەیبــەت) واتــە لــە پــاش ملــە باســی خەڵک کردن و ئازاردانی خەڵک بــە ناهــەق باســی مــاڵ و منــداڵ و خێزانیــان بکــەین و عــەیب و عاریــان بــەرەلا بکــەین و ســوکیان بکــەین بــەبێ ئــەوەی تاوانێکیان کردبێ، واتە بەبێ هەق، ئــەوە زۆر گوناهــە و لــە تاوانــە گــەورەکان دەژمێردرێت بەڕای زاناکان.

**(نعوذ بالله من هذه الذنوب ونسال الله التوفيق لما يحب ويرضى إنه جواد كريم)**

---

(٣٢٤) رواه البخاري ومسلم

# تاوانی چل و سێیەم

## ئاموشۆکەر لە بەینی خەڵکیا

## (النمام)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفـەرمووێت: ((وَلاَ تُطِعْ كُلَّ حَلاَفٍ مَهِينٍ هَمَّازٍ مَشَّاءٍ بِنَمِيمٍ))[٣٢٥] واتە پەیڕەوی کەسێک مەکە کە سوێندخۆرە بەدرۆ و خۆشەویسـت نیـیە لەپێش چاوی خەڵک و حەقیر و ریسوا بێ و عەیب گر و غەیبـەت کـەر بێ و گەڕۆک بێ بە قسەی فەساد ئاژاوە بنێتەوە لەبەینی خەڵکا.

لە حوزەیفەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت پێغەمبەرﷺ لـە فەرمایشـتێکا دەفەرمووێت: ((لا يدخل الجنة نمام))[٣٢٦] واتە ئەوەی ئامشۆکەر(نمام) بێ قسـەی خراپ لە بەینی خەڵکدا دێنێ و دەبا ناشێتە بەهەشت.

((وفي رواية لا يدخل الجنة قتات)) لە مەعنادا (قتات) و (نمام) یەکن.

لە فەرموودەیەکی تری پێغەمبەرﷺ بەڕاستی بۆمان دەرئەکەوێ ((أن رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مرّ بِقَبْرَيْنِ فَقَالَ إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أما أنـه كبير،(٣٢٧) أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لَا يَسْتَبْرِئُ مِنْ بَوْلِه وَأَمَّا الآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ. ثُمَّ أَخَذَ جَرِيدَةً رَطْبَةً فَشَقَّهَا اثْنَيْنِ وَغَرَزَ فِي كُلِّ قَبْرٍ وَاحِدَةً وقَالَ لَعَلَّهُ يُخَفِّفُ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا))[٣٢٨] واتە: حەزرەتﷺ تەشریفی ڕابـورد بـەلای دوو گـۆڕا و فـەرمووی خاوەنی ئەم دوو گۆڕە سەزا ئـەدرێن و سەزاکەشـیان لەبـەر شـتێ نیـیە کـە گەورە بێ، یانی لەلای خەڵک، بەڵام زۆر گەورەیە لـەلای خـودادا، یـەکێکیان

---

(٣٢٥) سورەتی القلم ئایەتی ١١

(٣٢٦) رواه البخاري ومسلم

(٣٢٧) وقوله (وما يعذبان في كبير) اي ليس بكبير تركه عليهما او ليس بكبير زعمهما ولهذا قال في رواية اخرى (بلى انه كبير) وانظر كتاب (الكبائر) ص١٨٢ تاليف الإمام الحافظ محمد بن احمد عثمان الذهبي.

(٣٢٨) رواه الجماعة

قسەی خراپی ئەگێڕا لەناو خەڵكدا، واتە قسەهێنەر و قسەبەر بووە، یەكێكی تریان خۆی پاك نەدەكردەوە لە گمێزەكەی و بەرگ و لەشی پیس ئەبوون.. ئنجا لەپاشان پێغەمبەرﷺ پەلكە دارخورمایەكی تەڕی هەڵگرت و كردی بە دوو كەرتەوە، هەر كەرتەی لەسەر گۆڕێكیان چەقاند، ئنجا حەزرەتﷺ فەرمووی: بەڵگە ڕەجا وایە كە سزاكەیان سووك بێت مادام تەڕایی لەو دوو لەقەدارخورمایەدا بمێنێت.

لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) ئەڵێت پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**تَجِدُونَ شَرَّ النَّاسِ ذَا الْوَجْهَيْنِ الَّذِي يَأْتِي هَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ وَيَأْتِي هَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ وما كان ذا لسانين في الدنيا، فإن الله يجعل له لسانين من نار يوم القيامة**))(٣٢٩) واتە لە خراپترین ئینسانان لە ڕۆژی دواییدا لەلای خودادا ئەوانە دەبینی كە دووڕوون بەڕووی دەچیتە لای ئەمان و بەرووی دەچێتە لای ئەوان. ئنجا حەزرەتﷺ فەرمووی هەركەسێك خاوەنی دوو زمانی بێ واتە ئاموشۆكەر و نەمامی بكات بەڕاستی خوای گەورە دروست دەكا بۆ ئەو كەسە لە ڕۆژی دواییدا دوو زمانان لە ئاگر.

تێبینی:

هەروەها لە ڕێز و جوملەی تاوانە گەورەكان دەژمێردرێت (**النمام**) واتە ئامشۆكەر لە بەینی خەڵكا، چونكە زەرەر و زیانێكی یەك جار زۆری هەیە. (**قال الحافظ المنذري: أجمعت الأئمة على تحريم النميمة وأنها من أعظم الذنوب عند الله عز وجل**) واتە ئیمامی (**موندری**) ئەڵێت: هەموو پێشەوایان گۆبوونەتەوە لەسەر ئەمە كە (**نمامی**) واتە قسەگێڕان بەناو خەڵكا و حەرامە و قەدەغەیە چونكە هەروەها بە گەورەترین گوناه دانراوە لەلای خوای گەورە. (**وقد اتفق العلماء على أنها من الكبائر**) واتە بەڕاستی هەموو زانایان یەكگرتوون لەسەر ئەمە كە (**نمامی**) واتە ئامشۆكەر لە تاوانە گەورەكان دانراوە و ژماردراوە.. هەروەها

---

(٣٢٩) رواه مالك والبخاري ومسلم

دووزمانیش لـه بـەینی خـەڵکاو بـەنیازی تێکـدانی نـاو بـەینیان بـە وەجهـی ئیفسادات و ئاژاوە ئەمـە تـاوانێکی زۆر گەورەیـە چـونکە دووزمـانی نیشـانەی منافقي‌یە.

(نعوذ بالله من النفاق والشقاق وسوء الأخلاق)

# تاوانی چل و چوارەم

## نەفرین و لەعنەت لێ کردن (اللعنة)

## واتە دوور خستنەوە لە بەزەیی خواوە

حەزرەت ﷺ دەفەرمووێت: ((سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ وَقِتَالُـهُ كُفْـرٌ))[٣٣٠] واتـە جوێندان بە موسڵمانان فیسقە یانی دەرچوونە لە دین و شـەڕ لەگـەڵ کردنـی کوفرە واتە کوشتاریشیان لەگەڵ یەکتری کاری کافرانە.[٣٣١]

لە فەرموودەیێکی تردا دەفەرمووێت: ((لعن المؤمن كقتله))[٣٣٢] واتە نەفرین لە پیاوی ئیماندار وەک شـەڕ لەگـەڵ کردنـی وایـە.[٣٣٣] لـە فەرمایشـتێکی تـردا حەزرەت ﷺ دەفەرمووێت: ((لا ينبغي لصديق أن يكون لعانـا))[٣٣٤] واتـە پیـاوی ڕاست گۆی موسوڵمان هەرگیز نابێ لەعنەت واتە نەفرین لە هیچ شتێک بکا.

هەروەها حەزرەت ﷺ لە فەرموودەیێکی تردا دەفـەرمووێت: ((لَيْسَ الْمُـؤْمِنُ بِالطَّعَّانِ وَلَا باللَّعَّانِ وَلَا بالْفَاحِشِ وَلَا بالْبَذِيء))[٣٣٥] واتە هـەرگیز نابێـت ئینسـانی ئیماندار پلاروەشێنی و نەفرین کەر و جنێوفرۆش و قسەی خـراپ و ناشـیرین بەدەمیا دابێت.

---

(٣٣٠) اخرجه الجماعة الا ابا داود

(٣٣١) یەعنی لە کوفرەوە نزیکە ئەوەندە گوناهێکی گەورەیە. (بڕوانە کتێبی القران النيرين في مجمع البحرين، دانراوی ماموستا مەلا رشید بەگی بابان، لێکۆڵینەوەی محمد علي القرەداغي، لاپەڕە ٣٢٤ بەرگی یەکەم.

(٣٣٢) اخرجه البخاري

(٣٣٣) شتێکی ئاشکرایە شەڕ لەگەڵ مرۆڤی ئیمانداری بێتاوان لە تاوانە گەورەکانە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ((وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا))سورەی الاحزاب ئایەتی ٥٨.

(٣٣٤) رواه مسلم

(٣٣٥) رواه الترمذي

هەروەها پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیێکی تـردا دەفـەرموێت: ((إِنَّ الْعَبْــدَ إِذَا لَعَنَ شَيْئًا صَعِدَتْ اللَّعْنَةُ إِلَى السَّمَاءِ فَتُغْلَقُ أَبْوَابُ السَّمَاءِ دُونَهَا ثُمَّ تَهْبِطُ إِلَى الْــأَرْضِ فَتُغْلَقُ أَبْوَابُهَا دُونَهَا ثُمَّ تَأْخُذُ يَمِينًا وَشِمَالًا فَإِذَا لَمْ تَجِدْ مَسَاغًا رَجَعَتْ إِلَى الَّذِي لُعِــنَ فَإِنْ كَانَ لِذَلِكَ أَهْلًا وَإِلَّا رَجَعَتْ إِلَى قَائِلِهَــا))[٣٣٦] واتـە: بەڕاسـتی ئەگـەر یـەکێ نەفرین لە یەکێکی تر بکا و مادام ئەو کەسە شایانی ئـەو نەفرینـە نـەبێ، ئـەوا نەفرینەکە بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان کە گەیشتە ئاسمان دەرگای لێ دائەخرێ و دەگەڕێتەوە بۆ خوارەوە بۆ لای ڕاستی ئەو ئینسانە کە نەفرینەکەی کردووە و لەو لاشەوە قەدەغە ئەکرێ (چونکە شایانی ئـەوە نـەبووە کـە نەفرینەکـەی بـۆ ڕەوانە کردووە). ئنجا لەپاشان ڕوو دەکاتە لای چەپ و ڕاسـتی کـابرا، هـەروەها هەموو لایەکی لێ دائەخرێ و لە ئەنجاما ئەو نەفرین و لەعنەتە دەگەڕێتەوە بۆ کابرای نەفرین کەرەوە.

**باسێك:**

هەروەها دروستە لەعنەت و نەفرەت لەو کەسانەی کە بە صیفەتێکی خـراپ ناسراون، هەروەک لە ئایەت و فـەرموودەی پێغەمبـەرەوە بۆمـان دەرئەکـەوێت خوای گەورە دەفەرموێت: ((أَلاَ لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ))[٣٣٧] واتە نـەفرینی خـوا لەسەر ستەمکاران. وە دەفـەرمووێت: ((فَنَجْعَلْ لَعْنَةَ اللَّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ))[٣٣٨] واتـە: دەگێڕین نەفرەتی خودا لەسەر درۆزنان.

پێویستە بزانن کە لەعنەت و نەفرینی خودا لەسەر ستەمکاران و درۆزنـان و لەسەر بێباوەڕان و ئا ئەوها بەو شێوەیە.

---

(٣٣٦) رواه ابوداود من حديث ابي درداء
(٣٣٧) سورەتی هود ئایەتی ١٨
(٣٣٨) سورەتی ال عمران ئایەتی ٦١

هەروەها لە پێغەمبەریشﷺ وەرگیراوە بەم جۆرە دەفەرمووێت: ((**لعن الله آكل الربا وموكله وشاهده وكاتبه**))[339] واتە نەفرینی خودا لە سووخۆر و خاوانەکەی و نووسەرەکەی و شایەدەکان.

وە دەفەرمووێت ((**لعن الله المحلل والمحلل له**))[340]، وە دەفەرمووێت: ((**لَعَنَ اللَّهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ وَالْوَاشِمَةَ وَالْمُسْتَوْشِمَةَ وَالنامصة والمتنمصة**))[341] واتە خودا نەفرینی کردووە لەو ژنەی کە بە (فەن) پرچی بۆ خەڵکی ئەکا و ئەوەی ئەیکا بەسەری خۆیا و ئەوەی حەڵک دەکوتێ و ئەوەی خۆ بە خەڵکی دەکوتێ و ئەوەی مووی دەم و چاوی خەڵک هەڵئەگرێ و ئەوەی بە خەڵک مووی دەم و چاوی خۆیان هەڵدەگرن، وەک هەڵکێشانی مووی دەوروبەری چاو و برۆی بۆ جوانی.

هەروەها حەزرەتﷺ لە چەند فەرموودەیێکی بەهێزا دەفەرمووێت: ((**لعن الصالقة والحالقة والشاقة**))[342] واتە نەفرەت لەم ژنەوە کە دەنگی خۆی بەرز دەکاتەوە لە ماتەم و لەوەی قژی خۆی دەردێنێ و لەوەی یەخەی خۆی دابدڕێ.

((**لعن الله الراشي والمرتشي في الحكم**))[343] هەروەها دیسان پێغەمبەرﷺ نەفرینی کردووە لەو جۆرە کەسانە کە بەرتیل دەبەن و وەردەگرن لە دادگا و داوەریدا بەناڕەوا.

---

(٣٣٩) رواه الترمذي

(٣٤٠) رواه النسائي والترمذي.. ماناكەی تەرجەمە كراوە لە تاوانی سی و پێنجەم، مارە بەجاشەوە ئەگەر ئەتەوێ مراجعەی بکە.

(٣٤١) رواه مسلم

(٣٤٢) رواه ابن ماجه وابن حبان في صحيحخ بالفاظ مترادفة

(٣٤٣) رواه الترمذي والحاكم وابن حبان في صحيحه

((وأنه لعن من غـــيرِ منــار الأرض –أي حـــدودها–))[٣٤٤] واتــه حــەزرەت ﷺ نەفرینی کردووە لەو کەسانەی کە سنووری ئـەرز ئـەگۆڕن و بـە تایبـەتی کـە موڵک بێت.

((وأنه قال لعن الله من لعن والديه ولعن من سبّ امـــه))[٣٤٥] واتـه حـەزرەت ﷺ دەفەرمووێت خودا نەفرینی کردووە لـەو کەسـانەی کـە نـەفرینی لـە دایـک و باوکی ئەکات، هەروەها نەفرینی لەم کەسانەش کـراوە کـە جنێـو بـە دایـک و باوکی بدات.

لە فەرمایشتێکی تردا حەزرەت ﷺ دەفـەرمووێت: ((لعن الله من أضلّ أعمـــى عن الطريق))[٣٤٦] واتە: خودا نەفرینی کردووە لەو کەسـانە کـە خـەڵکی گـومڕا ئەکەن بە تایبەتی ئینسانی کوێر و نەزان.

((لعن من أتيَ البهيمة)) واتە حەزرەت ﷺ نەفرینی کردووە لـەو کەسـانەی کـە ئەچنە لای چوارپێ و حەیواناتا.

هەروەها فەرموویەتی: ((ولعن من عمل عمل قوم لوط))[٣٤٧] واتە نـەفرین لـەو کەسانەش کە کردەوەی قەومی (لووگ) ئەکەن.

(والحاصل) ئا بەم شێوەیە دوو سێ پەڕە کاغەز دەڕوات لەسەر ئەم نەفرینەی حەزرەت ﷺ، (نعوذ بالله من لعنته ولعنة رسوله) خوایـە خۆمـان دوور ئـەگرین لـە نەفرینی تۆ و لە نەفرینی پێغەمبەری تۆ ﷺ. (ئامین).

---

(٣٤٤) رواه مسلم واحمد

(٣٤٥) رواه احمد والنسائي

(٣٤٦) رواه اصحاب السنن

(٣٤٧) رواه ابن حبان والبيهقي

**(ئاگادارییەك)**

هەروەها پێویستە بزانین لەعنـەت واتـە نـەفرەت کـردن لـە موسـوڵمانێکی بێتاوان لە ڕێـز و جوملـەی تاوانـە گـەورەکان دەژمێردرێـت بـە رأی هـەموو زاناکانی ئاینی، چونکە مانای لەعنەت واتـە نـەفرەت دوور بوونـە لـە بـەزەیی و ڕەحمەتی خودا، بەڵام هەندێک لە زانایان ئەڵێن دروستە بەم شێوەیە نـەفرەت وەک بلَیی **(لعن الله الظالمين، لعن الله الكافرين، لعن الله اليهود والنصارى، لعـن الله الفاسقين، لعن الله المصورين، ونحو ذلك كما تقـدم)**. هـەروەها هەنـدێکی تـر لـە زاناکان دەڵێن لەعنەت لە کەسێکی دیاری لە جوولەکە یا گاور ناڕەوایە چونکە مەعلووم نيیە لە ئەنجاما دوارۆژی ئەو کەسە چـۆن ئـەبێ. بـەڵکو موسـوڵمان ببێ..

هەروەها ئیمام (محمدی غەزالیش) (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەفـەرمووێت: حەرامە و دروست نيیە لەعنەت کـردن لـە هـیچ کـەس مەگـەر لـەو کەسـە نەبێت کە لەسەر کفر مردووبێت، وەک ئەبوولەهەب و ئەبووجەهل و فیرعـەون و هامان و وێنەی ئەمانەوە. هەروەها بۆمان دەرکەوت دروست نيیە نەفرەت لە موسوڵمانێکی دیاريو تایبەتی بکرێ، ئەگەرچی زۆر فاسق و تاوانبـاریش بـێ، چونکە مەعلوم نيیە لە پاشەڕۆژا چۆن ئـەبێ **(والله أعلم بحقيقة الحال وإليه مرجع والمنال)**.

**(اللهم نزه قلوبنا عن التعلق بمن دونك واجعلنا من قوم تحبهم ويحبونك واغفر لنـا ولوالدينا ولجميع المسلمين)**

# تاوانی چل و پێنجەم

## غەدر کردن و گوێنەدان بە بەڵێن و پەیمان

## (والغدر وعدم الوفاء بالعهد)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێت: ((وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولاً))[٣٤٨] واتە وەفا بە بەڵێن بکەن، چونکە بەڕاستی عەهد و پەیمان پرسیاری لێ دەکرێتەوە.

(قال الزجاج: كل ما أمر الله به أو نهى عنه فهو من العهد) واتە زوجاجی موفەسیر دەڵێت هەموو شتێکی خوای مەزن فەرمانی پێکردبێ و یا نەهی و قەدەغەی لێ کردبێ، ئەمە پەیمانە.

هەروەها خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ((يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ))[٣٤٩] واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەو پەیمانانەی کە بەستوتانە و ئەیبەستن بەجێیان بێنن.

حەزرەت ﷺ دەفەرمووێت: ((أَرْبَعُ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا خَالِصًا وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْ النِّفَاقِ حَتَّى يَدَعَهَا، إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ))[٣٥٠] واتە: چوار خەسڵەت هەیە هەرکەسێک هەرچواری تێدا هەبن ئەوە منافقی خالیصە، ئەگەر خەسڵەتێ لەوانەی تێدا هەبێ ئەوە ئەو کەسە خەسڵەتێ لە نیفاق و ناپاکی تێدایە هەتا تەرکی ئەو خەسڵەتە دەکا. یەکێکیان ئەوەیە ئەگەر قسەی کرد لە قسەکردنا درۆی تێدا بکا، دووەمیان ئەگەر بە ئەمین و دەست پاکت دانا و خیانەتی تێدا

---

(٣٤٨) سورەتی (الإسراء) ئایەتی ٣٤

(٣٤٩) سورەتی (المائدە) ئایەتی ١

(٣٥٠) رواه الشيخان

بکا، سێیەمیان ئەگەر پەیمانەک ببەستێ و بەبێوەفایی بیشکێنێ و غەدری تیا بکا و بەجێی نەگەینی، چوارەمیان ئەگەر دەمەقاڵێکی بوو لەگەڵ کەسێکا لە هەق ملێچی تێدا بکا و لابدا و یا قسەی پڕوپووچ دەکا و جنێو دەدات..

وە پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەییێکی تردا دەفەرمووێت: ((إِذَا جَمَعَ اللَّهُ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرْفَعُ لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ يعرف به يقال هَذِهِ غَدْرَةُ فُلَانِ بْنِ فُلَانٍ))(٣٥١) واتە ئەگەر خودای گەورە ئەم خەڵکەی کۆکردەوە و لە هەموو صینفێک لە چینی ئەوەڵەوە و لە چینی ئاخیریەوە لە قیامەتدا، ئنجا بەرز ئەکرێتەوە لەسەر سەری هەموو غەدرکەرێک بۆ ئەوەی بناسرێت و پێی ئەگوترێت ئا ئەمەیە غەدری کردووە لە فلانی کوڕی فلانکەسەوە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: خوای گەورە لە فەرمایشتی (قدسیا) دەفەرمووێت: ((يقول اللَّهُ عز وجل: ثَلَاثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ، وَرَجُلٌ بَاعَ حُرًّا فَأَكَلَ ثَمَنَهُ، وَرَجُلٌ اسْتَأْجَرَ أَجِيرًا فَاسْتَوْفَى مِنْهُ وَلَمْ يُعْطِ أَجْرَهُ))(٣٥٢) واتە: خوای مەزن دەفەرمووێت: سێ کەس هەنە لەڕۆژی دواییدا من خۆم موحاکەمەیان پێ ئەکەم و تەرەفگیریانم: یەکێکیان ئەو کەسەیە کە بەهۆی منەوە پەیمان ئەدا بە کەسێک، لەپاشان غەدری لێ ئەکا و پەیمانەکە ئەشکێنێ و نایباتە سەر، دووەم پیاوێکی تر ئادەمیزادێکی ئازاد بفرۆشێ و نرخەکەی بخوا، سێیەم پیاوێکی تر کرێکارێکی بەکرێ بگرێ و ئیشوکاری خۆی پێ بکا و لە دواییدا کرێکەی نەداتێ و غەدری لێ بکات.

---

(٣٥١) رواه مسلم

(٣٥٢) اخرجه البخاري

**تێبینی:**

هەروەها پێویستە ئێمە بزانینَ غەدر کردن لە رێز و جوملەی تاوانە گەورەکانە و غەدریش گەلێک جۆری هەیە، هەروەها پێویستە بزانین شکاندنی (عهد) و بەڵێن و پەیمان چەلەگەڵ خوای گەورەدا بێ و چە لەگەڵ ئادەمیزاد دا بێ، لە گوناهە گەورەکان دەژمێردرێت، هەروەکو لە فەرموودەکانی حەزرەتﷺ بۆمان دەرکەوتووە.

(فنسال الله العفو والعافية والتوفيق لما يحب ويرضى إنه جواد كريم)

# تاوانی چل و شەشەم

## باوڕکردن بە کاهین و ئەستێرەشوناسی

## (تصديق الكاهن والمنجم)

خوای گەورە دەفەرمووێت: ((**وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولاً**))[٣٥٣] واتە: قەت مەکەوە شوێنی شتێک کە زانست و فامی خۆت پێنەگەیشتووە، مانای شتێک نەت بیستبێ مەڵێ بیستوومە، نەت دیتبێ مەڵێ دیتوومە، نەت زانیبێ مەڵێ زانیومە. وەک قەتادە دەفەرمووێت: (**لا تقل سمعت ولم تسمع ورايت ولم تر وعلمت ولم تعلم**) چونکی بەڕاستی بێگومان گوێ و چاو و دڵ هەریەکە لەم سێیانە پرسیاریان لێ ئەکرێ لەو کردەوەی کە ئەیکەن یا نایکەن.

لە ئایەتێکی تردا خوای مەزن دەفەرمووێت: ((**عَالِمُ الْغَيْبِ فَلاَ يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا إِلاَّ مَنْ ارْتَضَى مِنْ رَسُولٍ**))[٣٥٤] واتە هەر خوایە ئاگادار بە نهێنی و کەس ئاگادار ناکات بەسەر نهێنی خۆیا مەگەر پێغەمبەرێک کە خوا هەڵیبژاردبێ.

هەروەها حەزرەتﷺ لە فەرمایشتێکا دەفەرمووێت: ((**مَنْ أَتَى كَاهِنًا أَوْ عَرَّافًا فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ**))[٣٥٥] واتە هەرکەسێ بچێ بۆ لای فاڵگرەوەیەک یا بۆ لای کاهینێک، واتە غەیب زانی و باوەڕ بە قسەی بکا و بەوەی کە دەیڵێت، ئەوە بەڕاستی هیچ بەشی بە دین و ئایینی موحەمەدەوە نامێنێ بەوەی کە هەناردوویەتیە خوارەوە.

((**روي عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ رضي الله عنه قَالَ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَاةَ الصُّبْحِ عَلَى إِثْرِ كَانَتْ مِنْ اللَّيْلِ فَلَمَّا انْصَرَفَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ بوجهه فَقَالَ: هَلْ تَدْرُونَ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: أَصْبَحَ مِنْ**

---

(٣٥٣) سورەتی الإسراء ئایەتی ٣٦

(٣٥٤) سورەتی الجن ئایەتی ٢٧

(٣٥٥) رواه ابوداود

عِبَادِي مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ، فَأَمَّا مَنْ قَالَ مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللَّهِ وَرَحْمَتِهِ فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ بِالْكَوْكَبِ، وَأَمَّا مَنْ قَالَ بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا فَذَلِكَ كَافِرٌ بِي وَمُؤْمِنٌ بِالْكَوْكَبِ))[٣٥٦] واته: زەیدی بەنی خالدی جهنی ئەفەرمووێ: پێغەمبەرﷺ لە حودەیبیە لە دوایی بارانی کە بە شەو باریبو نوێژی بەیانی بۆ کردین، کە سەلامی دایەوە رووی کردە خەڵق و فەرمووی: ئەزانن کە خوا چی فەرمووە؟ وتیان خوا و پێغەمبەری لە هەموو کەس چاکتر ئەزانن. فەرمووی: کە خوا فەرموویە بەندەکانی من بوون بە دوو (فیرقە)، فیرقەیەکی ئیمانی پێ هێناوم و فیرقەیەکیان کافر بوون بە من، ئەوەی کە بڵێ بە فەچل و رەحمەت و کەرەمی خوا بارانمان بۆ بارێنرا، ئەوانە مۆمینن بە من و کافرن بە ئەستێرە، ئەوانەی کە ئەڵێن بە (گلووع) غروبی فلان ئەستێرە بارانمان بۆ بارێنرا، ئەوانە کافرن بە من و مۆمینن بە ئەستێرە.[٣٥٧]

پێغەمبەرﷺ دەفەرموویێت لە فەرمایشتێکدا: ((مَنْ أَتَى عَرَّافًا فَصدقَهُ بما يقول لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ يوما))[٣٥٨] واتە هەرکەسێ بڕوا بۆ لای فاڵگرەوە(عەرافێک) لە بارەی شتێکەوە پرسیاری لێ بکا و (گێڕرە) لەلای بگرێتەوە، ئەویش پێی باوەڕ بکات بەوەی کە ئەیلێت، ئەمە نوێژی چل رۆژی گیرانابێ.

((عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ اقْتَبَسَ شُعْبَةً مِنْ النُّجُومِ فقد اقْتَبَسَ شُعْبَةً مِنْ السِّحْرِ زَادَ مَا زَادَ))[٣٥٩] واتە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە، ئەمیش لە پێغەمبەرەوەﷺ دەفەرمووێت: هەرکەسێک زانیارییەک لە ئەستێرە شوناسی وەربگرێت هەروەکو ئەوە وایە فێر ببێ لە بابەتێ لە زانینی جادووکەری، واتە جیاوازی نییە لەنێوان زانستی ئەستێرەشوناسی و سیحردا.

---

(٣٥٦) متفق عليه

(٣٥٧) بڕوانە کتێبی (اقتران النيرين في مجمع البحرين) دانراوی مامۆستا مەلا رشيد بەگی بابان، لێکۆڵینەوەی محمد علی قەرەداغی، لاپەڕە ٣٩١ بەرگی یەکەم.

(٣٥٨) رواه مسلم

(٣٥٩) رواه ابوداود باسناد صحيح

((قال علي بن أبي طالبﷺ: الكاهن والساحر كافر))[٣٦٠] واتـه: عـەلی کـوڕی ئـەبوو گالـب (خـوای لـێ ڕازی بێـت) دەفـەرموویٚت: کـاهین جادووبـازە، جادووکەریش بێباوەڕە.

**سەرنج:**

هەروەها لە تاوانە گەورەکان ژماردراوە خوێندنی زانستی جادووبازی(سـحر) یا فێرکردنی بە یەکێ یا باوڕکردن بە کاهین و غەیب زانـی و شـتی نادیـار یـا داوای غەیب زانین بکەیت و (**العیاذ بالله**) ئەمـە نێزیکـە لـە کـوفر و بێبـاوەڕی. هەروەها ئەمەش لە ڕێز و جوملەی گوناهە گەورەکان دەژمێردرێـت. (**تنجـيم**) واتە ئەستێرەشوناسی و ئەستێرەگکرتنەوە و حیسابی ئەستێرە و باوڕکردنی بـە هەلاٚتن و ئاوابوونی لەسـەر پیـرۆزی و نـاپیرۆزی، ئەمـە هـەمووی لـە زەمـانی جاهیلیەتا بەکاریان دەهێنا، خوا پەنامان بێت.

(**فنسأل الله العافية والعصمة في الدنيا والآخرة**)

---

(٣٦٠) بڕوانە کتێبی (الکبائر) لاپەڕە ١٩٦ دانراوی (الإمام الحافظ محمد بن احمد بن عثمان الذهبي).

# تاوانی چل و حەوتەم

## یاخی بوونی ئافرەت و بەگوێنەکردنی پیاوەکەی

## (نشوز المرأة على زوجها)

خوای گەورە دەفەرموویت لە قورئانـدا: ((وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُــوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا))[٣٦١] واتە ئەو ئافرەتانەی دەترسێن ئێوە لەوەی کە بەگوێتان نەکـەن بەم جۆرە نیشانەی (نشوزیان) دیارکەوت، ئامۆژگاریان بکەن و ترسی خودایـان پێ بدەن بە لێدانێکی ئەوتۆ کە (عەیبداریان) نەکا یـان شـوێنێکیان بشـکێنێ، چونکە ئەو جۆرە ئازاردانە ڕەوا نیە، ئەگەر ژنەکان فەرمانی ئێوەیـان (قـەبووڵ) کرد ئنجا داوای هیچ ڕێگەیتی مەکەن بۆ سـتەمکردن لەسـەر ئـەوان، چـونکە بەڕاستی خودا پایەی بـەرز و بڵنـدە بەسـەر هـەموو گیانـدارێکا و گەورەیـە و ئەگەر ئێوە دەستان ئەڕوا لەسەر ئەو ئافرەتانەدا، خوداش دەستی ئـەڕوا بەسـەر ئێوەدا و تۆڵەتان لێ دەستێنێ.

ئیمـامی بوخـاری و موسـلیم لـە ئـەبووهورەیرەوە (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەگێڕنەوە کە حەزرەتﷺ بەڕاستی فەرموویـەتی: ((إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَــى فِرَاشِهِ فَلَمْ تَأْتِهِ فَبَاتَ غَضْبَانَ عَلَيْهَا لَعَنَتْهَا الْمَلَائِكَةُ حَتَّى تُصْــبِحَ))[٣٦٢] واتـە: ئەگـەر پیاو داوای سەرجێیی لە ژنەکەی بکا و ژنەکەی هەیدیێی لێ بکـا و بـەگوێی نەکات، ئەوە ئەم شەوە هەتا بەیانی فریشتەکانی خودا لەعنەت و نـەفرینی لـێ دەکەن.

---

(٣٦١) سورەتی النساء ئایەتی ٣٤

(٣٦٢) متفق علیه

((عَنْ جابر رضي الله عنه عن النبي رَسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ قال: **ثَلَاثَةٌ لَا تُقْبَلُ لَهُمْ صَلَاةٌ ولا ترفع لهم إلى السماء حسنة العبد الآبق حتى يرجع إلى مواليه فيضع يده في أيديهم والمرأة الساخط عليها زوجها حتى يرضى عنها والسكران حتى يصحو))**[٣٦٣] واتە: لە جابرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە، ئەمیش لە پێغەمبەرەوەﷺ دەفەرمووێت: سێ کەس هەنە خوای گەورە نوێژیان لێ قەبووڵ ناکات و هیچ خێر و چاکەیان بۆ ئاسمان بڵند نابێت، یەکێک لەمانە ئەوەیە بەندەیەکی هەڵاتو تا ئەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی خۆی دەست لەناو دەستیان ئەنێت، دووەم ئافرەتێکە پیاوەکەی لێی توڕەیە تا ئاشت نەبێتەوە لەگەڵی، سێیەم ئینسانی بێهۆش تا چاک ئەبێتەوە.

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**أول ما تسال عنه المراة يوم القيامة عن صلاتها وعن بعلها**))[٣٦٤] واتە یەکەم شت کە ئافرەت پرسیاری لێ دەکرێت لە ڕۆژی قیامەتا نوێژە، دووەم پرسیاری لێ دەکرێت لە بارەی مافی مێردەکەیەوە.

هەروەها حەزرەت لە فەرموودەیێکی تردا دەفەرمووێت: ((**لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ تصوم وزوجها شاهد إلا بأذنه ولا تأذن في بيته إلا بأذنه**))[٣٦٥] واتە: ڕەوا نیە بۆ ژنێک کە باوەڕی بە خوا و ڕۆژی قیامەت هەبێ بەڕۆژوو بێت (واتە ڕۆژووی سوننەت) نەک واجب، ئەگەر مێردەکەی حازر بێت، مەگەر بە ڕەزای پیاوەکەی بێت، هەروەها نابێت کە ژن ڕێگەی هیچ کەس بدات کە هاتوچۆی بکا و بچێ بۆ ماڵی، مەگەر بە ڕەزای مێردەکەی.

---

(٣٦٣) رواه الطبراني وابن خزيمة وابن حبان في صحيحهما

(٣٦٤) رواه ابو الشيخ في ثواب الأعمال من حديث انس‌ﷺ.

بڕوانە کتێبی (الزواجر عن اقتراف الكبائر) دانراوی الشيخ ابن حجر الهيتمي، بەرگی دووەم لاپەڕە ٤٧

(٣٦٥) اخرجه البخاري

هەروەها حەزرەتﷺ لە فەرمودەیێکی تردا دەفـەرموویێت: ((لَوْ كُنْتُ آمِـرًا أَحَدًا أَنْ يَسْجُدَ لِأَحَدٍ لَأَمَرْتُ الْمَرْأَةَ أَنْ تَسْـجُدَ لِزَوْجِهَـا))[٣٦٦] واتـە: ئەگـەر مـن (ئەمرم) بکردایە بە کەسێ کە سجدە واتە کوڕنووش ببا بۆ کەسێ، ئەوا ئەمر و فرمانم ئەکرد بە ئافرەت کە سوجدە ببا بۆ مێردەکەی. (بەڵام کوڕنووش هەر بـۆ خوای گەورەیە و بەس).

**باسێك:**

پێویستە بۆ هەموو ئافرەتانی لەخوا ترس تێبکۆشن بۆ پەیڕەوی خوای مەزن و بۆ پەیڕەوی مێردەکەی، چونکە بەڕاستی هەر پیاوێک لە ژنەکەی ڕازی بێـت ئەوە پاداشی بەهەشتە، وەک حەزرەتﷺ لە فەرمودەیێکا دەفەرموویێت: ((أَيُّمَا امْرَأَةٍ مَاتَتْ وَزَوْجُهَا عَنْهَا رَاضٍ دَخَلَتْ الْجَنَّـةَ))[٣٦٧] واتـە هـەر ئافرەتـێ بمـرێ و مێردەکەی لێی ڕازی بێ، ئەمە دەچێتە بەهەشتەوە.

**(فصـل)**

واتە باسێکی تر، هەروەها چۆن پێویستە ئافرەت ڕێزی پیاوەکـەی بگرێـت و لە قسەی دەرنەچێت و مافی جێبـەجێ بکـات، ئـاواش پێویسـتە پیـاو ڕێـزی ئافرەتی بگرێت و مافیان نەفەوتێنێت و بـە جـوانی ڕەفتاریـان لەگـەڵ بکـەن، هـەروەک قورئـان دەفـەرموویێت: ((وَعَاشِـرُوهُنَّ بِـالْمَعْرُوفِ))[٣٦٨] واتـە ئـەی موسڵمانینە پێویستە ژیان لەگەڵ خێزانەکانتان بەخۆشی بەرنە سەر لەگەڵیان نـەرم و نیـان بـن ڕێـک و پێـک و ڕووخـۆش بـن، وەک پێغەمبـەریشﷺ دەفـەرموویێت: ((خيركم خيركم لأهله))[٣٦٩] واتـە: باشـترین کەسـتان باشـترین کەسە بۆ خێزانەکەی.

(٣٦٦) رواه الترمذي

(٣٦٧) رواه الترمذي

(٣٦٨) سورەتی النساء ئایەتی ١٩

(٣٦٩) رواه الترمذي

**تێبینی:**

(عد النشوز كبيرة هو ما صرح به جمع من العلماء) هەروەها ئەمەش لە رێز و جوملەی تاوانە گەورەکان ژماردراوە، هەروەک هەندێک لە زانایان دانیان پێادا ناوە (نشوز) لە شەرعدا بریتيیە لەوە کە ژن لە فەرمانی مێردەکەی دەربچێ بەبێ بەڵگەی شەرعی وەک ئەوە کە بێ رێگادانی ئەو لە ماڵ دەربچێ بە غەیری دەرچوونی عادەتی لە بەینی دەرو دراوسێدا یاخود قەدەغەی مێردەکەی بکا لەوە کە بچێتە لای و لەزەتی لێ وەربگرێ، یا دەرگای لەسەر دابخا و رێگای نەدا بێتە ماڵەوە، یا بەدرۆ داوای تەڵاقی لێ بکا، هەر ژنێ بەبێ مێردەکەی بڕوا بۆ سەفەر بەبێ ئەوە کە ئەو رێگای دابێ، ئەوە بە ناشزە و لە فەرمان دەرچوو دائەنرێ.[٣٧٠]

(فنسأل الله أن يرزقنا الصبر على ما يحب ويرضى إنه جواد كريم)

---

(٣٧٠) بڕوانە شەریعەتی ئیسلام، بەرگی سێیەم، لاپەڕە ٢٥٦، دانراوی مامۆستا مەلا عبدالكريمی مدرس

# تاوانی چل و هەشتەم

## وێنەگرتنەوە (الصورة)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفـەرمووێت: ((**إِنَّ الَّذِينَ يُؤْذُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُهِينًا**))[٣٧١] (قال عكرمه هم الزين يصنعون الصور). واتە بەڕاستی ئەو بێباوەڕانە کارێکی وا ئەکـەن و قسـەیەکی وا ئـەڵێن خودا حەزی پێ نەکا و پێغەمبـەری خـودا ئەزیـەت بـدا و ئـازار بـە دڵـی ئـەو بگەیەنێ، ئەوە خودا لە دنیا و قیامەتا لە ڕەحمەتی خـۆی دووریـان ئەخاتـەوەو سزایەکی سەختی وەهایان بۆ ئامادە ئەکا سوکیان بکا و ریسوا ببن لەبەرچـاوی خاوەن ئیعتبارانا.

عەکرەمە بەزەیی خوای پیا بێتەوە، ئەڵێت: ئەمانە ئەوان کەسانن کـە کـار و پیشەی وێنە ئەکەن.. هەندێ موفەسیرین دەفەرموون ئەم ئایەتە لـەبارەی ئـەو کەسانە هاتووەتە خوارەوە کە وێنـەی گیانلەبـەر دەکێشـن، چـونکە بەڕاسـتی وێنەکێشـان مـرۆڤ دەخاتـە سـەر بیروبـاوەڕی چـەرخی بـت پەرسـتی کـە لەمەوپێش بووە.[٣٧٢]

((**عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسـلم: هـم الذين يصنعون الصور يعذبون يوم القيامه يقال لهم أحيو ما خلقـتم**))[٣٧٣] واتـە: لـە ئیبنو عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێـت) دەڵێـت پێغەمبـەرﷺ دەفـەرمووێت ئەوانەی کار و پیشەی وێنە ئەکەن سزا ئەدرێن لە ڕۆژی دواییدا و پێیان ئەڵێن گیان بکەن بەبەر ئەمانەدا کە دروستتان کردوون.

---

(٣٧١) سورەی الاحزاب ئایەتی ٥٧

(٣٧٢) بڕوانە تەفسیری (الخازن والمدارك) بەرگی ٣ لا ٥١١، وە بڕوانە پەرتووکی (الزواجر عن اقتراف الكبائر) ج٢ لا ٣١٦

(٣٧٣) رواه الشيخان.

**((عن عائشة رضي الله عنها قالت: قدم رسول الله صلى الله عليه وسلم من سفر وقد سترت سهوة لى بقوام(٣٧٤) فيه تماثيل، فلما رآه هتكه وتلوّن وجهه وقال يا عائشة اشد الناس عذباً عند الله يوم القيامة الذين يضاهون بخلق الله. قالت عائشة رضي الله عنها: فقطعناه فجعلنا منه وسادة أو وسادتين))**[٣٧٥] واته: عائیشه (خوای لیٚ رازی بیٚت) دەڵێت: حەزرەت ﷺ تەشریفی له سەفەر هاتەوە، هات بۆ لای ژوورەکەی من، (دەلاقەیەکمان) هەبوو پەردەیەکم پێداابوو، پەردەکە وێنەی پێوە بوو، که پێغەمبەرﷺ ئەوەی دیت دڕاندی و ڕەنگی (مبارەکی) تێک چوو گۆڕا و سەر و چاوی گرژ بوو، فەرمووی: ئەی عائیشه ئەوانەی کە لە دوارۆژا سزا و ئێش و ئازارێکی زۆر (قورسیان) هەیه ئەمانەن که دەیانەوێ لاسایی خوا بکەنەوە له شێوە و وێنەی دروستکراوەکانی ئەو دروست بکەن.. عائیشه دەڵێت: ئنجا پەردەکەمان داماڵی و دادڕاند و سەرینێک یا دوو سەرینمان لیٚ دروست کرد.

**((مَنْ صَوَّرَ صُورَةً فِي الدُّنْيَا كُلِّفَ أَنْ يَنْفُخَ فِيهَا الرُّوحَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَيْسَ بِنَافِخٍ أبدا))**[٣٧٦] له ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لیٚبێت) دەڵێت گوێم له پێغەمبەر ﷺ بووﷺ دەیفەرموو: هەرکەسێ له جیهاندا ڕەسم و وێنەیەک بکێشێ له ڕۆژی دواییدا تۆبزی لیٚ دەکرێ که گیان بکا و بەبەری دا و هەرگیزاوهەرگیز بۆشی ناکرێ گیان بکا به بەريدا.

له فەرموودەیێکی تردا حەزرەتﷺ دەفەرمووێت: خوای گەورە دەفەرمووێت: **((وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذَهَبَ يَخْلُقُ كَخَلْقِي؟ فَلْيَخْلُقُوا حَبَّةً أَوْ لِيَخْلُقُوا شَعِيرَةً أو لِيَخْلُقُوا ذَرَّةً))**[٣٧٧] واته دەبێ کێ لەو کەسه (ظالم) تر بێ واته ستەمکار

---

(٣٧٤) السهوة قيل الطاق في الحائط وقيل الكوة بين الدارين القوام بكسر القام وهو الستر.

(٣٧٥) رواه الشيخان بالفاظ متقارب

(٣٧٦) متفق عليه

(٣٧٧) متفق عليه

تر بێ؟ کە دەچێ دروستکراوێ دروست دەکا وەک دروستکراوی مـن، ئەگـەر ئەوان ڕاست دەکەن فەرموون با ئەوان دەنکـە گـەنمێک دروسـت بکـەن یـان دنکە جۆیەک دروست بکەن یا مێروویەیێ دروست بکەن.

حەزرەت ﷺ لە فەرموودەیێکی تردا دەفـەرمووێت: ((**لَا تَدْخُلُ الْمَلَائِكَةُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلَا صُورَةٌ**))[٣٧٨] واتە فریشتەی ڕەحمەت ناچنە ماڵێکەوە سەگی تیابێ یـا وێنەی گیانلەبەرێکی تیابێ.

**سەرنجێك:**

هەروەها ئەم تاوانەش لە گوناهە گەورەکان ژماردراوە بەڕای زانا گەورەکان، چونکە ڕەسم و وێنەکردنی گیانلەبەران دروست نيیە بە تەواوی چ بە جـۆرێ سێبەری هەبێ وەک هەیکەل لە دار و بەرد و شتی تر یا سـێبەری نـەبێ وەک ئەو نەخشە لەسەر تەختە و قوماش دەکێشێ، بەڵێ وێنەی شتی بێ گیان وەک دار و بەرد و کێو و دەشت و دەریا و ڕووبار و وێنـەی ئەمانـە گونـاه نیـە، وەک شێخی (ابن الحجر) لە کتێبی (الزواجر)دا دەفەرمووێت: (**وأمـا تصـوير صـور الشجر ونحوها مما ليس بحيوان فليس بحرام**). وە ئەگـەر ئەتـەوێ بـە تـەواوی لێـی تێبگەیت بە درێژی لەبارەی ڕەسم و وێنە لە ڕەواو و نـاڕەوادا، بڕوانـە کتێبـی الزواجر دانراوی بەڕێز (**الشيخ ابن الحجر الهيتمي**) بەرگی دووەم لاپەڕە ٣٣.

**(فنسال الله التوفيق لما يحب ويرض إنه جواد كريم)**

---

(٣٧٨) رواه البخاري ومسلم

# تاوانی چل و نۆیەم

## شین و زاری لێدان و کوتان، قژ دەرینان و یەخە دادڕین لەماتەمدا

## (اللطم والنياحة وشق الثوب ونتف الشعر عند المصيبة)

وەرگیراوە لە ڕاستترین کتێبە لەپاش قورئانی پیرۆز لە بوخاری شەریفدا و لە عەبدوڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَطَمَ الْخُدُودَ وَشَقَّ الْجُيُوبَ وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ**))[٣٧٩] واتە لە ئێمە نیە ئەوەی لەسەر مردوو لە ڕومەتەکانی خۆی بدات و یەخەی خۆی دابدڕێنێ و بەسەر مردووەکە هەڵ بدات و بانگەوازی سەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئیسلام بکات.

لە ئەبوموسای ئەشعەرییەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕدرێتەوە دەڵێت: ((**إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَرِئَ مِنْ الصَّالِقَةِ وَالْحَالِقَةِ وَالشَّاقَّةِ**))[٣٨٠] واتە: پێغەمبەرﷺ بەریە و بێزارە لەو ئافرەتانەی کە شین و گرین و هاوار و ڕۆڕۆ دەکەن و سەری خۆیان دەتراشن و قژی خۆیان دەردێنن و یەخەی خۆیان دادەدڕن لەکاتی ڕوودانی ماتەما.

((**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اثنتان في الناس هما بهم كفر، الطَّعْنُ فِي الْأَنْسَابِ النِّيَاحَةُ على الميت**))[٣٨١] لە ئەبوهورەیرەوە دەگێڕدرێتەوە و دەڵێت: حەزرەتﷺ دەفەرموێت: دوو شت هەیە ئەو دوو شتە لە ئینسانا

---

(٣٧٩) رواه البخاري

(٣٨٠) رواه البخاري ومسلم

الصالقة التي ترفع صوتها بالنياحة، والحالقة التي تحلق شعرها وتنتفه عند المصيبة، والشاقة التي تشق ثيابها عند المصيبة، وكل هذا حرام باتفاق العلماء وكذلك يحرم نشر الشعر ولطم الخدود وخمش الوجه والدعاء بالويل والثبور. (ئەمە شەرحی فەرموودەکەیە بە عەرەبی بەیان کراوە (الكبائر))

(٣٨١) رواه مسلم

کـوفرن، یەکـەم (گهعـن لـە نەسـەب دان، دووەم لاوانـەوە لەسـەر مـردوو.)
مامۆستای بەڕێز لە (اقتران النیـرین)دا[٣٨٢] دەفـەرموویّت: یـەعنی ئەمانـە لـە (عەمەلی) کـافران و (ئـەخلاقی) جاهیلیـەتن، یـا (بالنتیجـە) ئەکێشـنە سـەر کوفرکردن بەعزێ کەلیمەی وا ئەڵێن کە کوفر بێ یا کوفرانی (نیعمەتی) خوان یا بەو شەرتە بە (حەلاڵی) بزانن، ئەگینا ئەوانە هیچیان مونافی ئەصـلی ئیمـان نین، ئەمما لە گوناهی گەورەن..

((عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ أَخَذَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ عِنْـدَ الْبَيْعَةِ أَنْ لَا نَنُوحَ))[٣٨٣] لە ئوممو عەگییهوە (ڕەزای خوای لێبێت) پێغەمبەرﷺ پەیمانی لە ئێوە وەرگرت لـە ڕۆژی بەیعـەتا کـە شـیوەن و گـرین و لاوانـەوە نەکەین لەسەر مردوو.

((وفي الصحيحين ان رسول اللهﷺ قال الميت يعذب في قبره بمـا يـنح عليـه)) وەرگیـراوە لـە بوخـاری و موسـلم واتـە بەڕاسـتی حـەزرەتی پێغەمبـەرﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی کە شیوەن و گرینی لەسەر بکـرێ، واتـە (شـیوەن و گرنێکی وا کە لە ئاینی و شەریعەت دەربچێ) لەسەر ئـەو شـیوەن و گرینـەی کە لەسەری دەکرێ ئازار و سزا دەدرێ.

هەروەها حەزرەتﷺ فەرموویـەتی: ((النَّائِحَةُ إِذَا لَمْ تَتُبْ قَبْلَ مَوْتِهَا تُقَامُ يَـوْمَ الْقِيَامَةِ وَعَلَيْهَا سِرْبَالٌ مِنْ قَطِرَانٍ وَدِرْعٌ مِنْ جَـرَبٍ))[٣٨٤] واتـە پێغەمبـەرﷺ ئـەو ژنەی کە شینی و شیوەنە دەکا و (سەردوڵکەبێژە) ئەگەر لە پێش مردنیا تەوبە نەکا و پەشیمان نەبێتەوە، لەڕۆژی دواییدا کە زیندوو دەبێتەوە کراس قەتران و زرێپۆشی ئاگرینی لەبەردایە. (خوا پەنامان بێت).

---

(٣٨٢) ئـەم فەرموودەیـەم بـە شـەرعەوە لـە کتێبـی (اقتران النيرين في مجمع البحرين) وەرگرتـووە، دانـراوی مامۆستا مەلا رشید بەگی باران، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٣٨٩.

(٣٨٣) رواه البخاري

(٣٨٤) رواه مسلم وابن ماجه

**ئاگادارییەك:**

هـەروەها بەڕاسـتی ئـەم تاوانـەش لـە ڕێـز و جوملـەی تاوانـە گـەورەكان ژماردراوە بە دەلیل و بەڵگەی فەرموودەی حەزرەتی پێغەمبەرﷺ، چونكە ئـەو ئافرەتانەی كە شین و شیوەن دەگێڕن، ئەوە بە ئاشكرا ئەوە ئەگێنی كە ئـەوان ناڕازین بە (قەزاو) قەدەری خـوای مـەزن، هـەروەها ئـەوان ئەگـەر پەشـیمان نەبنەوە لە سەردۆلكەبێژتن و شـین و شـیوەن كـردن لەسـەر مـردوو بـە بـەر لەعنەت و نەفرینی خوای گـەورە دەكـەون، وەك حـەزرەتﷺ دەفـەرمووێت: ((عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رضي الله عنه قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ النَّائِحَـةَ وَالْمُسْتَمِعَةَ))[385].

(فنسال الله أن يتوفانا مسلمين ويلحقنا بالصالحين ويعصمنا من النار، إنـه جـواد كريم رؤوف رحيم).

(٣٨٥) رواه ابوداود

# تاوانی پەنجا

## یاخی بوون و لەڕێگا دەرچون (البغي)

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموویت: ((**إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَظْلِمُونَ النَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي الأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ أُوْلَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ**))[٣٨٦] واتە: ڕێگەی لۆمە لەسەر ئەوانەیە کە ستەم لە ئادەمیزاد ئەکەن و زیادەڕەوی ئەکەن لە زەویدا بە ناڕەوا، ئەوە ئەوانە لە پاشەڕۆژا سزایەکی سەختیان بۆ هەیە.

حەزرەتی پێغەمبەریشﷺ دەفەرموویت لە فەرموودەیێکا ((**إِنَّ اللَّهَ أَوْحَى إِلَيَّ أَنْ تَوَاضَعُوا حَتَّى لَا يَبْغِيَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ وَلَا يَفْخَرَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ**))[٣٨٧] واتە بەڕاستی خوای گەورە (وەحی) و نیگای کردووە بۆ لام کە بە خەڵک ڕابگەیەنم کە خۆیان بە کەم بگرن بۆ ئەوەی کەس فیز بەسەر کەس دا نەکا و کەس خۆی هەڵنەکێشێ و زوڵم لە کەس نەکا.

هەروەها برا موسوڵمانەکان بەڕاستی خوای مەزن لەپاش ئەوە کە باسی ئەو بێباوەڕانەی بۆ حەزرەتﷺ کرد لە قورئانی پیرۆزدا، ئنجا ویستی بەسەرهاتی هەندێ ئینسانی گومڕای زەمانی پێشوو بکا کە بە ماڵێ دنیا و دارایی لەخۆبایی بوون، وەکوو (قاروون)، چونکە بەهۆی لەخۆبایی و ستەم کردنی لە موسا پێغەمبەر ﷺ و گەلەکەی نوقومی ژێر زەوی کرا، هەروەک خوای گەورە ئەم باسەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموویت: ((**إِنَّ قَارُونَ كَانَ مِنْ قَوْمِ مُوسَى فَبَغَى عَلَيْهِمْ وَآتَيْنَاهُ مِنَ الْكُنُوزِ مَا إِنَّ مَفَاتِحَهُ لَتَنُوءُ بِالْعُصْبَةِ أُولِي الْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُ قَوْمُهُ لاَ تَفْرَحْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْفَرِحِينَ**)) واتە بەڕاستی قاروون لە کۆمەڵی موسا بووە و دارا و دەوڵەمەند بوو، دوایی لەخۆبایی و گومڕا بوو، داوای گەورەی خۆی کرد

---

(٣٨٦) سورەتی ئوری ئایەتی ٤٢

(٣٨٧) رواه مسلم وابوداود وابن ماجه

لە سەر ئەوان، ئنجا ئەوەندەمان ماڵ و سامان و دارایی دابوێ کـە هـەر کلیلـی دەرگای خەزێنەکانی ئەوەندە قورس بوون بە کۆمەڵێکی بـەهێز بـە زەحمـەت هەڵیان دەگرتن. ئەنجا گەلەکەی پێیان ووت بە ماڵ و سامانی دنیا کـە هەتـە کەیف خۆش مەبە، چونکە بەڕاستی خوای گەورە ئینسانی وای خۆش ناوێ کە بە ماڵ و سامانی دنیا کەیف خۆش ببێ. ((**وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الآخِـرَةَ وَلاَ تَنسَ نَصِيبَكَ مِنْ الدُّنْيَا وَأَحْسِنْ كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ وَلاَ تَبْغِ الْفَسَادَ فِـي الأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ**)) واتە: داوا بکە لەو ماڵی کە خودا بەتۆی داوە بەهەشـت بەهۆی بەخت کردن لە (**طاعەت**) و خۆت لە دونیـا بێبـەش مەکـە لـە خێـر و چاکە (ئەگەر نـا لـە دواڕۆژدا بێبـەش دەبـی)، چـاکە لەگـەڵ خـەڵکی بکـە، هەروەک چۆن خوا چاکەی لەگەڵ کردووی، هەرگیز شـوێنی خراپـە مەکـەوە لەسەر زەوی، چونکی بێگومان خوای گـەورە بـەدکاران سـزا دەدا و خۆشـی نـاوێن. ((**قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِنْ قَبْلِـهِ مِـنْ الْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا وَلاَ يُسْأَلُ عَنْ ذُنُوبِهِمْ الْمُجْرِمُـونَ**)) واتـە: قاروون لە وەڵامی ئەوەدا کە پێیان گوت چاکە بکە لەگەڵ خەڵکدا وەکو خـودا چاکەی لەگەڵدا کردووی، ووتی: من ئەم ماڵ و سامانەم لەسەر بناغەی زانستی خۆم دەست کەوتووە و بەزانایی و ئازایی خـۆم پەیـدام کـردووە. ئـەنجا خـوای مەزن بەرپەرچی ئەو قسـەیەی ئەداتـەوە و دەفـەرمووێت: ئایـا قـاروون نازانـێ لەپێش ئەودا خودا لە خەڵکی چەرخە پێشوەکان چەندی لەناوبرد لەوانەی کـە لەو بەدەسـەڵاتتر و بـەهێزتر بـوون و کۆمەڵـە و بەستەیشـی زۆرتـر بـوون؟ وە تاوانبارەکانی هاتنە سـەر لەناوچـوون وەختـی لـەناوبردنیان هـات پرسـیار لـە تاوانیان ناکرێ. ((**فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ فِي زِينَتِهِ قَالَ الَّذِينَ يُرِيدُونَ الْحَيَاةَ الدُّنيَا يَالَيْـتَ لَنَا مِثْلَ مَا أُوتِيَ قَارُونُ إِنَّهُ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ، وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ اللَّـهِ خَيْرٌ لِمَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا وَلاَ يُلَقَّاهَا إِلاَّ الصَّابِرُونَ**)) واتە: پاش ئەوە پەند دادان و

دەرزەڕۆژێ قارون بەجوانی و کەشخەو بەرگ و پۆشاکی نایابەوە و لەگەڵ دەستەو بەستەیا چوە دەرەوە بەناو خەڵکدا گەڕا، ئنجا ئەو کەسانە کە هەر ژیانی دنیایان دەویست وتیان کاشکێ ئێمە لەماڵی دنیادا وێنەی ئەوەمان ببوایە کە دراوە بە قاروون، بەڕاستی قاروون بەشێکی گەورەی هەیە، ئەوانەیش کە زانیاری بە کەڵکیان هەبوو شتێکیان لە ئایینی ئەزانی وتیان: هاوار بۆ ئێوە (ماڵتان وێران بێ) بیر لەچی ئەکەنەوە؟ ئەمە هیچ نیە، خێر و پاداشی لای خودا لە پاشەڕۆژا زۆر لەمە چاکترە بۆ کەسێ کە باوەڕی کردبێ و کردەوەی باشی هەبێ، بەڵام ناگا بەم پلەیە ئەوانە نەبێ کە خۆگرن لەسەر تەرکی شتی حەرام و کردنی شتی چاک. ((**فَخَسَفْنَا بِهِ وَبِدَارِهِ الأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُ مِنْ فِئَةٍ يَنصُرُونَهُ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَمَا كَانَ مِنْ الْمُنْتَصِرِينَ**))[٣٨٨] واتە: ئەنجا قارون بەخۆی و خانووبەرە و ماڵ و سامان و دارایيیەوە رۆمان برد بەناخی زەویدا و کەسیش نەبوو هیچ کۆمەڵێ نەبوو لە سزای خودای ڕزگار بکا و خۆشی لەوانە نەبوو کە خۆی بگرێ و خۆی لەو سزا دەرباز بکا.[٣٨٩]

**سەرنجێك:**

هەروەها ئەم تاوانەش لە ڕێز و جوملەی تاوانە گەورەکان ژماردراوە، چونکە بەڕاستی یاخيبوون لە یاسا و ڕێگەی خودا لە تاوانە مەزنەکانە، یاخی بوون لە پێشەوای موسوڵمانان بە مەرجێک دادپەروەربێ بەڕای زاناکان لە تاوانی گەورەیە.

---

(٣٨٨) سورەتی القصص ئایەتی ٧٦ تا ٨١

(٣٨٩) بڕوانە تەفسیری نامی، بەرگی پێنجەم، لاپەرە ٥٢٧.

(اللهم انك اذا أقبلت سلمت وإذا عرضت أســلمت وإذا وقعــت الهمــت وإذا خذلت ألهمت، اللهم اذهب الظلمة ذنوبنا بنور معرفتك وهداك وجعلنا ممــن أقبلــت عليه فارض عمن سواك واغفر لنا ولوالدينا وسائر المسلمين آمين)

# تاوانی پەنجاو یەک

## درێژدادڕی و زیان گەیاندن بە
## ئینسانی بێچارە و بەندە و کنیزە و ئافرەت و گیانلەبەراندا
## (الاستطالة على الضعيف والمملوك والجارية والزوجة والدابة)

لە کتێبی (الكبائر)دا دەفەرمووێت: (**إن الله تعالى قد أمر بالإحسان عليهم بقوله تعالى**) واتە چونکە بەڕاستی خوای مەزن فەرمانی کردووە بە چاکە کردن لەگەڵیانا وەک دەفەرمووێت: ((**وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَبِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بِالْجَنبِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ مَنْ كَانَ مُخْتَالاً فَخُورًا**))[390] واتە: خودای گەورە بپەرستن بە تاک و تەنیایی و بە هیچ جۆرێک شەریک و هاوڕێ و هەواڵی بۆ دامەنێن و چاکە بکەن لەگەڵ دایک و باوکتانا، هەروەک چۆن ئەوان چاکەیان کردووە لەگەڵتانا، وە چاکە بکەن لەگەڵ خزم و کەس و کار و، چاکە بکەن لەگەڵ (هەتیو) منداڵی بێباوکی موسوڵمان و، بە مسکێن و بێچارە و هەژار و، چاکە بکەن لەگەڵ دراوسێیەکدا کە خاوەن خزمایەتی بێ و دراوسێیەک کە بێگانە بێ و، چاکە بکەن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە وان لە تەنیشتی ئێوەدا و لەگەڵتانا رائەبوێرن وەکو هاوڕێی سەفەر و هەر هاوڕێیەکتان بێ لە هەر شوێن و کارێکدا، هەندێ لە موفەسیرەکان فەرموویانە (الصاحب بالجنب) واتە هاوڕێی تەنیشت، مەبەستی ژنی ئینسانە، واتە چاکە بکەن لەگەڵ ژنەکانتانا و باش رابوێرن لەگەڵیانا لەوتارا و لە ڕەفتارا کارێ وا مەکەن لێتان وەڕس بن، چاکە بکەن لەگەڵ

---

(٣٩٠) سورەتی النساء ئایەتی ٣٦

موسافیرەکان و ڕێبوارانا و، لەگەڵ میوانا و، چاکە بکەن لەگەڵ بەندە، واتە ئەگەر ئینسانێ کەوتە (موڵکی) ئێوەوە لە پیاو یان لە ژن ڕەفتارتان باش بێ لەگەڵیانا و بەوەی کە دەستەکانی ئێوە دەیگاتێ (لە عەبد و لە حەیرانی مەملوک). واتە بەڕاستی خودای گەورە خۆشی ناوێ ئەو کەسانەی کە خاوەن فیزن و عەیب و عاریان لێ دێ کە خزمەت و یارمەتی ئینسانی داماو بدەن.

موعازی کوڕی جەبەل (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: ((**كُنْتُ رَدِيفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ على حمار فقال: يا معاذ. قلت: لبيك وسعديك يا رسول الله**)) واتە من سواری گوێدرێژێ بووبووم لە پاشکۆی حەزرەتدا ﷺ فەرمووی: ئەی موعاژ، گوتم: بڵێ قوربان لە خزمەتت دام ئەی خۆشەویستی خودا. ((**قَالَ: أَتَدْرِي مَا حَقُّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ ومَا حَقُّ العباد عَلَيْهِ؟ قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ**)) واتە: ئایا دەزانی ماف و هەقی خودا لەسەر بەندەکانی خۆی چی‌یە؟ و ماف و هەقی بەندەکانیش لەسەر خودای خۆیان چی‌یە؟ گوتم خوا و پێغەمبەری خودا دەزانن. ((**قَالَ فَانْ حَقُّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ يَعْبُدُوهُ وَلا يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَحَقُّ العباد على الله أَنْ لا يُعَذِّبَ من لا يشرك به شيئاً**))[391] واتە: فەرمووی مافی خودا لەسەر بەندەکان ئەوەیە کە هەر خوا بپەرستن و بەهیچ جۆرێک هاوبەشی بۆ دانەنێن، مافی بەندەکانیش لەسەر خودای گەورە ئەوەیە کە هەرکەسێ هاوبەشی بۆ پەیدا نەکا ئازار و سزای نەدا لە قیامەتا.

هەروەها لەبارەی ئاگاداری دراوسێ حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: ((**مازال جبريل يوسيني بالجار حتى ظننت أنه سيورثه**))[392] واتە حەزرەتی جبرائیل سەلامی خوای لەسەر بێت، ئەوەندە ئامۆژگاری و باسی دراوسێی بۆ کردن، تا وام ئەزانی دراوسێ بە خزم و خۆێش دائەنرێ و (إرث) واتە کەلەپوور لە دراوسێ ئەبات.

---

(٣٩١) هذا الحديث في الصحيحين وغيرهما من طرق متعددة.

(٣٩٢) رواه ابوداود وابن ماجة من حديث عائشة ورواه (خ م ت) من حديث ابن عمر (رضي الله عنهما).

**باسێك:**

هەروەها لەبارەی بەندە و كنێزەوە ئەو شتانەی كە لەژێر دەستی ئینساندان حەزرەتﷺ دەفەرمووێت: ((لا يدخل الجنة سيء الملكة))[٣٩٣] واتە: ناچێتە بەهەشت كەسێک خراپ بێت لەگەڵ بەندە و كنێزە و ئەم شتانەی كەوا لەبەر دەستیایە، چونكە بەڕاستی زۆر گوناهە ئینسان خراپە لەگەڵ بەندە و كنێزە بكات یا لێكیان جیابكاتەوە، هەروەک پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الْوَالِدَةِ وَوَلَدِهَا فَرَّقَ اللَّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَحِبَّتِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ))[٣٩٤] واتە: هەركەسێ لەم جیهانەدا دایک و ئەولاد واتە بەچكە لەیەک دووربخاتەوە، خوای گەورەش لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو دوور دەخاتەوە لە دۆست و خۆشەویستانی خۆی.

هەروەها ئیمامی (عەلی) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: ((وهب لي رسول اللهﷺ غلامين أخوين فبعت أحدهما، فقال رسول اللهﷺ ردّه رُدّه))[٣٩٥] واتە: پێغەمبەرﷺ دوو بەندەی پێم بەخشی بە دیاری، هەردووكیان برا بوون، یەكێكیانم فرۆشت، پێغەمبەرﷺ فەرمووی (موعامەلەكە) هەڵوەشێنەوە، (موعامەلەكە) هەڵوەشێنەوە، ئەم وتەیەی دووبارە كردەوە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((من ضرب بسوط ظلماً اقتص منه يوم القيامة))[٣٩٦] واتە: هەركەسێک بە ستەم لە هەر شتێک بدات بە (ناهەق) بە دار دەست و شتی تر، خوای گەورە تۆڵەی لە ڕۆژی قیامەتدا لێی دەستێنێتەوە.

((قيل لرسول الله صلى الله عليه وسلم: كم تعفو عن الخادم؟ قال: في اليوم سبعين مرة))[٣٩٧] واتە: پرسیاریان كرد لە پێغەمبەرﷺ ڕۆژێ چەن جار لە خزمەتكار دەبووری؟ حەزرەتﷺ لە وەڵامدا فەرمووی ڕۆژێ حەفتا جار.

---

(٣٩٣) رواه احمد وابوداود

(٣٩٤) رواه الترمذي والحاكم

(٣٩٥) رواه الترمذي

(٣٩٦) رواه البزار والطبراني

**باسێك:**

هـەروەها پێویسـتە بەنـدە و کنێـزە و ئـاژەڵ و پەلـەوەر ...هتـد. بـە هـیچ شێوەیەک تێنی و برسییان نەکەین بە تایبەتی گیانـداری بەسـەزمان، چـونکە توانای دەربڕینی ئێش و ئازاری نیيیە بە پێچەوانەی ئـادەمی. هـەروەها ئەگـەر ئێمە ووردبینەوە لە فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ زۆربەی فەرموودەکان هانمـان دەدەن بە بەزەیی هاتنەوە، چـونکە بەڕاسـتی حـەزرەتﷺ هەمیشـە بـەزەیی هاتۆتەوە بە ئاژەڵ و بە گیانداراندا و بەباشی لەگەڵیاندا جووڵاوەتەوە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ باسـی ئافرەتێکمـان بـۆ دەکـا بـەهۆی بێبەزەییـەوە چووەتە ناو ئاگرەوە وەک دەفەرمووێت: ((**دَخَلَتْ امْرَأَةٌ النَّارَ فِي هِرَّةٍ رَبَطَتْهَا حَتَّـى مَاتَتْ جوعا، لا هِيَ أَطْعَمَتْهَا وسقتها إذ حبستها وَلَا تركتهَـا تَأْكُـلُ مِـنْ خَشَـاشِ الأَرْضِ**))[٣٩٨] أي حشراتها- واتە ژنێک بەهۆی پشیلەیەکەوە چۆتە نـاو ئـاگری دۆزەخەوە کە بەسـتوویەتییەوە تـا مـردووە لـە برسـان، هیچـی نـەداوەتێ نـە خواردن و نە خواردنەوە، نە بەرەڵای کردووە تا بۆ خـۆی جانـەوەری نـاو زەوی بخوات.

((**وفي صحيح أنهﷺ راى إمرأة معلقة في النار والهرّة تخدشها في وجهها وصـدرها وهي تعذبها كما عذبتها في الدنيا بالحبس والجوع**))[٣٩٩] واتە لـە صـحیحی بوخاریـا دەگێڕێتەوە کە حەزرەتﷺ لە خەوا دیتوویێتی یا لە شەوی معراجا بینیـوێتی کـە ئافرەتێـک هەڵواسـرابوو لـەنا ئـاگرا، پشـیلەیەک سـەر و ڕو و سـینگی دەڕناندەوە، پشیلەکە سزای ئەدا هەروەک چۆن ئافرەتەکـە سـزای پشـیلەکەی ئەدا لە دنیادا بە بەستنەوە و قەدەغەکردنی لە خواردن تا مرد لە برسان.

---

(٣٩٧) رواه ابوداود والترمذي

(٣٩٨) رواه البخاري ومسلم

(٣٩٩) رواه البخاري

(**وهذا عام في سائر الحيوان وكذلك إذا حملها فوق طاقتـــها تقـــتص منـــه يـــوم القيامة**)[٤٠٠] واته ئەم فەرموودە گشتي‌یە بۆ هـەموو جـۆرە ئاژەڵێـک، هـەروەها ئەگەر باری قورسیان لێ بار بکەیت زیـاد لـە هێـزی ئەوانـەوە. خـوای گـەورە هەقەسا و تۆڵەی لێ دەسێنێتەوە لە ڕۆژی دواییدا.

هەروەها پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیێکا دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: ((**بَيْنَمَـــا رَجُلٌ يَسُوقُ بَقَرَةً إذ ركبهَا فضربها، فَقَالَتْ إِنَّا لَـــمْ نُخْلَـــقْ لِهَـــذَا وَلَكِنَّـــي خُلِقْنَـــا لِلْحَرْثِ**))[٤٠١] واته: پیاوێ مانگایەکی کردبوو بە گاچووت لێی دەخـوڕی بـاری لێنابوو سواری ببو و لێی دەدا، مانگاکە بە زمان هات و ووتـی: مـن بـۆ ئەمـە دروست نەکراوم، بۆ ئەمە دروستکراوم کە جووتم پێبکرێ. (**فهذه بقرة أنطقها الله في الدنيا تدافع عن نفسها بأنها لا تؤذى ولا تستعمل في غير ما خلقت له، فمن كلفها غير طاقتها أو ضربها بغير حق، فيوم القيامة تقتص منه بقدر ضربه وتعذيبه**) واتـە: ئـا ئەمە کارێکی زۆر سەیری، خوای گەورە ئەم مانگایەی بەزمان هێنا و هـەر لـە دنیادا بۆ ئەوەی بەرگری لە گیانی خۆی بکات، بۆ ئەوەی ئازار نـەدرێت و ئـەو کارو ئیشەی پێنەکرێت مەگەر بۆ ئەوەی ئەبی کە بۆ ئەو کـارە خـەڵق کرابـێ بۆی و هەر کەسێک بەزۆر بکات زیاد لـەهێزی ئەوانـە یـا لێیـان بـدات بـەبێ هەق، ئا ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە تۆڵە و هەقیان لێ وەردەگرێتـەوە بە ئەندازەی لێدان و سزاکە.

**سەرنجێك:**

هەروەها درێژدادڕی و زیان گەیاندن بـە ئینسـانی بێچـارە و هـەژار وەک کۆیلە و کنێزە و نۆکەر و کارەکەر و ئافرەت و ئاژەڵ و گیانلەبەراندا و پەڕەوڵ و

---

(٤٠٠) بڕوانە کتێبی (الكبائر) لاپەڕە ٢٣٦ دانراوی بەڕێز الإمام الحافظ محمد بن احمد بن عثمان الذهبي.
(٤٠١) رواه البخاري ومسلم

ئەو شتانەی کە دەستی مرۆڤ دەیان گاتیٚ و لەژێر دەستی ئینساندان، ئەمانە ئەگەر بەخراپی لەگەڵیان بجوولێتەوە ئەمە لە تاوانە گەورەکان دەژمێردرێن بەڕای هەموو زاناکان، هەروەها برسيکردنیان و ئازاردانیان لە گوناهە گەورەکانە وەک پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت لە فەرموودەیەکدا ((**كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يَحْبِسَ عَمَّنْ يَمْلِكُ قُوتَهُ**))(٤٠٢) ولفظه ((**كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُضَيِّعَ مَنْ يَقُوتُ**))[٤٠٣] واتە ئەوەندە گوناهە بەسە (بۆ گێرخواردن لە رۆژی قیامەتدا) بۆ ئینسان کە کەمتەرخەمی بکات لەگەڵ ژێردەستەکانيدا، ئەوانەی ژیان و رۆزیيان لەسەریەتی بیان خاتە پشت گوێ.

**(اللهم اجعلنا من حزبك المفلحين واجعلنا من عبادك الصالحين الشاكرين الفائزين)**

---

(٤٠٢) رواه مسلم وابوداود

(٤٠٣) رواه ابوداود

# تاوانی پەنجاو دووەم

## ئازاردانی دراوسێ (اذى الجار)

خـوای گـەورە لـە قورئانـدا دەفـەرموویت: ((وَالْجَـارِ ذِي الْقُرْبَـى وَالْجَـارِ الْجُنُبِ))[٤٠٤]، هەروەها حەزرەتی پێغەمبەرﷺ دەفـەرموویت: ((وَاللَّهِ لَـا يُـؤْمِنُ وَاللَّهِ لَا يُؤْمِنُ وَاللَّهِ لَا يُؤْمِنُ. قِيلَ: مَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَـالَ: مـن لَـا يَـأْمَنُ جَـارُهُ بَوَائِقَهُ))(٤٠٥) ((لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ لَا يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَائِقَهُ))[٤٠٦] واتـە: سـوێند بـەخوا باوەڕی نیە قەسەم بەخوا باوەڕی نیە سوێند بەخوا باوەڕی نیە (واتە موسوڵمانی ڕاستی نیە). گوتیان کێ ئەی پێغەمبەری خـوا؟ فـەرمووی ئـەو کەسـەی کـە دراوسێی لە خراپەی بترسێ و لێی ئەمین و دڵنیا نـەبێ.. وە لـە ریوایـەتێکی تردا دەفەرموویت هەرکەسێ دراوسـێی ئـەمین و دڵنیـا نـەبێ لـە کـردەوەی خراپی ئەو ئەمە ئەو کەسە ناچێتە بەهەشتەوە. (پەنا بەخوا)

هەروەها عەبدوڵای کوڕی مەسـعود (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەفـەرموویت: ((سُئل رسول الله صلى الله عليه وسلم عن أعظم الذنب عند الله، فذكر ثلاث)) واتـە: پرسیاریان کرد لە پێغەمبـەرﷺ چ تاوانێـک لـەلای خـوا گـەورەترین تاوانـە؟ حەزرەتﷺ باسی سێ (خەسڵەت) تاوانی کرد فەرمووی: ((أَنْ تَجْعَلَ لِلَّـهِ نِـدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ وَأَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ خشية أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ وأَنْ تُزَنِيَ بِحَلِيلَةِ جَارِكَ))[٤٠٧] واتـە یەکەم شـەریک و هـەواڵ بـۆ خـودا دابنـێ و کـە دروسـتی کـردووی، دووەم

---

(٤٠٤) سورەتی النساء ئایەتی ٣٦
ئەم ئایەتە لە پێشەوە ماناکەی تەفسیر کرا بیخوێنەرەوە.
(٤٠٥) بوائقه اي غوائله وشروره.
(٤٠٦) رواه البخاري ومسلم
(٤٠٧) رواه البخاري ومسلم والترمذي

ئەولادی خۆت بکوژی لەبەر هەژاری یا لەبەر ئەوەی کە نانت لەگەڵ بخوات، سێیەم زینا و داوێن پیسی بکەی لەگەڵ ژنی (جیران) و دراوسێت.

لە فەرموودەیێکی تردا حەزرەتﷺ دەفەرمووێت: ((مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلَا يُؤْذِي جَارَهُ))[٤٠٨] واتە: هەرکەسێ باوەڕی بەخوا و بە ڕۆژی قیامەت هەیە با ئازاری جیرانی واتە دراوسێی نەدات.

**باسێك:**

هەروەها پێویستە دراوسێ خۆگر بێت بە بەرامبەر بە شەڕ و خراپەی دراوسێیەکەی، چونکە ئەگەر دراوسێ قەبوڵ بکات ئێش و ئازاری دراوسێکەی ئەمە بە چاکە لە قەڵەم ئەدرێ لەلای خوا و پێغەمبەرەوەﷺ، هەروەها دەگێڕنەوە ((**جاء رجل إلى النبيﷺ فقال يا رسول الله دلني على عمل إذا عملت به دخلت الجنة، فقال كُن محسناً. فقال: يا رسول الله، كيف اعلم أني محسن؟ قال: سل جيرانك، فإن قالوا إنك محسن فانت محسن، وإن قالوا إنك مسيء فانت مسيء**))[٤٠٩] واتە: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەرﷺ عەرزی پێغەمبەری کرد ووتی پێم بڵێ و پێم نیشان دە کردەوەیەکی ئەوها کە پێی بچمە بەهەشتەوە. حەزرەتﷺ فەرمووی چاکەکەر بە. وتی: بە چ شێوەیەک دەزانرێ کە من چاکەکەرم؟ فەرمووی بپرسە لە دراوسێ، ئەگەر پێیان باش بووی ئەوە لەلای خوا و پێغەمبەریشﷺ باشی، ئەگەر گوتیان خەراپی ئەوە لەلای خوا و پێغەمبەریش بە خراپ لەقەڵەم ئەدرێی.

هەروەها لە (سنن)ی ئەبوداودەوە ئەگێڕێتەوە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: ((**جاء رجل إلى رسول اللهﷺ يشكوه جاره، فقال له: أذهب فأصبر.. فاتاه مرتين أو ثلاثاً، ثم قال: أذهب فأطرح متاعك على الطريق، ففعل.**)) واتە پیاوێک هاتە لای پێغەمبەرﷺ گلەیی و ناڕەزایی دەربڕی

---

(٤٠٨) متفق عليه

(٤٠٩) رواه البيهقي

بەرامبەر بە دراوسێکەیان، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو بڕۆ و سەبر و ئارام بگـرە. پیاوەکە لەسەر فەرموودەی پێغەمبەرﷺ گەڕایەوە بۆماڵەوە و سـەبر و ئـارامی گـرت لەسـەر خەراپـەی دراوسـێکەی، بـەلام دراوسـێکەی زیـاتر خراپـەی دەربارەی کرد.. دوو سێ جار پیاوەکە هاتەوە لای پێغەمبەرﷺ، ئنجا لە دوایـی حەزرەتﷺ فەرمووی: بڕۆ بۆ ماڵەوە کـەل و پەلەکـەت دەربێنـە و لـە ڕێگـادا فڕێی بدە و بلاوی بکەوە. پیاوەکە وا کـرد. ((**فجعل الناس يمرّون به ويسألونه عن حاله فيخبرهم خبره مع جاره، فجعلوا يلعنون جاره ويقولون فعـل الله بـه وفعـل ويدعون عليه. فمر عليه جاره وقال يا أخي ارجع الى منزلك، فإنك لن ترى ما تكـره أبداً**))[410] واتە: ئنجـا خـەڵکی بـەلای پیاوەکـەدا تێپـەڕین و ئـەوەیان بینـی و پرسیاریان لێکرد بۆچی ماڵەکەت وەها پەرش و بلاو کردۆتەوە لـەو ڕێگایـەدا؟ ئەمیش وەلامی دانەوە گوتی دراوسێکەم سزام ئەدا و خەراپەم لە گەڵ دەکات، منیش وام کرد (چونکە خانووەکەم چۆل کردووە، جێگەم نیيـە تـاکو تیـابم و شتەکانم لەو کۆلانەدا داناوە)، ئنجا خەڵکەکە لەعنەت و نەفرینێکی زۆریـان لـە دراوسێکەی و بە خراپە ناویان دەبرد، ئنجا کاتێ دراوسـێکە بەمـەی زانـی وا خەڵکەکە ناوی بە خراپە دەبەن لە کردەوەی خراپەی خۆی پەشـیمان بـوەوە و چو بۆ لای دراوسێکەی خۆی و گوتی وەرە برام بگەڕێوە بۆ ماڵەکـەی خـۆت، لێم ببورە بەڵێن بێت جارێکی تـر لـەلای منـەوە هـیچ جـۆرە ناخۆشـیيەکت پێنەگات، من سزای تۆ ناکەم.

هەروەها حەزرەتی پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت لە فەرموودەیەکتی تردا: ((**لأَنْ يَزْنِيَ الرَّجُلُ بِعَشْرَةِ نِسْوَةٍ أَيْسَرُ عَلَيْهِ مِنْ أَنْ يَزْنِيَ بِامْرَأَةِ جَارِهِ ولأَنْ يَسْرِقَ الرَّجُلُ مِنْ عَشْرَةِ أَبْيَاتٍ أَيْسَرُ عَلَيْهِ مِنْ أَنْ يَسْرِقَ مِنْ جَارِهِ**))[411] واتە: بەڕاستی ئەگـەر مـرۆڤ

---

(٤١٠) رواه ابوداود

(٤١١) رواه الإمام احمد والطبراني عن المقداد بن الأسودؓ

داوێن پیسی بکا لەگەڵ دەژنانی بێگانەدا تاوانی کەمترە نەک لەگەڵ تاقە ژنی دراوسێ زنا واتە داوێن پیسی بکا، یان مرۆڤ ئەگەر دزی بکا و لە دە مالان تاوانی کەمترە نەک دزی بکا لە ماڵی دراوسێ.

**تێبینی:**

هەروەها ئەم تاوانەش لە ڕێز و جوملەی تاوانە گەورەکان ژمارداروە بەڕای زاناکان، چونکە بەڕاستی ئازاردانی دڵی دراوسێ چ ئازاری زۆر و چ ئازاری کەم لە تاوانە مەزنەکانە، هەرچەندە دراوسێکەش گاور و جوولەکە بێ. شێخی ئیبنو حەجەر لە کتێبی (الزواجر)دا دەڵێت: هەق وایە لەگەڵ دراوسێ (کافریش) دا چاکە بکرێ، چونکە ئەم چاکەکردنە دەبێتە هۆی خەیر و ئیحسان.

**(فنسأل الله أن يهدينا وإياكم لأحسن الأخلاق والأعمال والأقوال وأن يحسن عاقبتنا إنه جواد كريم رؤوف رحيم، وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم)**

# تاوانی پەنجاو سێ

## ئازاردانی موسوڵمانان و جنێو پێدانیان و پاش ملە ناوهێنانیان بە خراپە

## (أذى المسلمين وشتمهم والغيبة عليهم)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفـەرمووێت: ((**يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ يَسْخَرْ قَومٌ مِـنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنهُمْ وَلاَ نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءِ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْـرًا مِـنهُنَّ وَلاَ تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ وَلاَ تَنَابَزُوا بِالأَلْقَابِ بِئْسَ الاِسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الإِيمَانِ وَمَنْ لَـمْ يَتُـبْ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الظَّالِمُونَ**))[٤١٢] واتە ئەی ئەو کەسانەی کـە باوەڕتـان بـە خـوا و بـە پێغەمبەری خودا کردووە، با کۆمەڵێ لـە پیـاوان گاڵتـە نـەکا بـە کۆمـەڵێ لـە پیاوان، لەوانەیە کە گاڵتەپێکراوەکان لـە گاڵتەکـەرەکان باشـتر بـن، تانـە لـە خۆیان مەکەن، واتە کاتێ یەکێ لە ئێوە تانە لە یەکێکی تر بدا، وەکو ئەوە وایـە کە تانەی لە خۆی دابێ، چونکی موسوڵمانان وەکو یەک نەفس وەهان.. یـاخود مادام کە تۆ تانە لەو بدەی، ئەویش تانە لە تۆ ئەدا و ئیشەکە وای لێـدێ وەک ئەوە وایە کە خۆت قسـەت بـەخۆت وتبـێ و خۆتـت سـووک کردبـێ. نـاتۆرە بۆیەکتر فڕە مەدەن و گازی یەکتریتان بە (لەقـەبی) نـاخۆش بـانگ مەکـەن، وەکو (یا فاسق و یا کافر مپلا).. چونکە زۆر ناشیرینە ناووناتۆرە و قسەیەک کـە پێچەوانەی یاسای ئیسلام بێ دوای ئەوەی کە ئینسان باوەڕی کرد و بـە ئـاین خۆی پاک کردەوە، هەرکەس (تۆبە) لەم کارانـە نـەکا ئـەوە لـە سـتەم کـاران ئەژمێردرێت.

---

(٤١٢) سورەتی الحجرات ئایەتی ١١

هەروەها خوای گەورە لە دوایی ئایەتەکەدا دەفـەرموویت: ((**وَلاَ تَجَسَّسُوا وَلاَ يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّـهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ**))[٤١٣] واتە سیخوڕی و جاسوسی یەکتر مەکەن و لە پـاش ملـە باسی یەکتر مەکەن، با هەندێکتان ناوی هەنـدێکتان نـەهێنێت، ئایـا یـەکێک لەئێوە حەزدەکات گۆشتی برای خۆی بە مردوێتی بخوات؟ دیارە ئێوە حەز لـە شتی وا ناکەن، واتە (پاش ملە غەیبەت کردن لە ڕێزی خواردنی گۆشتی برایـە و پێویستە لە خوا بترسن و خۆتان بپارێزن لەو شتانەی کە خوا پێی ناخۆشـە و بزانن خوا پەشـیمانی بەنـدەی خـۆی وەردەگـرێ، هەرکەسـێک بێـت خـوا خاوەنی بەزەیی‌یە بۆ ئادەمیزاد.

هەروەها پێغەمبەریشﷺ دەفەرموویت: ((**إنَّ مِنْ شَرِّ النَّاسِ منزلة عندالله يـوم القيامة مَنْ وَدَعَهُ النَّاسُ أَوْ تَرَكَهُ النَّاسُ اتِّقَاءَ فُحْشِهِ**))[٤١٤] واتە: بەڕاسـتی خراپتـرین مرۆڤ لای خوا ئەو کەسەیە لە ڕۆژی قیامەتدا کە ئینسانێکە وازی لێ بهێنـرێ لەبەر خراپی یـا خـەڵک ئامۆژگـاری ئەکـەن و خۆیـان لێـی بپـارێزن لەبـەر خراپەی ئەمەوە.

حەزرەتﷺ لە فەرموودەیێکی تردا دەفـەرموویت: ((**كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ دَمُهُ وَمَالُهُ وَعِرْضُهُ**))[٤١٥] واتـە خـوێن و نـاموس و مـاڵ و سـامانی هـەموو موسوڵمانێک لە یەکتر قەدەغە کراوە.

لە فەرموودەیەکی تردا دەفـەرموویت: ((**الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْـلِمِ لا يَظْلِمُـهُ وَلا يَخْذُلُهُ وَلا يَحْقِرُهُ بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنْ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِـرَ أَخَـاهُ الْمُسْـلِمَ**)).[٤١٦] واتـە موسوڵمان برای موسوڵمانە، خۆی زوڵمی لێ ناکا و پشتی بەرنادات، ناشی داتـە

---

(٤١٣) سورەی الحجرات ئایەتی ١٢

(٤١٤) رواه البخاري

(٤١٥) رواه مسلم

(٤١٦) رواه مسلم

دەست کەس کە ئەزیەتی بدا و، بەسووکی تەماشای نەکات، ئەوەندە خراپە بۆ کەسێک بەسە کە برای موسوڵمانی بە سووک بزانێت.

دیسان دەفەرمووێت: ((سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ وَقِتَالُهُ كُفْرٌ))[417]

((عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ فُلَانَــةَ تصــلي وتصــوم وتُؤْذِي جِيرَانَهَا بِلِسَانِهَا؟ فقَالَ لا خير فيها، هِيَ فِي النَّارِ))[418] واتــە دە گێڕنــەوە لــە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێــت: عــەرزی پێغەمبــەریان ﷺ کــرد بەڕاستی ئافرەتێک هەیە بەڕۆژ بەڕۆژوو دەبێت و بەشــەو نوێــژ دەکــات، بــەڵام لەگــەڵ ئەوەشــدا ئــازاری دراوســێ ئــەدا بــە زبــان؟ حــەزرەت ﷺ لــە وەڵامــدا فەرمووی: هیچ (خێر و پاداشی) نیە ئەو ژنە بۆ ناو ئاگرە.

هەروەها حەزرەت ﷺ لە فەرموودەیێکی تــردا دەفــەرموێت بــە هاوڕێیــانی (خوایان لێ ڕازی بێــت): ((أتدرون أربى الربى عند الله؟ قالوا الله ورسوله أعلم. قال: فإن أربى الربا عندالله استحلال عرض أمريء مسلم))[419] واتە: ئایا دەزانن چ شــتێ لە سوو خراپترە لەلای خوا؟ وتیان خوا و پێغەمبەری خوا دەزانن. فەرمووی: لــە سوو خراپتر ئەوەیە کە ناموسی کەسێکی موسوڵمان بــەخۆت حــەڵاڵ بکــەیت.. لەپاشان ئەو ئایەتەی خوێنــدەوە: ((وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْــرِ مَــا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا))[420] واتە ئەوانەی ئازاری پیــاوان و ژنــانی موسوڵمان دەدەن بە ناڕەوا و ستەم بەڕاســتی بوختــان و گونــاهێکی گــەورە و ئاشکرایان دروست کردووە و هەڵگرت.

---

(٤١٧) متفق علیه

ئەم فەرمووودەیە ترجمە کراوە لە پێشەوە لە تاوانی چل و چوارەم، ئەگەر حەز ئەکەیت بیخوێنەرەوە.

(٤١٨) رواه الحاكم وابن حبان واحمد والبزار

(٤١٩) رواه ابو يعلى بسند صحيح

بڕوانە کتێبی الزواجر للشيخ ابن الحجر الهيتمي، لاپەڕە ٩ بەرگی دووەم، باب الغيبە.

(٤٢٠) سورەتی الاحزاب ئایەتی ٥٨

هەروەها (عائیشە) خوای لیٚ رازی بیٚت دەڵیٚت: جاریٚک بە پیٚغەمبەرم ووت، وەک دەفەرموویٚت: ((**قُلْتُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَسْبُكَ مِنْ صَفِيَّةَ كَذَا وَكَذَا (قَالَ بعض الرواة تَعْنِي قَصِيرَةً). فَقَالَ: لَقَدْ قُلْتِ كَلِمَةً لَوْ مُزِجَتْ بِمَاءِ الْبَحْرِ لَمَزَجَتْهُ**))[٤٢١] واتە بەڕاستی جاریٚکیان باسی سەفیەم کرد ووتم سەفیە بەژنی کورتە. پیٚغەمبەرﷺ فەرمووی: ووتەیەکی وات گوت ئەگەر تیٚکەڵی ئاوی دەریای بکەیت لیٚل و بۆگەنی دەکات.

لە دواییدا عائیشە (خوای لیٚ رازی بیٚت) ووتی: (حیکایەت) و داستانی مرۆڤیٚکم بۆ کرد، فەرمووی هیچ حەز ناکەم بەڕاستی حیکایەتی کەسم بۆ بکەیت، چونکە من حەز ناکەم ناوی هیچ جۆرە کەسیٚک بەخراپە و ناشیرین بیٚنم.

هەروەها جابری کوڕی عەبدوڵا دەگیٚڕیٚتەوە دەڵیٚت: ((**كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَارْتَفَعَتْ رِيحُ مُنْتِنَةٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَتَدْرُونَ مَا هَذِهِ الرِّيحُ؟ هَذِهِ رِيحُ الَّذِينَ يَغْتَابُونَ الْمُؤْمِنِينَ**))[٤٢٢] واتە ئیٚمە جاریٚکیان لە خزمەت پیٚغەمبەرداﷺ بووین، بۆنیٚکی زۆر ناخۆش و بۆگەنی هات، پیٚغەمبەرﷺ فەرمووی: ئایا دەزانن ئەوە چ بۆنیٚکە؟ فەرمووی ئەوە بۆنی ئەو کەسانەیە کە لەپاش ملە باسی برواداران دەکەن.

هەروەها ریوایەت کراوە کە پیٚغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**الغيبة أشد من الزنا. قيل وكيف؟ قال: الرجل يزني ثم يتوب فيتوب الله عليه، وإن صاحب الغيبة لا يغفر له حتى يغفر له صاحبه**))[٤٢٣] واتە: باس کردنی پاش ملە خراپترە لە داویٚن پیسی.

---

(٤٢١) رواه ابوداود والترمذي والبيهقي

اي لأنتنته وغيرت ريحه. (وَحَكَيْتُ لَهُ إِنْسَانًا فَقَالَ مَا أُحِبُّ أَنِّي حَكَيْتُ إِنْسَانًا وَأَنَّ لِي كَذَا وَكَذَا) بڕوانە کتیٚبی (تاج الأصول) دانراوی الشيخ منصور على ناصف، ج٥ ص٢٦

(٤٢٢) رواه احمد بسند صحيح

(٤٢٣) رواه ابن ابي الدنيا والطبراني والبيهقي

پرسیاریان کرد چۆن؟ فەرمووی: پیاوی وا هەیە بە نەفامی و نەزانی داوێن پیسی دەکات، پاشان دەگەڕێتەوە و پەشیمان دەبێتەوە، خوا پەشیمانیەکەی لێ وەردەگرێت. بەڵام خاوەنی پاش ملە خوا لیێی خۆش نابێت هەتا باسکراو لە پاش ملە خۆش نەبێت و گەردەنی ئازاد نەکات.

هەروەها ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوەﷺ دەفەرمووێت: ((**لَمَّا عُرِجَ بِي مَرَرْتُ بِقَوْمٍ لَهُمْ أَظْفَارٌ مِنْ نُحَاسٍ يَخْمُشُونَ وُجُوهَهُمْ وَصُدُورَهُمْ. فَقُلْتُ: مَنْ هَؤُلَاءِ يَا جِبْرِيلُ؟ قَالَ: هَؤُلَاءِ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ لُحُومَ النَّاسِ وَيَقَعُونَ فِي أَعْرَاضِهِمْ**))[٤٢٤] واتە لەکاتی فەرمان پێکردنم لەلایەن خواوە بەرزکرامەوە بۆ ئاسمان لە شەوی (میعراج) دا چاوم کەوت بە کۆمەڵێک نینۆکی دروستکراویان لە مس هەبوو، دەم و چاو و سینگ و ڕویان بەم نینۆکانە دەڕنیەوە، ووتم: ئەوانە کێن ئەی جوبرائیل. فەرمووی: ئەوانە ئەو کەسانەن کە گۆشتی خەڵکیان دەخوارد. واتە باسی موسوڵمانانیان دەکرد لە پاش ملە بە خراپە.

هەروەها پێغەمبەری خۆشەویستﷺ دەفەرمووێت لە فەرموودەیێکی تردا: ((**من أكل لحم أخيه في الدنيا قرّب إليه يوم القيامة فقال له كله ميتاً كما أكلته حيّا، فيأكله ويكلح**))[٤٢٥] واتە ئەوانەی لە دنیادا غەیبەت ئەکەن، واتە باس کردنی موسوڵمانان پاش ملە دەکەن لەڕۆژی دواییدا گۆشتی ئەو کەسەی کە غەیبەت کراوەکان بە مردوویی دێنە بەردەویان و زۆریان لێ دەکەن گۆشتی ئەو مردوانە بخۆن. پێیان دەڵێن هەروەک چۆن لە دنیادا گۆشتی ئەوانەتان خواردووە ئێستا دەبێ گۆشتیان بخۆن. ئنجا ناچار دەبن دەیکرۆژن. (**نسأل الله السلامة منها**)

---

(٤٢٤) رواه ابوداود

٤٢٥ رواه ابو يعلى والطبراني وابو الشيخ

**سەرنجێك:**

هەروەها ئازاردانی موسـولْمانان و جنێـو پیێدانیـان و ئـابرِوو بردنیـان لـەناو خەڵک و باس کردنیـان لـەپاش ملـە و ناوهێنانیـان بەخراپـە ئەمـە لـە رِێـز و جوملەی تاوانە گەورەکانە، هەروەها بەرِاستی باس کردنی موسوڵمانان لە پـاش ملە قەدەغەیە بە کۆمەڵی هەموو موسوڵمانان، بەلاّم زۆربەیان دەڵێن لـە تاوانـە مەزنەکانە، ئیمامی قورتبی (مفسری) بـەناوبانگ باسـی کـردووە و دەڵێـت بـە کۆمەڵی (اجماع)ی هەموو زانایان غەیبەت واتە بـاس کردنـی موسـوڵمانان لـە پاش ملە لە تاوانە گەورەکانە، بەتایبەتی باس کردنی زانا و مامۆستایانی ئایینی و قورئان خوێنەکان، ئەوە بە گوناهی گـەورە دانـراوە. هـەروەها ئـەو کەسـەی گوێ دەدا بە غەیبەت واتە باس کردنـی پـاش ملـە تاوانبـار دەبێـت و ئەگـەر بێدەنگ بێت گوێرِایەڵی بکا و قەدەغەی نەکا ئەمە هاوبەشـی ئـەم تاوانەیـە.. شێخ ئەحمەدی (ابن حجر) لە کتێبـی (الزواجـر)دا دەڵێـت: بـەڵێ ئەگـەر لـە توانات دا نەبوو قەدەغەی ئـەو پـاش ملەیـە بکـەیت لـەو کاتـەدا پێویسـتە بـە گوێرەی توانا ئەو شوێنە بەجێ بهێڵی کـە پـاش ملـەی خـەڵکی تیـا دەکـەن. دیسان شێخ ابن حجر بەزەیی خوای پیا بێتەوە دەفـەرموێت: پێویسـتە لەسـەر ئەو کەسەی لە پاش ملە باسی خەڵکی دەکـات، بەپەلـە پەشـیمان بێتـەوە بـە هەموو مەرجێک واز بهێنێ لە پاش ملەوە داوای لێخۆش بوون بکـات بـۆ ئـەو کەسەی کە بە خراپە باسی کردووە، ئەگەر ئەو پیاوەی کە باسـت کـردووە بـە خراپە ئاگادار بوو کە غەیبەتت کردووە پاش ملە دەبێت گـەردەنی خـۆتی پـێ ئازاد بکەیت.[٤٢٦]

(٤٢٦) بروانە كتێبی (الزواجر لشيخ ابن الحجر الهيتمی) بەرگی دووەم لاپەرە ١٤ بەدرێژی باسی دەكات.

(اللهم احفظنا من الغيبة والنميمة ومن أذى المسلمين وشـتمهم وبقيـة أخـلاق الأشرار وأدخلنا ووالدينا دار كرامتك مع الأبرار والزهاد، وصلى الله على محمد وآله وأصحابه الأمجاد، آمين)

# تاوانی پەنجاو چوار

## ئازاردانی خواپەرستان و خۆ هەڵکێشان لەسەریان

## (أذية عبادالله والتطول عليهم)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموویت: ((**وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا**))[٤٢٧] واتە ئەو کەسانەی ئازاری پیاوەکانی ئیماندار و ئافرەتانی ئیماندار ئەدەن بێئەوە کە ئەوان تاوانێکیان کردبێ ببی بەهۆی ئازاردانیان، بەڕاستی ئەوان کەسان هەڵیان گرت درۆیەک و گوناهێکی ئاشکرا.

خوای گەورە لە جێگایەکی تردا دەفەرمویت: ((**وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنْ اتَّبَعَكَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ**))[٤٢٨] واتە باڵی میهرەبانی خۆت دانەوێنە بۆ ئەوانە کە پەیڕەویت ئەکەن لە خاوەن باوەڕەکان.

هەروەها ئەبوو هورەیرە دەگێڕێتەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەرﷺ دەفرموویت: خوای گەورە لە (حەدیسی قدسیا) دەفەرموویت: ((**إِنَّ اللَّهَ تعالى قَالَ مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ وفي رواية فقد بارزني بالمحاربة-أي أعلمته اني محارب له**))[٤٢٩] واتە: بەڕاستی هەرکەسێ ڕکابەری بکا یا ڕقبگرێ لە خۆشەویستێکی من و ئێش و ئازاری بدات، بەڕاستی خۆم ئاگاداری ئەکەمەوە بە شەڕ لەگەڵ کردن واتە شەڕی لەگەڵ دەکەم.

---

(٤٢٧) سورەتی الاحزاب ئایەتی ٥٨

(٤٢٨) سورەی الشعراء ئایەتی ٢١٥

(٤٢٩) رواه الإمام البخاري

**(باسێك)**

هەروەها خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموویت: ((وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ))[٤٣٠] واتە نەفسی خۆت ڕابگرە و دای بمەزرێنە لەگەڵ ئەو موسوڵمانانەدا کە بەیانی و ئێوارە لە خودای خۆیان دەپاڕێنەوە و بەندەیی بۆ ئەکەن و مەبەستیان ڕەزای خودا و خواپەرستی ڕاستە بۆ ئەو.

(وهذه الآيات في تفضيل الفقراء وسبب نزولها أن النبيﷺ أول من آمن به الفقراء وكذلك كلّ نبيّ ارسل أول من آمن به الفقراء، فكان رسول اللهﷺ يجلس مع الفقراء أصحابه مثل سلمان وصهيب وبلال وعمار بن ياسر ﵁، فاراد المشركون أن يحتالوا عليه في طرد الفقراء لما سمعوا أن علامة الرسل أن يكونوا أول أتباعهم الفقراء، فجاء بعض رؤساء المشركين فقالوا يا محمد أطرد هؤلاء لا يجترئون علينا فيتبعك أشرف الناس ورؤساؤهم(٤٣١) فانزل الله تعالى هذه الآية ((وَلاَ تَطْرُدْ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ))(٤٣٢) ).

واتە ئەم ئایەتە فەزڵ و گەورەییە بۆ هەژاران و هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە ئەوەبوو پێغەمبەرﷺ هەر لە هەوەڵەوە ئەوانەی کە باوەڕیان ئەهێنا بە حەزرەتﷺ هەر موسوڵمانە هەژارەکان بوون. هەروەها هەموو پێغەمبەرەکان (سڵاوی خوایان لەسەر بێ) ئەوانەی باوەڕیان پێئەهێنان هەر موسوڵمانە هەژارەکان بوون. هەروەها پێغەمبەرﷺ تەشریفی ڕۆژێک دانیشتبوو لەگەڵ یارانی موسوڵمانە هەژارەکان وەک سەلمان و صوهەیب و عەمماری کوڕی یاسر و بیلال و.. (خوایان لێ ڕازی بێت)، ئنجا بێباوەڕەکان ویستیان کە

---

(٤٣٠) سورەتی الكهف ئایەتی ٢٨

(٤٣١) بڕوانە کتێبی الزواجر عن اقتراف الكبائر، دانراوی شێخ ابن الحجر الهيتمی، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ١١٣، وە بڕوانە کتێبی الكبائر، دانراوی بەڕێز (الحافظ محمد بن احمد بن عثمان الذهبي)

(٤٣٢) سورة الأنعام الآية ٥٢

فیڵێک بدۆزنەوە بۆ ئەوەی موسوڵمانە هەژارەکان پێغەمبەرﷺ دەریان بکا لە دەورەی خۆیا، چونکە بیستبوویان کە نیشانەی پێغەمبەرایەتی هەر لە هەوەڵەوە ئەوانەی شوێنی کەوتوون هەر هەژارەکانن، ئنجا ناچار بوون هەندێک لە سەرۆکە بێباوەڕەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەرﷺ گوتیان ئەی محمد، ئەوانەی لە دەورەی تۆدان دەریان بکە. ووتیان ئێمە شەرم دەکەین هەتا ئەمانە لە دەورەی تۆ دابن ئێمە ئامشۆت بکەین، دەی ئەگەر ئەتەوێ ئێمە بکەوینە شوێنی تۆ ئەمانە دەربکە هەتا ئێمە بێین بۆ لای تۆ، ئەوکاتە شوێن کەوتووەکانت ئەبن بە بەرزترین مرۆڤ.. لەم هۆیەوە شتێ کەوتە دڵی حەزرەتەوە. ئنجا خودای گەورە ئەم ئایەتەی بۆ پێغەمبەر هەنارده خوارەوە (واتە تۆ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست، ئەو موسوڵمانانە دەرمەکە کە خواپەرستی خودای بێهەواڵ ئەکەن لە بەیانی و ئێوارەدا و خواستیان هەر بەڕەزامەندی خودایە.

**(فلما أيس المشركون من طردهم قالوا يا محمد إن لم تطردهم فاجعل لنا يوما ولهم يوماً فانزل الله تعالى: وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ...** ) واتە ئنجا بێباوەڕەکان **(مأيوس)** بوون لە دەرکردنی هاوڕێیانی پێغەمبەرﷺ لە دەورەی پێغەمبەرداﷺ، جا گوتیان ئەی محمد، مادام بەدەرت نەخستوون تۆ وا بکە ڕۆژێک بۆ ئەوان دابنێ ڕۆژێک بۆ ئێمە دابنێ، بۆ ئەوەی بێین بۆ لات. لە وەڵاما خوای گەورە ئەم چەن ئایەتەی ناردە خوارەوە بۆ پێغەمبەرﷺ تا دوایی ئایەتەکە هەروەک لە پێشەوە تەفسیر کرا.

**ئاگاداریيەك:**

**(عدّ هذا كبيرة هو ما صرّح به بعضهم)** واتە ئەم تاوانەش بە تاوانە گەورەکان ژماردراوە. هەروەها هەندێک لە زانایان دانیان پێداناوە چونکە بەڕاستی

ئازاردانی خواپەرستان و ئیمانداران و موسڵمانان و پیاوچاکان لە ڕێز و جوملەی تاوانە گەورەکانە بەتایبەتی عولەما و زانایانی ئاینی، هەروەها شێخ ئەحمەدی ئیبنوحەجەر (نەقل) ئەکا لە زانای بەناوبانگ ئیبنو عەساکری دیمەشقی دەڵێت ڕق و بوغزی عالمان و جنێودان بە زانایانی ئاینی سەممی (قاتیلە) و بەلای هەندێک لە زانایانی حەنەفیەوە ئەگەر کەسێک بەدڵ ڕکابەری و گاڵتەیان پێ بکا و بە زانایانی ئاینی تەڵاقی پێ دەکەوێ و هەر کەسێ زبانی بەرەڵای بکا لە ڕاست زانایانی ئاینی ئەوە بێ گومان خوا تووشی بەڵای ئەکا پێش مردنی (خوا پەنامان بێت).[٤٣٣]

**(اللهم أذقنا حلاوة مناجاتك واسلك بنا طريق مرضاتك واقطع عنا كل ما يبعدنا من حضرتك ويسر لنا ما يسرته لأهل محبتك واغفر لنا ولوالدينا والمسلمين)**

---

(٤٣٣) بڕوانە کتێبی الزواجر دانراوی شێخ ابن حجر بەشی یەکەم لاپەڕە ١١٢

# تاوانی پەنجاو پێنج

## جل و بەرگ و بەرکۆش و دەرپێ شۆڕکردن لە زەوی دابخشێ بۆ فیز و دەعیەوە

## (إسبال الأزار والثوب واللباس والسراويل تعززاً وعجبا وفخرا وخيلاءً)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفـەرمووێت: ((وَلاَ تَمْشِ فِي الأَرْضِ مَرَحًا إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ))[٤٣٤] واتـە: هـەرگیز بـە لەنجـەی بايیبوونـەوە بەسـەر زەویدا مەڕۆ، چونکی بێ گومان خودا ئینسانی بەفیز و دەعیەی خۆش ناوێ.

هەروەها پێغەمبەریشﷺ دەفەرمووێت: ((ما أسـفل الكعـبين مـن الأزار في النار))[٤٣٥] واتە ئەوەی بەرکۆشی لە خـوار (گـوزینگی) پێـوە بـێ و بـۆ فیـز و دەعیە ئەمە جێگای ناو ئاگری دۆزەخە.

لە فەرموودەیێکی تردا دەفـەرمووێت: ((لا ينظر الله يوم القيامة إلى من جرّ إزاره بطراً))[٤٣٦] واتە هەرکەسێ بۆ فیز و دەعیە بەرکۆشی خۆی درێژ بکـاو ئەمـە لـە رۆژی قیامەتدا خوا بەچاوی مهرەبانیەوە تەماشای ناکا.

هەروەک لە فەرموودەیێکی تردا پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمْ اللَّهُ وَلا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ولا يزكيهم ولهم عذاب أليم، المسـبل(٤٣٧) والمنـان والمنفق سِلْعَته بالحلف الكَاذِبّ))[٤٣٨] واتـە سـێ کـەس هەنـە لـەڕۆژی قیامەتـدا خوای گەورە قسەیان لەگەڵدا ناکا و بە چاوی بەزەیيیـەوە تەماشـایان ناکـا و هیچ خاوێنیان ناکاتەوە و سزایەکی زۆر بە کوشندەیان بـۆ هەیـە. یەکـەم ئـەو

---

(٤٣٤) سورەی لقمان ئایەتی ١٨

(٤٣٥) رواه البخاري

(٤٣٦) رواه مالك والبخاري ومسلم والترمذي

(٤٣٧) المسبل يطول ثوبه يرسله إلى الأرض كانه يفعل تجبراً وخيلاء (بڕوانە کتێبی الترغيب والترهيب، دانراوی بەڕێز الحافظ المنذري، بەرگی ٣ لاپەرە ٨٩ چاپی بیروت.)

(٤٣٨) رواه مسلم

کەسەیە بۆ فیز و دەعیە داوێنی جل و بەرگی خۆی دەخشێنێ لە زەوی و ڕێگەدا. دووهەم ئەو کەسەیە کە منەت ئەکا بەسەر ئەو کەسەی کە شتی پێ ئەبەخشێ، سێهەمیان ئەو کەسەیە شتومەکی فرۆشتنی بە سوێندی بەدرۆ ساخ ئەکاتەوە.

لە فەرموودەیێکی تردا دەفەرمووێت: ((**بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي فِي حُلَّةٍ تُعْجِبُهُ نَفْسُهُ مُرَجِّلٌ جُمَّتَهُ اذ يختال في مشيته إِذْ خَسَفَ اللَّهُ بِهِ فَهُوَ يَتَجَلْجَلُ فيها إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ**))[٤٣٩]

هەروەها پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیێکی تردا دەفەرمووێت: ((**مَنْ جَرَّ ثوبَهُ خيلاءً لَمْ ينظر اللَّهُ إِلَيْهِ يوم القيامة**))[٤٤٠] واتە: هەرکەسێ بۆ فیز و دەعیە جل و بەرگی خۆی بکێشی لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە بە چاوی بەزەییەوە تەماشای ناکا.

حەزرەتﷺ دەفەرمووێت: ((**الإِسْبَالُ فِي الإِزَارِ وَالْقَمِيصِ وَالْعِمَامَةِ مَنْ جَرَّ مِنْهَا شَيْئًا خُيَلَاءَ لا يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**))[٤٤١] واتە شۆڕکۆدنەوەی نادروست تەنها بۆ بەرکۆش و ئیزار و کراس و مێزەرە و مەندیلە و بەس، بۆ هەموو ئەو شتانەی کە بکشێ بەسەر زەویدا و بۆ فیز و دەعیە ئەمە لە ڕۆژی قیامەتدا خوا تەماشای ئەو جۆرە کەسانە ناکات بە چاوی ڕەحمەت واتە بەزەیی.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**إِزْرَةُ الْمُؤمن إِلَى نِصْفِ سَّاقِيه وَلَا حَرَجَ عليه فِيمَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْكَعْبَيْنِ مَا كَانَ أَسْفَلَ مِنْ الْكَعْبَيْنِ فَهُوَ فِي النَّارِ**))[٤٤٢] واتە جل و بەرگ و کاڵای پیاوی ئیماندار هەتا نیوەی (لاقە) لەوە بەرەوخوارتریش بێ

---

**(٤٣٩) رواه الشيخان**

**ئەم فەرموودەیە لە بەرگی یەکەمی تاوانە گەورەکان تەرجەمە کراوە بچۆ بیخوێنەرەوە.**

**(٤٤٠) رواه البخاري ومسلم**

**(٤٤١) رواه ابوداود**

**(٤٤٢) رواه احمد وابوداود**

هەتا دە گاتە سەر گۆزینگەی قولەپێ قـەیناکات دروسـتە، بـەلاّم ئـەوەی لـە خوار گۆزینگەی قولەپێ بێ بەرەو خوار بـۆ فیـز و دەعیـە ئەمـە جێگـەی نـاو ئاگری دۆزەخە.

هەروەها خاوەنی (الكبائر) دەفەرمووێت: (**وهذا عام في السراويل والثوب والجبة والقباء وغيرها من اللباس، فنسال الله العافية**) واتە ئەمە بەگشتيیە بۆ هەموو جـل و بەرگێکی وەک دەرپێ و جبە و کەوا و هەرچی جل و بەرگێکی بە زیـادەڕەوا شۆڕەوە کرابێ، داواکارم لە خودادا بمان بوریٚت.

**تێبینی:**

هەروەها ئـەم تاوانـەش لـە ڕیٚـز و جوملـەی تاوانـە گـەورەکان ژمـاردراوە، هەرکەسێ جل و بەرگ و کالاّی بۆ فیز و دەعیە شۆڕ بکاتەوە، یاخود درێژ بێت بە جۆرێ بەزەوی دا بخشێ، چونکە بەڕاستی هـەر جـل و بـەرگی بەزەويـدا بخشـێ ئەمـە زیادەڕەوەیـە و زیـادەڕەوەش بـە ئـاینی و شـەریعەتی ئیسـلام قەدەغەیە و هەر لەبەر ئەم هۆیانەیە زۆربەی فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ زۆر بە توندی هەڕەشە لەو کەسانە دەکەن کە جل و بەرگی خۆیان بـە فیـز و دەعیـە شۆڕ ئەکەنەوە.

(**اللهم عاملنا بلطفك الحسن الجميل برحمتك يا أرحم الراحمين**)

# تاوانی پەنجاو شەش

## لەبەرکردنی ئاوریشم و زێڕ بۆ پیاوان

## (لبس الحرير والذهب للرجال)

**((عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه، أنه قال: قال رسول الله صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ مَنْ لَبِسَ الْحَرِيرَ فِي الدُّنْيَا لَمْ يَلْبَسْهُ فِي الْـآخِرَةِ))**[٤٤٣] واتـە لـە عومـەری کوڕی خەتتابـەوە خـوای لـیٚ رازی بیٚـت دەڵیٚـت پیٚغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: هەرکەسیٚ لە پیاوان لە دنیادا ئاوریشم لەبەر بکا لەو دونیادا لەبەری ناکا.

(عن علي بن ابي طالب رضي الله عنه انه قال: **قال رسول اللهﷺ حرّم لبس الحرير والذهب علي ذكور أمتي)**[٤٤٤] لە عەلی کوڕی ئەبی تالب دەگیٚڕدریٚتەوە (خـوای لیٚ ڕازی بیٚت) دەڵیٚت پیٚغەمبەرﷺ فەرموویەتی: لەبـەرکردنی زیٚـڕ و ئاوریشـم حەرامە و قەدەغەیە لەسەر نیٚرینەی گەلی من.

هەروەها حوزەیفەی کوڕی یەمانی (خوای لـیٚ ڕازی بیٚـت) گـوتی: ((**نهانـا رسول اللهﷺ أن نشرب في آنية الذهب والفضة وأن نأكل فيها وعن لـبس الحريـر والديباج وأن نجلس عليهـا**))[٤٤٥] واتـە: پیٚغەمبـەرﷺ نـەهی و قەدەغـەی لـیٚ کردووین کە لە حاجەتی زێڕ و زیودا شت نەخۆین و نەخۆینەوە، یان ئاوریشـم و دیباج بە پۆشین یان لەسەریان دابنیشین.

هەروەها خاوەنی (الکبائر) دەڵیٚـت: (**فمن استحل لبس الحرير من الرجال فهـو كافر**) واتە هەرکەسی لەبەرکردنی ئاوریشم بۆ پیـاوان ڕەوا و حـەڵاڵ بکـا ئەمـە بیٚبـاوەڕە. (وإنما رخص في الشارعﷺ **لمن به حكة أو جرب أو غيره للمقاتلين لقـاء**

---

**(٤٤٣) رواه البخاري ومسلم**

**(٤٤٤) رواه ابوداود**

**(٤٤٥) اخرجه البخاري**

العدو) واته پێغەمبەرﷺ رێگەی داوە بۆ ئەو کەسەی کە خووروخوورووکەیێ لە لەشیا بێ یای شتی تر یا بۆ شەڕکەران بەرامبەر بە دوژمنانی ئیسلام ڕابوەستن. (أما لبس الحرير للزينة في حق الرجال فحرام باجماع المسلمين) واته بەڵام لەبەرکردنی ئاوریشم بۆ جوانی بۆ پیاوان ئەمە قەدەعەیە و حەرامە بە کۆمەڵی هەموو موسڵمانان. (وكذلك الذهب لبسه حرام على الرجال سواء كان خاتما أو حياصة) واته هەروەها لەبەر کردنی زێڕ بۆ پیاوان قەدەغەیە و حەرامە ئەگەرچی ئەنگوستیلەیەکیش بێ یا پشدێنەیەک بێ. چونکە بەڕاستی پێغەمبەرﷺ چاوی کەوت بە مرۆڤێک ئەنگوستیلەبەکی ئاڵتوونی لەدەستا بوو، پێغەمبەرﷺ ئەنگوستیلەکەی لە پەنجەی داکەند و فڕەی داو فەرمووی ئەوە بۆ هەندێ کەس لە ئێوە ئەچێ پەلاماری (پەشکۆی) ئاگرێ سوور دەدا و دەیکاتە دەستی خۆی. ئەمەش دەقی فەرموودەکەیی پێغەمبەرەﷺ: ((أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ فِي يَدِ رَجُلٍ فَنَزَعَهُ فَطَرَحَهُ وَقَالَ يَعْمِدُ أَحَدُكُمْ إِلَى جَمْرَةٍ مِنْ نَارٍ فَيَجْعَلُهَا فِي يَدِهِ))[٤٤٦]

هەروەها شێخ ئەحمەدی (ابن الحجر) لە زەواجردا ئەم فەرموودەی لە حەزرەتی عەلي‌یەوە نەقڵ ئەکا (خوای لێ ڕازی بێت) ئەڵێت: ((رايت رسول اللهﷺ أخذ حريراً في يمينه وذهبا فجعله في يساره ثم قال: إن هذين حرام على ذكور أمتي)) لە هەندێ ریوایەتا ئەمەشی لێ زیادکراوە ((حلّ لإناثهم))[٤٤٧] واته: پێغەمبەرم دیتﷺ هەندێ ئاوریشمی بە دەستی ڕاستی هەڵگرت و هەندێ زێڕیش بە دەستی چەپی هەڵگرت و فەرمووی ئەم دو شتە لەسەر نێرینەی گەلی من قەدەغەو حەرامن و ڕەواو حەلاڵن بۆ ئافرەتان.

---

(٤٤٦) رواه مسلم

(٤٤٧) رواه ابوداود

**سەرنجێك:**

هەروەها لەبەركردنی جل و بەرگی ئاوریشم بۆ پیاوان قەدەغەیە و حەرامە، ئاڵتوونیش بۆ پیاوان قەدەغە و حەرامە، هەركەسێ گوێی پێنەدات و بیانپۆشێت، ئەمە لە تاوانە گەورەكان دەژمێردرێت بە رأی زاناكان. پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمووێت: ((**مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللّٰهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلَا يَلْبَسْ حَرِيرًا وَلَا ذَهَبًا**))[٤٤٨] واتە هەركەسێ باوەڕی بەخوا و بەڕۆژی قیامەت هەبێ نابێ ئاوریشم و زێڕ لەبەر بكات.[٤٤٩]

**(فنسال الله التوفيق لما يحب ويرضى إنه جواد كريم، وألبسنا الله تعالى يمنّه وكرمه حلية الجنة، آمين)**

---

(٤٤٨) اخرجه احمد

(٤٤٩) بروانە (الزواجر) دانراوی شێخ ابن الحجر بەرگی یەكەم لاپەڕە ١٥٤

# تاوانی پەنجاو حەوت

## بەندەی هەڵاتو لە ئاغاكەی

## (إباق العبد)

هەروەها بەڕاستی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**إِذَا أَبَقَ الْعَبْدُ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ**))[٤٥٠] واتە ئەگەر هاتو بەندەیێ هەڵاتو لە ئاغاكەیەوە خوا نوێژی لێ وەرنا گرێت.

هەروەها حەزرەت ﷺ دەفەرمووێت: ((**أَيُّمَا عَبْدٍ أَبَقَ فَقَدْ بَرِئَتْ مِنْهُ الذِّمَّةُ**))[٤٥١] واتە هەر بەندەیێ هەڵبێت لە ئاغاكەی، ئەوە بەڕاستی بێ گومان لە كۆمەڵی موسوڵمانان دەردەچێت.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: ((**ثَلَاثَةٌ لَا يقْبَلُ اللهُ لَهُمْ صَلَاةٌ ولا يصعد لهم إلى السماء حسنة العبد الآبق حتى يرجع إلى مولاه والمرأة الساخط عليها زوجها حتى يرضى عنها والسكران حتى يصحو**))[٤٥٢] واتە سێ كەس نوێژیان لێ وەرنا گیرێت و هیچ چاكەیان بەرز نابێتەوە بۆ ئاسمان: یەكەم نوێژی بەندەی هەڵهاتووە تا ئەگەڕێتەوە بۆ لای خاوەن ئاغاكەی تا ئاشت ئەبێتەوە لەگەڵیا، دووەم نوێژی ئەو ئافرەتەی كە مێردەكەی لەخۆی تورە كردووە تا لەگەڵی ئاشت ئەبێتەوە، سێیەم نوێژی سەرخۆشی گیرا نابێت تا چاك ئەبێتەوە.

لە فەرموودەیێكی تردا حەزرەت ﷺ دەفەرمووێت: ((**اثنان لا تجاوز صلاتهما رؤوسهما: عبدٌ آبق من مواليه حتى يرجع وامرأة عصت زوجها حتى ترجع**))[٤٥٣] واتە

---

(٤٥٠) رواه مسلم

(٤٥١) رواه مسلم

(٤٥٢) رواه الطبراني وابن خزيمة وابن حبان في صحيحهما

(٤٥٣) رواه الحاكم والطبراني باسناد جيد

دوو کەس نوێژیان ڕەت نابێ لە عاست سەریانەوە: یەکەم ئەو کۆیلەیەی کە لە ئاغاکەی هەڵاتووە تا دەگەڕێتەوە، دووەم نوێــژی ئــەو ژنــەی کــە مێردەکــەی لەخۆی زویــر کــردووە تــا ئەگەڕێتــەوە بــۆلای مێردەکــەی و لەگــەڵی ئاشــت ئەبێتەوە.

**تێبینی:**

هەروەها ئەم تاوانەش لە ڕیز و جوملەی تاوانە گەورەکان ژماردراوە، چــونکە هەر بەندە و کۆیلەی لە ئاغاکەی هەڵهات و تا دەگەڕێتەوە ژێر حکمی خــاوەن و ئاغاکەی، ئەمە خوای گەورە نوێژی لێ وەرناگرێت، هەروەها شێخ ابن الحجر لە (زواجر) دا دەڵێت ئەم فەرموودانەی حەزرەتﷺ هــەموو ئــەبن بــە بەڵگــە و دەلیل کە ئەمەش تاوانێکی گەورەیە و بە (ظاهری) واتە رووکەشی (والله اعلم).

(فنسأل الله التوفيق لما يحب ويرضى إنه جواد كريم وصلى الله على سيدنا محمـــد وعلى آله وصحبه أجمعين)

# تاوانی پەنجاو هەشت

## سەربڕین بە غەیری ناوی خودای گەورەوە بێ

## (الذبح لغير الله عز وجل)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێت: ((**وَلاَ تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرْ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ**))([٤٥٤]) واتە مەخۆن ئەی موسوڵمانەکان گۆشتی ئەو ئاژەڵانەی سەربڕاون کە ناوی خودا لێ نەهێنرابێت لەکاتی سەربڕینیا و خواردنی گۆشتی (حەیوانی) وەها دەرچوونە لە سنووری ئایین.

هەروەها خوای گەورە لە سورەتی (المائـدة) لە ئایەتی ٣ دەفەرمووێت: ((**حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ الْمَيْتَةُ**)) واتە قەدەغەکراوە لەسەر ئێوە خواردنی گۆشتی مردارەوەبوو، واتە ئەو گیانلەبەرە کە بەبێ سەربڕینی شەرعی مردبێ. ((**والدم**)) واتە خواردنی خوێنی کە ڕەوان بووبێ وەک لە زەمانی جاهیلیەتا ئەو خوێنەیان دەکردە ناو ریخۆڵەی حەیوان و دەیان برژاند و دەیانخوارد، ئنجا لە ئیسلامییەتا قەدەغە و حەرام کرا. ((**وَلَحْمُ الْخِنزِيرِ**)) واتە گۆشتی بەراز ((**وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ**)) وە حەیوانێک کوژرابێتەوە بەناوی غەیری خودا ((**وَالْمُنْخَنِقَةُ**)) حەیوانی خنکاو ((**وَالْمَوْقُوذَةُ**)) حەیوانێ کوژرابێ بە لێدان ((**وَالْمُتَرَدِّيَةُ**)) حەیوانێک مردبی بە بەربوونەوە لە جێگای بەرز یا هەڵدرابێت، ((**وَالنَّطِيحَةُ**)) حەیوانێ مردبێ بە قۆچ لێدان ((**وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ**)) حەیوانێک درندە لێی خواردبێ و تا گیانی دەرچووبێ ((**إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ**)) حەیوانێک نەبی لەمانە کوشتنیانەوە، واتە ژیانی راستەقینەیان تیا مابێ لەو کاتەدا کە سەریان دەبڕن وەک (جموجووڵی) بەهێز یا پەلەمیزکەی خوێن ((**وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ**)) حەرامیشە لە ئێوە

---

(٤٥٤) سورەتی الانعام ئایەتی ١٢١

حەیوانێک کوژرابێتەوە بۆ بوتەکان. ((**وَأَنْ تَسْتَقْسِمُوا بِالأَزْلاَمِ**)) حەرامیش کراوە لەسەر ئێوە خواستنی زانینی دابەش کردنی خۆتان بە تیرەکانی..[٤٥٥] تا دوایی ئایەتەکە.

هەروەها ئەبی هورەیرە دەگێڕێتەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: ((**سال رجل رسول الله ﷺ فقال ارايت الرجل منا يذبح وينسى أن يسمي الله تعالى؟ فقال النبي ﷺ إسم الله على فم كل مسلم**))[٤٥٦] واتە پیاوێک پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ گوتی ئایە پیاوێک لە ئێمە حەیوانێک سەردەبڕێت و ناوی خوای گەورەی لەبیر ئەچێت لەکاتی سەربڕینا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ناوی خودا لەسەر زبانی هەموو مووسڵمانێکە.

هەروەها لە فەرموودەییێکی تردا دەفەرمووێت: ((**عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّ قَوْمًا قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ قَوْمًا يَأْتُونَنَا بِاللَّحْمِ لَا نَدْرِي أَذَكَرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ أَمْ لَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَمُّوا اللَّهَ عَلَيْهِ وَكُلُوهُ**))[٤٥٧] واتە لە عائیشەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕدرێتەوە گوتی: قەومێک واتە گەلێک گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا، بەڕاستی زۆر جار وا ڕێ دەکەوێ هەندێ کەس گۆشتمان بۆ دێنن نازانین کە ناوی خوایان لێ هێناوە یا نا، ئنجا ئایا لێی بخۆین یا نا؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی بەخۆتان ناوی خوای لێ بێنن و بیخۆن.

---

(٤٥٥) واتە ئەم باسەم وەرگرتووە لە گەڵ هەندێك دەستكاری لەم دو تەفسیرە گرنگەوە: یەكەم تەفسیری (نامی) دانراوی بەڕێز مامۆستا مەلا عبدالكریم مدرس، بەرگی سێیەم، لاپەڕە ٨، دووەم (تەفسیری ژیانی ئینسان) دانراوی مامۆستا مەلا (حسێن) هەولێری، بەرگی پێنجەم، لاپەڕە ٢٠.. هەركەسێ ئەیەوێ باش لێیان تێبگات لەبارەی ئەم ئایەتانەوە با تەماشایان بكات.

(٤٥٦) رواه الطبراني

٤٥٧ رواه البخاري

**سەرنجێك:**

هەروەها دروست نیە حەیوان و گیانلەبەر سەرببڕێت مەگەر بەناوی خـوای گەورەوە نەبێ، چونکە ئەگەر بە غەیری ناوی خـوداوە سـەربڕێت وەک ئەمـە بڵێت بەناوی (**شیطان**) یا بەناوی بت و سەنەمەوە یا بەناوی (فلان) کەسە ئەمـە گۆشتەکەی قەدەغەیە و دروست نیـیە بیخۆن بە شەریعەتی ئیسلام.

جگە لەمەش بە بـەر نـەفرین و لەعنـەتی خـوا و پێغەمبـەر دەکـەوێ وەک حەزرەت ﷺ دەفەرمووێت: ((لعن الله من ذبح لغير الله))[٤٥٨]

هەروەها هەر کەسی بە غەیری ناوی خوداوە حەیوانات سەربڕێت، ئەمە لـە ڕیز و جوملەی تاوانە گـەورەکان دەژمێردرێـت، هـەروەها لەگـەڵ ئەمەشـدا و پێویستە بزانین کە لەکاتی سەربڕینا بڵێین (**بسم الله الله اكبر**). واتە بەناوی خودا خودا زۆر گەورەیە، چونکە ئەم دوو ووشـەیە سـونەتی پێغەمبـەرەﷺ، ئەگـەر لەبیریشت چوو قەی ناکات دروستە گۆشـتەکەی بخۆیـت، بەمـەرجێک نـاوی هیچ کەسێ تێکەڵاو نەکەیت لە غەیری خوداوە.

**(اللهم يا من فاز بطاعته المفلحون ورجا مغفرته العاصون، اجعلنا ممـــن بـــالمواعظ يتعظزن، وصلى الله على النبي الأمي وعلى آله وصحبه وسلم)**

---

**(٤٥٨) رواه احمد**

## تاوانی پەنجاو نۆ

### کەسێ داوای باوکێتی کەسێ بکاو بۆخۆی کەبزانێ باوکی ئەو نییە

### (في من ادعى الى غير ابيه وهو يعلم)

((مَنْ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ غَيْرُ أَبِيهِ فَالْجَنَّـةُ عَلَيْـهِ حَـرَامٌ))(٤٥٩) لـە سەعدەوە (خوای لیێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: هەرکەسێ داوای باوکێتی کەسێ بکا بۆ خۆی و لەسەر ئەمەش کە بزانێ باوکی ئـەو نیـە، ئەمە بەهەشت لەو کەسە حەرامە.

لـە ئـەبی هـورەیرەوە دە گێڕدرێتـەوە (خـوای لـیێ ڕازی بێـت) دەڵێـت: پێغەمبەرﷺ فەرموویـەتی: ((مَنْ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ فَعَلَيْهِ لَعْنَـةُ اللَّـهِ))(٤٦٠) واتـە هەرکەسێ داوای باوکێتی کەسێ بکا بۆ خـۆی و کـوڕی ئـەویش نـەبێ، ئەمـە نەفرینی خوای لیێبێ.

**((عن أبي ذر ﷺ أنه سمع رسول الله ﷺ يقول: ليس من رجل أدعى إلى غير ابيـه وهو يعلمه الا كفر ومن أدعى ما ليس له فليس من منّا وليتبوأ مقعده من النار، ومـن دعا رجلا بالكفر أو قال يا عدو الله وليس كذلك، إلاّ حار عليه–أي رجع إليه))(٤٦١)** واتە لە ئەبی زەڕەوە (خوای لیێ ڕازی بێت) دە گێڕدرێتەوە دەفەرمووێت: گـوێم لە پێغەمبەرﷺ بوو دەفەرمووێت: هیچ مرۆڤێ نیـە کـە داوای بکـا کـە کـوڕی مرۆڤێکە، باوکی ئەمیش نەبێ و بیش زانی کە باوکی ئەو نیە، ئەمە ئـەو کەسـە کافرە واتە بێباوەڕ ئەبێ، ئەگەر بە دروستی بزانێ پـێی ڕەوا بـێ، هەرکەسـێ داوای شتێ بکا و هی ئەو نەبێ، ئەمە ئەو کەسە لەئێمە نیە و با جێگا بۆ خـۆی

---

(٤٥٩) رواه البخاري
(٤٦٠) رواه الترمذي
(٤٦١) رواه مسلم

ئاماده بکا له دۆزەخ، هەرکەسێ مرۆڤێک بە کوفر بانگ بکا و یا پێی بڵێ دوشمنی خودا، ئەو مرۆڤەش وا نەبێ کە ئەو وا ئەڵێت، ئەمە ئەو کوفره دەگەڕێتەوە سەر خۆی.

**تێبینی:**

هەروەها ئەم تاوانەش لە ڕێز و جوملەی تاوانە گەورەکان ژماردراوە، کەسێ داوای باوکێتی کەسێ بکا و بۆ خۆی کە بزانێ باوکی ئەو نیە یا کەسێ حاشا لە باوکی خۆی بکا و یەکێکی تر بکا بە باوکی خۆی، ئەمە لە تاوانە مەزنەکانە بەڕای هەموو زاناکان. بەڕاستی ئەم فەرموودەی حەزرەتﷺ بۆ ئەم باسە کافیە وەک دەفەرموێت: ((**إن من أعظم الفرا أن يدعى الرجل إلى غير أبيه**))[٤٦٢] واتە گەورەترین ئیفترایە کە کەسێ خۆی بکا بە کوڕی غەیری باوکی، واتە بەدرۆ بڵێ من کوڕی ئەوم.

**(فنسأل الله العفو والعافية والتوفيق لما يحب ويرضى إنه جواد كريم)**

---

(٤٦٢) رواه البخاري

# تاوانی شەستەم

## دەمەوەڕ و دەدەمەوەرێ و دەمەقاڵێ بە گوشندەوە

## (الجدل والمراء واللدد)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێت: ((**وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يُعْجِبُكَ قَوْلُهُ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيُشْهِدُ اللَّهَ عَلَى مَا فِي قَلْبِهِ وَهُوَ أَلَدُّ الْخِصَامِ**)) واتە لەم کۆمەڵە ئادەمیزادەیە کە هاتوچۆ ئەکەن بۆ لای تۆ ئینسانی وا کە ئەوەندە شیرین و ڕەوانە کاتی قسە ئەکا و لە بابەتی دنیا و ژیانی دنیاوە قسەکانی تۆ ئەخاتە تەعەجوبەوە، خودا ئەکا بە شاهیدی خۆی لەسەر ئەوەی وا لە دڵیا بەرابەر بە پێغەمبەر و یارانی و داوای ئەوە ئەکا کە ئێوەی خۆش ئەوێ و موسوڵمانە و ساغە لەگەڵتانا **(والحال)** ئەو کەسە لە هەموو دوژمنەکانتان سەختتر و نابارترە و دوژمنایەتییەکەی لەگەڵتانا زۆر سەختە ((**وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللَّهُ لاَ يُحِبُّ الْفَسَادَ**))[٤٦٣] واتە کاتێ پشتی هەڵکرد و دوورکەوتەوە لێتان تێئەکۆشێ بە (ئەنواعی) ڕێگەی فرۆفێڵ بۆ ئەوە **(ئیفساد)** بکا لە زەویدا و ڕێ بگرێ لە خەڵک و کشتووکاڵ بفەوتێنێ و نەتەوەی ئادەمیزادی بێدەست نەیەڵێ، بەڕاستی ئاگادار بن خوای گەورە کردەوەی فەسادی خۆش ناوێ و خراپەی خۆش ناوێ.[٤٦٤]

---

**(٤٦٣) سورەتی البقرە ئایەتی ٢٠٥**

**(٤٦٤) ئەم چەن ئایەتە دەرحەق بە ئەخنەسی کوڕی شورەیقی مونافق هاتە خوارێ کە لە خزمەت پێغەمبەردا (اجرای فصاحەتی) دەکرد، واتە خۆی بە ڕەوان بێژ پیشان دەدا و سوێندی دەخوارد دەیگوت من (مؤمینم) واتە ئیماندارم بەدرۆ.. هەروەها هەرچەندە ئەم چەن ئایەتە دەرحەق ئەو مرۆڤەی ناوبراو هاتۆتە خوارەوە، بەڵام هەندێ لە موفەسیرەکان ئەفەرموون دەڵێن (نازل بوونە) شا شانی هەموو کەسێکدا کە ئەو سیفەتەیان تێدابێ.**

هەروەها ئیمامی نەوەوی بـەزەیی خـوای پیـا بێتـەوە، دەڵێـت: ئێـوە بـزانن (موجادەلە) بەڕاستی هەندێ جار ئەبێتە ماف و هەق، بەڕاستی هەندێ جاریش دەبێتە (باگل) واتە پڕ و پووچ، خوای گەورە دەفـەرموویێت لـە قورئانـدا : ((وَلاَ تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ))[٤٦٥] واتە (موجادەلە) مەکـەن لەگـەڵ (ئەهلی کیتابا) وەکو (جو و گاور) بە شێوەیێ نـەبێ کـە لـە هـەموو شـێوەکان جوانتر بێ.

لە ئایەتێکی تردا دەفـەرموویێت: ((وَجَادِلْهُمْ بِـالَّتِي هِـيَ أَحْسَـنُ))[٤٦٦] واتـە موجادەلەیان لەگەڵدا بکە بە چاکترین شێوە.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویێت: ((مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلاَّ الَّذِينَ كَفَرُوا))[٤٦٧] واتە موجادەلە ناکات دەرهەق بە قورئان مەگەر بێباوەڕەکان نەبێ.

هەروەها ئیمام (محيالدين النـووی) بـەزەیی خـوای پیـا بێتـەوە، دەڵێـت: ئەگەر (جدال) لەسەر حەق و ڕاستیدا بێ ئەمە باشە و ئەنجامی بـاش ئـەبێت، بەڵام ئەگەر بـەتاڵ بـێ و بـۆ ونکردنـی ڕاسـتی و حەقیقـەت، ئەمـە خراپـە و ئەنجامی خراپە دەبێت.. لەسەر ئەم تەفصیلە قورئانی پیـرۆز بـەڕەوا و دروسـتی داناوە (جیدال) بۆ دەرخستنی ڕاستی و حەقیقەت، هەروەها زەمیشـی کـردووە لەسەر شتی پڕووچووچ و بێ فائدە واتە بێسوود.

((عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كَفَى بِكَ إِثْمًا أَنْ لا تَزَالَ مُخَاصِمًا))[٤٦٨] لە ئیبنوعەباسەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەڵێـت:

---

(بڕوانە تەفسیری الكبير، نازناو بە (مفاتيح الغيب) دانرای امامی (رازی) (خوای لێ ڕازی بێت) ، بەرگی ٥ لاپەڕە ١٩٧.

(٤٦٥) سورەی العنكبوت ئایەتی ٤٦

(٤٦٦) سورەتی النحل ئایەتی ١٢٥

(٤٦٧) سورەی غافر ئایەتی ٤

(٤٦٨) رواه الترمذي

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: بەسە گوناهێک بۆ تۆ کە واز نەهێنی لە دەمەقاڵێ و موجادەلە.

ئیمامی عەلی (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ((**إن الخصومه لها قحم وهي المهالک**))[٤٦٩] واتە دەمەقاڵێ و موجادەلەی بێسوود ئینسان دەفەوتێنێ بە هیلاکی دەبات.

**باسێك:**

هەروەها ئەبو ئومامە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوەﷺ دەفەرمووێت: ((**مَا ضَلَّ قَوْمٌ بَعْدَ هُدًى كَانُوا عَلَيْهِ إِلَّا أُوتُوا الْجَدَلَ ثُمَّ تَلَا (مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلا جَدَلا)**))[٤٧٠] واتە هیچ گەلێک ڕێ بەزرکەر نیە لەپاڵ شێنومایی و هیدایەت وەک ئەمە کە گەلێک کار و پیشەیان هەر دەمەوەری و موجادەلە بێ.. لە پاشا پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە (واتە ئەو مپالەیان واردی) سەر تۆ نەکرد بە خراپە مەگەر بۆ دەمەوەری و موجادەلە نەبێ.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**أخوف ما أخاف عليكم زلّة العالم وجدال منافق في القرآن ودنيا تقطع أعناقكم**))[٤٧١] واتە لە هەموو شتێ زیاتر لێی دەترسم لە ئێوە لە خلیسکانی زانایێ و لە دەمەوەریی موناقق لە قورئاندا و لەو کەسە کە خۆشەویستی دونیا وای لێی بکات تا مەلی دەبچورێن و گومی ئەکات.

هەروەها حەزرەتﷺ لە فەرموودەییکی تردا دەفەرمووێت: ((**المراء في القرآن كفر**))[٤٧٢] واتە دەمەوەر و موجادەلە لە قورئاندا بێباوەڕییە.

---

**(٤٦٩) رواه الشافعي في الأم كما في الزواجر**
**(٤٧٠) سورەی الزخرف ئایەتی ٥٨**
**رواه يزيد بن الترمذي وابن ابي الدنيا في كتاب الصمت.**
**(٤٧١) رواه ابن عمر**
**(٤٧٢) رواه ابوداود**

**ئاگاداریێك:**

هەروەها بەڕاستی دەمەوەر و دەمەوریی و دەمەقاڵی لە ڕیز و جوملەی تاوانە گەورەکان ژماردراوە، وەک شێخ (ابن حجـر) لـە (الزواجـر)دا نـەقلی ئـەکات، هەروەها دەمـەقاڵی بـە گوشـندە کـە ئینسـان واز نـەهێنێت تـا توشـی ڕق و کینێکی وا ببێت و کە دەسـت بەوەشـێنێت خوانەخواسـتە ئەمـە زۆر خراپـە و زیان و زەرەری یەک جار زۆرە و جگە لەمەش خوا و پێغەمبـەرﷺ ئـەم جـۆرە کەسانەیان خۆش ناوێ تا واز نەهێنن، چونکە پێغەمبـەریشﷺ دەفـەرمووێت: ((أبغض الرّجال إلى الله الألدّ الخصم-أي كثير الخصومة))[٤٧٣] واتە خوای گەورە لە هەموو کەس زیاتر رقی لـە مرۆڤـی شـەڕخواز و شـەڕفرۆش و ڕق ئەسـتوور و دەمەقاڵی بە کوشندەیە. (خوا پەنامان بێت).

**(نسال الله الكريم أن يطهر قلوبنا من الذنوب الباطنة ويرزقنا الأخـلاق الحسـنة، آمين)**

---

(٤٧٣) رواه البخاري

# ئاوانی شەست و یەک

## قەدەغەکردنی ئاوی زیادە

## (منع فضل الماء)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفـەرموویّت: ((قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَاؤُكُمْ غَوْرًا فَمَنْ يَأْتِيكُمْ بِمَاءٍ مَعِينٍ))[٤٧٤] واتە بلّیّ ئا پـیّم بلـیّن ئـەی بیّبڕواییـنـە، ئەگـەر ئـاوی خواردنەوەتان ڕۆبچیّ بەناخی زەوی‌دا، کیّ‌ی تر هەیە بیّجگە لە خودا کە ئاوی زولاّلتان بۆ بنیّریّ؟

هەروەها حەزرەت ﷺ دەفەرموویّت: ((لا تَمْنَعُوا فَضْلَ الْمَاءِ لِتَمْنَعُوا بِـهِ فَضْـلَ الْكَلَأِ))[٤٧٥] واتە ئاوی زیادە قەدەغە مەکەن تا زیادە لەوەڕی پیّ قەدەغە بکەن، چونکە ئاوی زیادە بیّ و پیّویست نەبیّ، ئەمە دەبـیّ بـدریّت بـە خـەڵک یـا بـە ئاژەڵ و مەڕ و ماڵات، چونکە هەروەها پووش و پـاوان و گـەڵا و گیـا هەرچـی لەخۆت زیادەبیّ و دەبیّ بدریّ بە خـەڵک، چـونکە هـەروەها پیّغەمبـەر ﷺ لـە فەرمودەییّکی تردا دەفەرموویّت: ((مَنْ مَنَعَ فَضْلَ مَائِهِ أَوْ فَضْلَ كَلَئِهِ مَنَعَهُ اللَّهُ فَضْلَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ))[٤٧٦] واتە هەرکەسیّ ئاوی زیادە قەدەغە بکـات و یـا گیـا و گـوری زیادە قەدەغە بکا، ئەمە خوای گەورە خیّر و چاکەی خـۆی لـەڕۆژی قیامەتـدا لیّ‌ی قەدەغە دەکات.

هەروەها پیّغەمبەر ﷺ دەفـەرموویّت: ((ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمْ اللَّهُ وَلَا يُـزَكِّيهِمْ يَـوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ، رَجُلٌ منع ابْنَ السَّبِيلِ فَضْلِ مَاءٍ عنده وَرَجُلٌ بَـايَعَ رَجُـلًا بِسِلْعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ فَحَلَفَ بِاللَّهِ لَقَدْ أُخذها بكَذَا وَكَذَا فَصَدَّقَهُ وهو إلى غـير ذلـك،

---

(٤٧٤) سورەتی الملك ئایەتی ٣٠

(٤٧٥) متفق علیه

(٤٧٦ )رواه احمد

**وَرَجُلٌ بَايَعَ إِمَامًا لَا يُبَايِعُهُ إِلَّا لِلدُّنْيَا فإِنْ أَعْطَاهُ وَفَى لَهُ وَ ان لم يعطيه لَمْ يَفِ لَــهُ))**[٤٧٧] واته سێ کەس لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکا و هـەرگیز پاکیان ناکاتەوە لە گوناهان و ئێش و ئازارێکی زۆر سەختیان بۆهەیە، مرۆڤێـک کە زیادەئاوی هەبێ و لە ڕێبواری قەدەغە بکا، مرۆڤێکی تر مامەڵە و سەودا بکـا لەگەڵ مرۆڤێکی تر لە پاش عەصر و سوێندی بۆ بخوات بڵێـت قەسـەم بـەخوا من بەوەندەم وەرگرتوە یا بەوەندەم کڕیوە، ئەویش پێی باوەڕ بکات و (الحـاڵ) واش نەبێت بەدرۆ سوێندی بۆ بخوات، وە مرۆڤێکی تر بەیعەت واتە پەیمان بدا بە پێشەوایی، هیچ مەبەستی تری نەبێ مەگەر بـۆ دونیـایی یـا بـۆ پـارەوپولێ جیهان، ئنجا ئەگەر پێشەوا بەشی دا ئەویش بەگوێی دەکا، بەڵام ئەگەر ئـەو بەشی نەدا ئەویش بەگوێی ناکا.

هەروەها ئەبووداود لە (سنن)دا دەگێڕێتەوە ئەڵێت هاوڕێیەکی پێغەمبەرﷺ پرسیاری لە حەزرەتﷺ کرد و وتـی: **((يا رسول الله ما الشيء الذي لا يحل منعه؟ قال الماء. قال: يا نبي الله ما الشيء الذي لا يحل منعه؟ قال: الملح. قال يا نبي الله، مـا الشيء الذي لا يحل منعه؟ قان أن تفعل الخير خير لك.))**[٤٧٨] واتە: ئەی پێغەمبـەری خواﷺ، چ شتێکە ڕەوا نیـە قەدەغـەی بکـەی؟ فـەرمووی: ئـاو. گـوتی: ئـەی پێغەمبەری خوا، چ شتێکی تر دروست نیە قەدەغەی بکەی؟ فەرمووی: خـوێ. گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، چ شـتێکی تـر دروسـت نیـە قەدەغـەی بکـەی؟ فەرمووی: بەڕاستی خەیر و چاکە بکەی دروست نیە قەدەغەی بکـەی، چـونکە چاکەیە بۆ تۆ.

---

**(٤٧٧) متفق عليه**

**(٤٧٨) رواه ابوداود**

**تێبینی:**

هەروەها ئەم تاوانەش لە ڕیز و جوملەی تاوانە گەورەکان ژماردراوە، چونکە بەهیچ جۆرێک دروست نیە قەدەغەکردنی ئاوی زیاد لە خەڵک، چونکە موسوڵمانان هاوبەشن، مەگەر موڵک بێ و ئەمە شتێکی ترە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکدا دەفەرمووێت: ((**المسلمون شركاء في ثلاث: في الماء والكلأ والنار**))[٤٧٩] وفی روایە ((**وثمنه حرام**)) ئەمەش لێی زیادکراوە: واتە موسوڵمانان لەم سێ شتەدا هاوبەشن، لە ئاو و لەوەڕ و ئاگردا، وە لە گێڕانەوەیێکی تردا دەفەرمووێت: نرخیان قەدەغەیە و حەرامە.[٤٨٠]

**(نسأل الله العفو والعافية التوفيق لما يحب ويرضى إنه جواد كريم)**

---

**(٤٧٩) رواه ابوداود وابن ماجة**

**(٤٨٠) بڕوانە کتێبی زەواجری شێخ ئیبنو حەجەر، بەرگی یەکەم لاپەڕە ١٩٠**

# تاوانی شەست و دوو

## زەرەردان لە پێوان و کێشاندا

## (النقص في الكيل والميزان)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموویت: ((وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ)) واتە (وەیل) هاوارە یا شوێنێکی ناهەموارە لە ناو دۆزەخدا بۆ ئەو کەسانەیە کە (مگففین)ن، واتە ترازووبازی دەکەن. ((الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ)) واتە: کاتێک کە لەماڵی خەڵک شتێک پێوانە بکەن بۆ خۆیان بەزیادەوە پێوانەی ئەکەن. ((وَإِذَا كَالُوهُمْ أَوْ وَزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ))[481] واتە کاتێ شتێ بە پێوانە یا بەکێشانە بدەن بە یەکێ گزی و دزی لێ ئەکەن و ماڵەکەیان بە تەواوی نادەنێ و زیانیان لێ ئەدەن. ((أَلَا يَظُنُّ أُولَئِكَ أَنَّهُمْ مَبْعُوثُونَ، لِيَوْمٍ عَظِيمٍ)) واتە ئایا ئەم ئادەمیزادانە باوەڕیان بەوە نیە کە بێگومان لە ڕۆژی قیامەتدا زیندوو ئەکرێنەوە؟ ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی گەلێ گەورەیە و کاری گەورەی تێدا ڕووئەدا. ((يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ))[482] واتە: ڕۆژێک دێ کە هەرچی ئادەمیزاد هەیە تێدا دەوەستن، هەموو بە ترس و لەرزەوە چاوەچاوی فەرمانی پەروەردگاری هەمووان دەکەن.

واتە یەکێک ترازووبازی دەکات کە بڕوای بەڕۆژی زیندووبوونەوە و لێپرسینەوە نەبێ، ئەگینا هەرکەسێک چ جای بڕوا (یقین) بەڵکو هەر

(٤٨١) قال المفسرون لما قدم رسول الله ﷺ المدينة وبها رجل يقال له (ابو جهينة) له مكيالان يكيل بأحدهما ويكتال بالآخر، فأنزل الله هذه الآية. (بڕوانە تەفسیری ئیمامی قرطبي بەرگی ١٩ ل٢٠) واتە: هەندێ موفەسرین ئەفەرموون هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە ئەمەبوو کە حەزرەت ﷺ تەشریفی هات بۆ مدینەی موننەوەرە، مرۆڤێکی لێ بوو ناوی ئەبوو جهینە بوو، دوو ڕبەی هەبوو، بچووك و مەزن، بە بچووکەکەی دەی فرۆشت و بە مەزنەکەی دەیکڕی، ئنجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی هەناردە خوارەوە

(٤٨٢) سورەتی المطففین ئایەتی ٦

گومانێکیشی ببێ بەو ڕۆژی، دزی ناکات لە ئادەمیزاد لە پێوانە و کێشانەدا.[٤٨٣]

لە ئیبنوعەباسەوە، (خوایان لێ ڕازی بێت) گوتی: پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**خمس بخمس. قالوا: يا رسول الله وما خمس بخمس؟ قال: ما نقض قوم العهد إلاّ سلط الله عليهم عدوهم، وما حكموا بغير ما أنزل الله إلاّ فشا فيهم الفقر، وما ظهرت فيهم الفاحشة إلاّ أنزل الله بهم الطاعون، -يعني كثرة الموت-، ولا طففوا الكيل إلاّ منعوا النبات وأخذوا بالسنين، ولا منعوا الزكاة إلاّ حبس عنهم المطر**))[٤٨٤] واتە: پێنج شت بە پێنج شت ڕووئەدات. هاوڕێیان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ، ئەم پێنج شتە کامەنە؟ فەرمووی: پێنج تاوان هەن پێنج (بەلایان) لەگەڵدایە، یەکەم: هەر گەلێ پەیمان بشکێنن، خودا دوژمنەکانیان بەسەر زاڵ دەکا، دووەم هەر گەلێ حوکم بە غەیری ناردراوی خودا بکەن هەژاری زاڵ دەبێ بەسەریانا، سێیەم هەر گەلێ داوێن پیسی لەناویانە بڵاوببێتەوە مردن زۆرئەبێ لەناویانە، چوارەم هەر گەلێ لە پێوانە و کێشانە (غەش) واتە گزی بکەن ئەمە تووشی (قاتی) و گرانی ئەبن، پێنجەم هەر گەلێ (زەکات) نەدەن ئەمە بارانیان لێ قەدەغە ئەکرێت.

((**قال نافع: كان ابن عمر ﷺ يمرّ بالبائع فيقول: أتق الله وأوف الكيل والوزن، فإن المطففين يوقفون حتى أن العرق ليلجمهم إلى أنصاف آذانهم**))[٤٨٥] . واتە نافع دەڵێت: ئیبن عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) ئەگەر بەکن فرۆشیارێک دا بچووبایە، دەیگوت: پارێزگاری خودا بکە و زەرەر لە پێوانە و کێشان مەدە، چونکە بەڕاستی تەرازوو بازان لە ڕۆژی قیامەتدا ڕائەگیرێن، کە ڕۆژی

---

(٤٨٣) بۆ ئەم ئایەتە بڕوانە تەفسری خاڵ بەرگی سێیەم چاپی دووەم ل٤٩، وە تەفسیری نامی بەرگی حەوتەم ل٢٢٦.

(٤٨٤) رواه ابن ماجه والطبراني

(٤٨٥) بڕوانە کتێبی (الزواجر) دانراوی شێخ ابن الحجر، بەرگی یەکەم ل٢٤٦

پرسیارە، ئەوەندە ئەوەستن هەتا یەکێکیان هەتا نیوەی گوێچکەی لە عـەرەقی خۆیدا دەچەقێ.

**سەرنجێك:**

هەروەها ئەم تاوانەش لە ڕێز و جوملەی تاوانە گەورەکان ژمارداوە بـە ڕای زاناکان، وەک شێخ ئیبنوو (حەجەر) لـە (زەواجـر)دا دەفـەرموویت: (غـەش) و (حیلە) و فێڵ کردن لە پێوانە و کێشاندا لە تاوانە گەورەکانە. هـەروەها خـوای گەورە زۆر بە توندی هەڕەشەی لـە هـۆزی (شـوعەیب) پێغەمبـەر (صـلی اللە وسلم علی نبینا وعلیە) کردوە کە وازبهێنن لە تەرازووبازی و خیانەت کردن لە پێوان و کێشاندا، وەک قورئان بۆمـان دە گێڕێتـەوە لەسـەر زبـانی (شـەعەیب) پێغەمبەر-سلاوی خوای لەسەربێ- دەفـەرموویت: ((**فَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيـزَانَ وَلاَ تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلاَ تُفْسِدُوا فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ**))[٤٨٦] واتە تکاتان لێدەکـەم لـە پێوانـەو کێشـانە تـەواو بکـەن بـۆ ئـەو کەسانەی شتتان لێ دەکڕن و هەقی خەڵک کەم مەکەنەوە و بەشی کەس زایە مەکەن و خراپە و زیان کاری مەکـەن لـە زەویـدا لـە پـاش ئـەوەی کـە خـوا پێغەمبەری بۆ ناردن، هەروەها ئەوەی من پێتان دەڵێم، ئەگەر بـە گوێم بکـەن ئەوە بەڕاستی زۆر باشترە بۆ ئێوە، ئەگەر باوەڕتان بە خـوا و پێغەمبـەری خـودا بێ.

**(فنسأل اللە العفو والعافیة من کل بلاء ومحنة إنە جواد کریم)**

---

(٤٨٦ )سورەی الاعراف ئایەتی ٨٥

# تاوانی شەست و سآ

## ئەمین بوون لە مەکری خودادا

## (الأمن من مكر الله)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموویت: ((**حَتَّى إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُمْ بَغْتَةً فَإِذَا هُمْ مُبْلِسُونَ**))[٤٨٧] واتـە هـەتا (حاڵیـان) بـەهۆی هـەوابازی و رابـواردن لـە ئارەزووی (نەفسا) وای پیّهات کە بە وەز و حاڵی خۆیان کەیف خۆش بـوون و دڵشاد بوون بەو ناز و نیعمەتـە کـە پێیـان دراوە و بـە خـەیاڵی خۆیـان وایـان دەزانی لە هەموو شتیّ رزگارن، ئەوانمان گرت و داگیرمان کردن لە کتوپڕدا و یا بـە داگیرکردنێکـی کتـوپڕ، جـا تەماشـایان ئـەکردن لـە کتـوپڕدا کەوتنـە حەسرەت و غەمباری و هەناسە هەڵکێشان.

((**عن عقبة بن عامر ﷺ أن رسول اللهﷺ قال: إذا رأيت الله يعطي العبد ما يحب وهو مقيم على معصيته، فإنما ذلك اسـتدراج**)) هـەروەها عوتبـەی کـوڕی عـامیر (خوای لـیّ ڕازی بێـت) دەگێڕێتـەوە لـە پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموویت: ئەگـەر دیتتان کەسێک خودا بە ئارەزووی دڵی خۆی دنیای دەدا پیّی، واتـە هەرچـی حەزی پێبکردایە دەستی دەکەوت، کەچی ئەمیش هەر بـەردەوام بـوو لەسـەر تاوان و بیّفەرمانی خوا، ئەمە بزانن ئەوە (ئیستدراجە) و مۆڵەت دانـە تـا کـاتی خۆی دێت و خودا لەناکاو دەیگرێـت. ((**ثم قرأ رسول اللهﷺ : فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُمْ بَغْتَةً فَـإِذَا هُـمْ مُبْلِسُـونَ**))[٤٨٨] واتـە: دوایـی پێغەمبـەرﷺ ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە (مانـای

---

(٤٨٧) سورەی الانعام ئایەتی ٤٤

(٤٨٨) رواه الطبراني والبيهقي

ئایەتەکەش ئەمەیە): کاتێ کە کاربەدەستان (نەسیحەت) و ئامۆژگاری زانایانی ئاینییان لەبیر چووەوە لە ماوەیێکدا و دەرگای هەموو خێراتمان لـێ کردنـەوە، جا کە بەو دارایی و سامانە شادمان بوون، لـە ناکـاو بـەهۆی ئـەو نافـەرمانی و سەرکەشـیـیەوە گرتنمـان و بۆیـان دەرکـەوت کـە بێبـەش و ناهومێـد و خەفەتبارن.

هەروەها هاتووە لە (أپر)دا دەڵێت: وەک خوای گەورە شەیتانی دەرکـرد لـە بەزەیی و ڕەحمەتی خۆی، چونکە شـەیتان جۆرێـک بـووە لـە فریشـتەکانەوە، بەهۆی بێفەرمانیەوە خوای گەورە دەری کرد لە بەزەیی خۆی، ئنجا حەزرەتی (جبرائیل) و (میکائیل) دەستیان کرد بە گریان، جا خوای گەورە فەرمووی بـە هەردووکیان: بۆچی ئەگرین؟ لە وەڵاما گوتیان: ئەی پەروەردگاری ئێمە، ئێمە ئەمین نین لە مەکری تۆدا. جا خودای گەورە فەرمووی: ئاوابن، ئەمین نەبن لە مەکری مندا.

هەروەها زۆرترین دوعا و نزای پێغەمبەرﷺ ئەم پاڕانەوەیە بووە: ((**يَا مُقَلِّـبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قُلُوبَنَا عَلَى دِينِكَ**)) واتە ئەی وەرگێـڕی دڵان، دڵمـان دامەزرێنـە و ڕاگیر بکە لەسەرئاینی ئیسـلامدا، ((**فَقِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتَخَافُ عَلَيْنَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ الْقُلُوبَ بين أصبعين من أصابع الرحمن يُقَلِّبُهَـا كيـف يشاء**))[٤٨٩] واتە: هاوڕێیانی حەزرەتﷺ عەرزیان کرد گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا تۆ لەئێمە ئەترسێی؟ ئنجا پێغەمبەرﷺ لـە وەڵامـا فـەرمووی: بەڕاسـتی دڵی ئینسان لەنێوان دوو پەنجانە لەژێر پەنجەی میهرەبانی خـوداوە، هەرچـۆن حەز بکات وەرگێڕی ئەکات و ئەی ترازێنێ.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت لـە فـەرموودەیێکی تـردا: ((**إِنَّ الرَّجُـلَ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلَّا ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ**

(٤٨٩) رواه الترمذي

**بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَيَدْخُلُها))**[٤٩٠] واته بەڕاستی پیاوی وا هەیە کردار و ڕەفتاری وەک کردار و ڕەفتاری ئەهلی بەهەشتی وایە، هەتا لە بەهەشت نێزیک دەبێتەوە بە درێژایی گەزێک، ئەمە لە چارەنووسی وا نووسراوە، چونکە دەست پێشکەری لێ دەکا و دەست دەکا بە کردنی کاری خەڵکی دۆزەخەوە، دەچێتە ناو دۆزەخەوە.

هەروەها حەزرەتﷺ دەفەرمووێت: **((إِنَّ الْرجلَ لَيَعْمَلُ بعَمَلَ أَهْلِ النَّارِ وَإِنَّهُ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ وَيَعْمَلُ الرجل بعَمَلَ أَهْلِ الْجَنَّةِ وَإِنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ وَإِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالْخَوَاتِيمِ))**[٤٩١] واته: بەڕاستی پیاوی واش هەیە کردار و ڕەفتاری ئەهلی دۆزەخیە لە خەڵکیش وەهایە دۆزەخيیە، بەڵام نامەی چارەنووسی پێش دەستی ليێدەکا و خاتیمەی بە خێر و چاکە دەگەڕێ و دەست دەکا بە کردنی کردەوەی باش و دەچێتە ناو بەهەشت و دەبێ بە بەهەشتی.

هەروەها لە پەرتووکی (الکبائر)دا دەفەرمووێت: (**وقد قص الله تعالى في كتابه العزيز قصة بلعام وأنه سلب الإيمان بعد العلم والمعرفة**) واته بەڕاستی خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بەسەرهات و داستانی (بوڵعامان) بۆ ئەگێڕێتەوە، کە یەکێک بووە لە زاناکانی پێشوو، زۆر بەناوبانگ بووە، ئنجا خوای گەورە ئیمان و باوەڕی لێ ساندووەتەوە لەپاش زانین و زانیاری کە پێی درابوو. (**كذلك برصيصا العابد مات على الكفر**) **واتة هةروةها** (بةرسيساى) خواپەرست لەسەر بێباوەڕيیەوە مرد. (خوا پەنامان بێ و بمان پارێزێ لە سوو الخاتمە).

---

(٤٩٠) رواه البخاري

(٤٩١) رواه البخاري

**ئاگادارییەك:**

هەروەها نابێ ئەمین بین لە مەکری خودا، چونکە ئەمین بـوون لـە مـەکری خودا لە ڕیز و جوملەی تاوانە گـەورەکان ژمـاردراوە، هـەروەها بەڕاسـتی هـەر کۆمەڵێک ئەمین بن لە مەکری خواوە، ئەمە لە زەرەرمەندانە. هـەروەها خـوای گەورە لە سوورەی (**الاعراف**)دا دەفەرمووێت: ((**فَلاَ يَأْمَنُ مَكْـرَ اللّـهِ إِلاَّ الْقَـوْمُ الْخَاسِرُونَ**)) واتە نابێ ئەمین بن هەرگیز لـە مـەکری خـودا ئـەمین نابـێ ئـەو کۆمەڵە نەبێ کە زیان کار و ئەنجام نابارن.

هەروەها پێویستە ئینسانی ئیماندار لە بـەینی (خـەوف و ڕجـاوە) بـێ وەک نەوەوی، بەزەیی خوا پیابێتەوە، فەرموویەتی لە کتێبی (المجموع)دا.

**(وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين ونعوذ بالله من مكره وسوء الخاتمة، آمين يا رب العالمين)**

# تاوانی شەست و چوار

## ئازاردانی ئەولیایانی خودا

## (اذية أولياء الله)[٤٩٢]

خوای گەورە لە قورئاندا دەفـەرموویت: ((**وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَـاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا**))[٤٩٣] ئەم ئایەتە لەپێشەوە تەرجەمە کراوە، پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکاتەوە.

لـە ئیمـامی عومـەرەوە (خـوای لـێ ڕازی بێـت) دەڵێـت: پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموویت: ((**إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ لأُنَاسًا مَا هُمْ بِأَنْبِيَاءَ وَلا شُهَدَاءَ يَغْـبِطُهُمْ الْأَنْبِيَـاءُ وَالشُّهَدَاءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِمَكَانِهِمْ مِنْ اللَّهِ**)) واتە بەڕاستی لەناو (عەبـد) و بەنـدەکانی خودادا کۆمەڵێک هەن نە پێغەمبەرن نە شەهیدن، بەڵام لە ڕۆژی دوایـیدا زۆر لە پێغەمبەران و شەهیدان خۆزگـەیان پـێدەخوازن بـەهۆی ئـەو پلـەو پایـەو جێگای کە خودا داویـەتی پێیـان. ((**قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ فخبرنا مَنْ هُمْ؟ قَالَ: هُـمْ قَوْمٌ تَحَابُّوا بِرُوحِ اللَّهِ عَلَى غَيْرِ أَرْحَامٍ بَيْنَهُمْ وَلا أَمْوَالٍ يَتَعَاطَوْنَهَا**)) واتـە هاوڕێیـانی پێغەمبەرﷺ عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەرﷺ، پێمان بڵێ ئەمانە کێن هەتا بیان ناسین و خۆشـمان بـوێن؟ حـەزرەتﷺ لـە وەڵامـا فـەرمووی: ئەمانـە چـەند کەسانێکن لە ئومەتی مندا، لەبەر ڕەزابوونی خوا و خـوای گـەورەوە یـەکتریان خۆش دەوێ بێئەوەی خزمی یەک بن و بێ ئەوەی ماڵ و سامان بدەنە یەکتر..

---

(٤٩٢) سورەی الاحزاب ئایەتی ٥٨

(٤٩٣) تێبینـی: هـەروەها بۆ زانـین ئاگاداربـە لـە یەکـەم لاپـەڕەوە (تـاوانی شەسـت و چـوارەم) کـەوتووە یـان فـەوتاوە، منـیش زۆر هـەوڵم دا نوسـخەیەکی ڕاسـت کـراوەم بـە چـەنگ بکـەوێ، بـەڵام بـە چـەنگم نەکـەوت بەداخەوە، ئنجا ناچار بووم پێشەکی ئەم تاوانەم وەرگرتووە لـە کتێبـی (زەواجر)ی شێخ ابن حجر (ڕەزای خوای لێبێت)، ئومێدەوارم کە برێکم ڕاستکردێتەوە انشاء الله. دانەر (عبدالرحمن ملا طه عزیز)

((وفي رواية للنسائي قال هم قوم تحابوا بنور الله من غير ارحــام ولا انســاب)) لـه گێڕانــەوەیێکی (نەســائی)دا حــەزرەتﷺ دەفــەرموویت: ئــەوان کۆمــەڵێکن یەکتریان خۆش دەوێ بە نووری خودا و بــێ خزمایــەتی و نــەژاد. ((فَوَاللَّـــهِ إِنَّ وُجُوهَهُمْ لَنُورٌ وَإِنَّهُمْ عَلَى نُورٍ لَا يَخَافُونَ إِذَا خَافَ النَّاسُ وَلَا يَحْزَنُونَ إِذَا حَزِنَ النَّاسُ، وَقَرَأَ هَذِهِ الْآيَةَ أَلا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ.[٤٩٤]))[٤٩٥] واتە لـە پاشان حەزرەتﷺ سوێندی خوارد فەرمووی بەڕاستی ئەوان کەسـان نووریـان لەنێو چاو ئەبارێ و لە ڕۆژی قیامەتدا و لەسەر (منـابری نـور) دائەنیشــن، لـەو ڕۆژەدا کە خەڵک زۆر دەترسێن لە سزای خودا ئەوان هیچ تـرس و خەفـەتیان نیە، کاتێک خەڵک غەم و تەم دایان ئەگرێت، ئەوان بێغەم و کەسـەرن هـیچ ناخۆشيیەکیان نیە.. ئنجا لە دواییــدا حــەزرەتﷺ ئــەم ئایەتــەی خوێنــدەوە: (واتە: ئێوە بزانن و ئاگادار بن کە کۆمەڵی پیاوچاکان و ئەولیای خودا لـە ڕۆژی دواییدا بیم و خەوفیان نیە؟ لە دنیـادا و لـە خــەڵکیش ناترسـن و مـەحزون و پەرۆشی هیچ شتێکیش نین.

هــەروەها پێغەمبــەرﷺ دەفــەرمووێت: خــوای گــەورە لـە فــەرموودەیێکی (قودسی)دا دەفــەرمووێت: ((إِنَّ اللَّهَ تعالى قَالَ مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ وَمَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنتُ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا وَلَــئِنْ سَــأَلَنِي لَأُعْطِيَنَّـــهُ وَلَــئِنْ اسْــتَعَاذَنِي لَأُعِيذَنَّـــهُ))[٤٩٦] واتــە: هەرکەســێک ڕکابــەری و دژایــەتی بکــات لەگــەڵ خۆشەویستانما، با خۆی حازر بکات بۆ شەڕکردن لەگەڵ منا، بێ گومـان هـیچ کاتێک نێزیک نابێتەوە بەندەی من بۆ لام بە هیچ شتێک وەکو نێزک دەبێتەوە

---

(٤٩٤) سورەی یونس ئایەتی ٦٢

(٤٩٥) رواه ابوداود

(٤٩٦) رواه البخاري

به کردنی (فەرزەکان) زۆرتر نێزیک دەبێتەوە بە کردنی ئەو (سـونەتانەی) کـە پێغەمبەرﷺ کردوویەتی لە پێش و لە پاش (فەرزەکان) هەتاکو خۆشم ئـەوێ، ئەگەر خۆشم ویست ئیتر دەبمە ئەو هەستی بیستنەیان کە پێ دەبیستن، ئـەو چاوەی کە پێی دەبینن، ئەو دەستەی کە دەیخەنە کار، ئەو قاچانەی کە پێیـان ئەڕوا بۆ چاکە، ئەگەر داوای هەر شتێکم لـیێ بکـات ئەیـدەمێ، ئەگـەر داوای پارێزتنی لێکردم ئەیپارێزم.

**سەرنجێك:**

هەروەها ئازاردانی پیاوچاکان و ئـەولیایانی خـوا لـە رێـز و جوملـەی تاوانـە گەورەکان ژماردراوە، چونکە بەڕاستی هەرکەسێک ڕکابەری و دژایەتی بکـات لەگەڵیانا، ئەمە با خـۆی ئامـادە و حـازر بکـات بـۆ شـەڕکردن لەگـەڵ خـودا.. هەروەها شێخ ئەحمەدی (ابن الحجر) لە زەواجردا دەفـەرموویت: (وهـو صـريح هزا الوعيد الزى لا أشد منه ومحاربه الله تعالى للعبد لم تزكر إلا فى أكل الربا ومعاداه الأولياو، ومن عاداه الله لا يفلح أبدا، بل لابـد والعيـاز بـالله تعـالى مـن يموت على الكفر، عافانا الله من زلك بمنه وكرمه).[٤٩٧]

(اللهم إنك عفو تحب العفو فأعف عنا، أللهم أنظر إلينا نظرة الرضـــى وأثبتنـــا في ديوان أهل الصفا ونجنا من ديوان أهل الجفا، اللهم حقق بالرجاء آمالنـــا واحســـن في جميع الأحوال أعمالنا وسهل في بلوغ رضاك سبلنا وخذ إلى الخيرات بنواصينا وآتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار).

(٤٩٧) بڕوانە (الزواجر) بەرگی یەکەم لاپەڕە ١١٢

# تاوانی شەست و پێنج

## وازهێنانی نوێژی بەکۆمەڵ بەبێ بەهانە

## (تارك الجماعة من غير عذر)

خوای گەورە لە قورئانـدا دەفـەرموویت: ((**يَوْمَ يُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَـى السُّجُودِ فَلاَ يَسْتَطِيعُونَ، خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ وَقَدْ كَانُوا يُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ وَهُمْ سَالِمُونَ**))[٤٩٨] واتە باسی ئەو رۆژە بکە کە لەبـەر پەرێشـانی خـەڵک قـول هەڵئەگرێ و لە مەیدانا قاچ و قول دەرئەکەوێ، ئەو بێباوەڕانە بانگ دەکرێن بۆ ئەوە سوجدە و کوڕنوش بۆ خودا ببەن، هەرچی کۆشش ئەکەن ناتوانن سوجدە ببەن و سەرکز و چاوشۆڕ و داماون و خەجاڵەتی و رسـوایی دایگرتـوون، هـۆی ئەمەش ئەوەیە کە لە دنیادا بانگ ئەکران و داوایان لێ دەکـرا (سـوجدە) واتـە کڕنـوس بـۆ خـودا ببـەن، کەچـی لەگـەڵ ئـەوەدا سـاغ و بێئـازار بـوون، (سوجدەیان) نەدەبرد.

((**وقال كعب الأحبار والله ما نزلت هذه الآية في المتخلفين عن الجماعات**)) واتـە: کەعبی ئەحبار (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت قەسەم بەخودا ئەم ئایەتـە نـازل نەبووە مەگەر بۆ ئەو کەسانە نەبێت کە دوائەکەون لە نوێژی بەکۆمەڵ.

هەروەها سەعیدی کوڕی موسـەیب (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەڵێـت: ئـەم ئایەتە ئەم جۆرە کەسانە دەگرێتەوە کە دەنگی بانگ دەبیسن و وەک (**حي على الصلاة**) (**حي على الفلاح**) و ناڕۆن بۆ نوێژی بەکۆمـەڵ، بێئـەوەی بەهانەیـەکی شەرعییان هەبێ یا نەخۆش بن.

---

(٤٩٨) سورەتی القلم ئایەتی ٤٢

((عن عبدالله بن مسعودﷺ أن النبيﷺ قال لقوم يتخلفون عــن الجماعــة)) لـه عەبـدولاّی کـوڕی مەسـعودەوە (ڕەزای خـوای لێبێـت) دەڵێـت: بەڕاسـتی پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی بە هۆزێک کە دوادەکەوتن لە نوێژی بەکۆمەڵ: ((لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بالصَّلَاةِ فَتُقَامَ ثُمَّ آمُرَ رَجُلًا فَيؤم بالنَّاس ثُمَّ أَنْطَلِقَ مَعِي برجَال مَعَهُـــمْ حُزَمٌ مِنْ حَطَبٍ إِلَى قَوْمٍ لَا يَشْهَدُونَ الصَّلَاةَ فَـأُحَرِّقَ عَلَـيْهِمْ بُيُـوتَهُمْ))[499] واتـە: بەڕاستی نیازم هەبوو کـە بـە پیـاوێ بڵـێم لـەجیاتی خـۆم پـێش نوێـژی بـۆ خەڵکەکە بکا و خۆشم بڕۆم لەگەڵ چەن مرۆڤێکا بۆ سەر ئـەو پیاوانـە کـە لـە نوێژی (جەماعەت) دوادەکەون و فەرمان بـدەم کـە باوشـەدار کۆبکەنـەوە بـۆ ئەوەی ماڵەکانیان بەسەردا بسوتێنن.

لە ئەبو دەرداوە (خوای لێ ڕازی بێت) ئـەڵێت: بیسـتم لـە پێغەمبـەرەوەﷺ دەیفـەرموو: ((مَا مِنْ ثَلَاثَةٍ فِي قَرْيَةٍ وَلَا بَدْوٍ لا تُقَامُ فِيهِمْ الصَّلَاةُ إِلَّا قَدْ اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمْ الشَّيْطَانُ فَعَلَيْكَ بِالْجَمَاعَةِ فَإِنَّمَا يَأْكُلُ الذِّئْبُ الغنم الْقَاصِيَةَ))[500] واتە هەرکات سێ موسوڵمان یا زۆرتر لە سێ موسوڵمان لە هەر شوێنێکا یـەکگرتوو بـوون، ئنجـا گوندنشین بـن یـان کۆچـەری، نوێـژی جەماعـەت نەکـەن، ئـەوە بێ گومـان شەیتان زاڵ بووە بە سەریانا و فریوی داون، جا ئێوە ئەی موسوڵمانینە حـازری نوێژی بەکۆمەڵ بن و دوامەکەون لە جەماعەت، چونکە بەڕاسـتی گـورگ ئـەو مەڕە دەخوات کە لە مێگەل دا دەبڕێ.[501]

((عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلٌ أَعْمَى فَقَالَ: يَـا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ لَيْسَ لِي قَائِدٌ يَقُودُنِي إِلَى الْمَسْجِدِ افاصَلِّيَ فِي بَيْتِي، فَرَخَّصَ لَهُ. فَلَمَّـا وَلَّى دَعَاهُ فَقَالَ: هَلْ تَسْمَعُ النِّدَاءَ بِالصَّلَاةِ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَأَجِبْ))[502] واتە ئـەبی هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت پیاوێکی کوێرە هاتـە لای پێغەمبـەرﷺ

---

(٤٩٩) رواه الشيخان

(٥٠٠) رواه احمد وابوداود والنسائي

(٥٠١) زاد رزين: (وان ذئب الإنسان الشيطان إذا خلا به اكله) واته بەڕاستی گورگی ئینسان شەیتانە، ئەگەر مرۆڤ دووربێ لـە جەماعـەت، شـەیتان نـەیخوات، واتـە بـەم مانایـە شـەیتان مرۆڤی دوور لـە جەماعـەت گومڕا دەکات، چونکە شەیتان وەکو گورگەو گورگیش حەیوانێك دەخوات کە لـە کۆمەڵـە مەڕەکە دووربێ. (بڕوانە الزواجر دانراوی الشيخ ابن الحجر الهيتمي، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ١٤٣

(٥٠٢) رواه مسلم

عەرزی کرد ئـەی پێغەمبـەری خـودا، کەسـی وام نیـە دەسـتم ڕابکێشـێ بـۆ مزگـەوت، ئایـا دەبـێ کـە لەماڵـەوە نوێـژەکانم بکـەم؟ پێغەمبـەریش ﷺ لـە هەوەڵەوە ڕێگەی دا کە لەماڵەوە نوێژەکەی بکـا، بـەڵام لەپاشـان کـە پیاوەکـە بەرەو ماڵ گەڕایەوە، حەزرەت بانگی کردەوە و پێی گوت کە بانگ ئەدرێ بـۆ نوێژ گوێت لیێیە یا نا؟ گـوتی: بـەڵێ گـوێم لیێیـە. حـەزرەت ﷺ لـە وەڵامـا فەرمووی: دەبێ بێی بەدەنگی بانگەوە بۆ جەماعەت.

((**سئل ابن عباس ﷺ عمن يصوم النهار ويقوم الليل ولا يصلي في الجماعـة ولا يجمع؟ فقال إن مات هذا فهور في النار**))[٥٠٣] واتە لە ئیبنوعـەباس (ڕەزای خـوای لێبێت) پرسیار کراوە دەربارەی پیاوێک کە بەڕۆژ بەڕۆژوو دەبێـت و بـە شـەو نوێژ دەکات، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا (جومعە و جەماعـەت) ناکـا، واتـە نوێـژی هەینی و نوێژی بە کۆمەڵ ناکا. ئیبنوعەباس فـەرمووی: ئەگـەر ئەمـە بمرێـت لەسەر ئەم شێوەیە، ئەوە دۆزەخیە.

((**روى ابن عمر رضي الله عنهما، أن عمر خرج إلى بستان له فرجع وقـد صـلى الناس العصر، فقال: إنا لله وإنا إليه راجعون، فاتتنى صلاة العصر في الجماعة، أشهدكم أن حائطي على المساكين صدقة لتكون كفارة لما ضـيع**)) واتـە: ڕیوایـەتی کـردووە ئیبنو عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت) ئەڵێت: بەڕاستی باوکم ڕۆژێک دەرکەوت بۆ باخێکی خۆی، هەتا هاتەوە بۆ ماڵەوە خەڵک بەڕاستی نوێژەکـەی عەسـریان کردبوو بە جەماعەت، ئنجا لەم حالەتەدا زۆر دڵگران بوو، فـەرمووی: (**إنا لله وإنا إليه راجعون**) وا ئەم نوێژی عەسرەم بە جەماعەت لەکیس بـوو، ئـەی خەڵکینـە ئێوە بە شایەت بن، بەڕاستی وا من ئـەو باخـەی خـۆم بـە خـۆڕایی و لـەڕێی خودادا بەخشی بە هەژاران و بێنـەوایان، بەڵکـە ببێتـە داپۆشـین و کـەفارەت

---

(٥٠٣) **رواه الترمذي**

کردنەوەی ئەم کارە خراپەی لێی ڕوودام، واتە ئـەو نێـژی بەکۆمـەڵم لـەکیس چوو.

((قال ابن عمر رضي الله عنهما: كنا إذا فقدنا الإنسان في صلاة العشاء والصبح في الجماعة، اسأنا الظن أن يكون قد نافق أي (لحديث) (إِنَّهما أَثْقَلَ الصَّلَاةِ عَلَى الْمُنَافِقِينَ-أي صَلَاةُ الْعِشَاءِ وَصَلَاةُ الْفَجْرِ- وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا))[504] واتە: ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرمووێت: لەکاتی خۆی ئێمە وەهابووین ئەگەر کەسێ جەماعەتی نوێژی بەیانیان و نوێـژی خـەوتنان تـەرک بکردایـە، گومـانی دووڕوویـی و ناپاکیمـان لـێ ئـەکرد، چـونکە لـە پێغەمبەرمانﷺ بیستبوو دەیفەرموو: ئـەم دوو نوێـژە قورسـترین و گرانتـرین نوێژە سەر شانی ناپاکان واتە نوێژی خەوتنان و بەیانی، ئەگـەر دەیـانزانی کـە ئەم دوو نوێژە چ خێر و پاداشێکی تێدایە، ئەو کاتە لەسەر چۆک بۆی دەهـاتن. واتە بە کاکوڵکێ.

**تێبینی:**

هەروەها وازهێنانی نوێژی جەماعەت بەبێ عوزر و بەهانە لە ڕێز و جوملـەی تاوانە گەورەکان ژماردراوە بەڕای زاناکـان، چـونکە نوێـژی جەماعـەت بـەلای ئیمامی ئەحمەدەوە (بەزەیی خوای پیا بێتەوە) فەرزی عەینە و بـەلای ئیمـامی شافعی (بەزەیی خوای پیابێتەوە) فەرزی کیفایەیە، بە هەردوو شێوەکە زاناکـان تەرکی جەماعەتیان بە تاوانی گەورە داناوە.[505]

(فنسال الله التوفيق لما يحب ويرضى إنه جواد كريم)

---

(٥٠٤) متفق عليه

(٥٠٥) بڕوانە تاوانە گەورەکان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٣٩، لەوێشەوە باسێکمان نووسیوە، بچۆ بیخوێنەرەوە

# تاوانی شەست و شەش

## موکڕبوون لە وازهێنانی نوێژی هەینی بەبێ بەهانەوە

## (الإصرار على ترك صلاة الجمعة من غير عذر)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفـەرموویت: ((يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ))[٥٠٦] واتـە ئـەی ئـەو کەسانەی کـە باوەڕتـان هێنـاوە بـە خـودا و پێغەمبەری خوداوە، کاتێک کە بانگدرا بۆ نوێژ لە ڕۆژی هەینيدا بە پەلە بچن بۆیادی خوا و دەست هەڵگرن لە کـڕین و فرۆشـتن، ئەمـە بـۆ خۆتـان باشـترە ئەگەر تێبگەن.

لـە ئـەبوهورەیرەو ئیبنـو عومـەرەوە دەگێڕنـەوە (خوایـان لـێ ڕازی بێـت) هەردووکیان دەفەرموون: ئێمـە گوێمـان لـە پێغەمبـەرﷺ بـوو لەسـەر داری (منبر) واتە دوانگەی خۆی، دەیفـەرموو: ((لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمْ الْجُمُعَةَ (أي تركهم إياه) أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنْ الْغَافِلِينَ))[٥٠٧] واتـە: ئـەو کەسانەی کە نوێژی هەینی ناکەن یا دەبێ وازبێنن لـەم کـارە خراپـە، یانـەکو خودا دڵیان مۆر دەکا، ئنجا بێگومان بەرەبەرە بێئاگا و غافڵ دەبن لە دین.

هەروەها چەند فەرموودەیێکی پێغەمبەرﷺ بە چەن ڕیوایەتێکی جۆراوجـۆر لە کتێبی (زواجر)دا باس کراوە لەبارەی وازهێنانی هەینی، ئێمەش دەیخەینـە بەرچاو، ئەمەش دەقی فەرموودەکانی پێغەمبەرنﷺ:

(٥٠٦) سورەتی الجمعه ئایەتی ٩

(٥٠٧) رواه مسلم

((مَنْ تَرَكَ ثَلَاثَ جُمَعٍ تَهَاوُنًا بِهَا طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قَلْبِهِ))[٥٠٨] واته هەرکەسێ لەبەر سستی و تەمەڵی سێ نوێژی هەینی نەکا یا تەرکی بکات، ئەمە خودای گەورە لەسەر شوومی ئەم تاوانە مۆر دەنێ بەسەر دڵیەوە.

هەروەها لە فەرموودەیێکی تردا دەفەرمووێت: ((مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ من غير عذر فهو منافق))[٥٠٩] ((وفي رواية لرزين: فقد بريء من الله)) واته هەرکەسێ سێ نوێژی هەینی بەبێ بیانویەکی شەرعی بچوێنێ، ئەمە بە مونافیق واته ناپاک دائەنرێ، لە گێڕانەوەیێکی تردا دەفەرموێن (بەڕاستی خودا لەو کەسەیش بەرییە و بێزارە.

لە فەرموودەیێکی تردا دەفەرمووێت: ((مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ ثَلَاثًا مِنْ غَيْرِ ضَرُورَةٍ طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قَلْبِهِ))[٥١٠] واته هەرکەسێ سستی بکا بەنوێژی جمعە سێ جار لەسەر یەک نەیکا و بەبێ بەهانەیێکی شەرعی، ئەوە ئەو کەسە خوا دڵێ مۆر دەکا، نووری رەحمەت ناچێتە ناو دڵیەوە.

لە ریوایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ((وجعل قلبه قلب منافق))[٥١١] واته دڵی دەگۆڕێ بە دڵی ئینسانێکی ناپاک.

لە ریوایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ((كتب من المنافقين))[٥١٢] واته دەنووسرێت لەو کەسانەی کە ناپاکن.

لە گێڕانەیوەییکی ئەبو (یعلی)دا دەڵێت: ((فقد نبذ الإسلام وراءه)) واته بەڕاستی ئیسلامییەت دەخاتە پشتەوە.

---

(٥٠٨) رواه اصحاب السنن

(٥٠٩) رواه ابن ابي خزيمة وابن حبان

(٥١٠) رواه احمد باسناد جسم وابن ماجه باسناد جيد

(٥١١) رواه البيهقي

(٥١٢) رواه الطبراني

له جابیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەرﷺ خوتبەیەکی بۆمان خوێندەوە، لە خوتبەکەیدا فەرمووی: ((**يَا أَيُّهَا النَّاسُ تُوبُوا إِلَى اللَّهِ قَبْلَ أَنْ تَمُوتُوا وَبَادِرُوا بِالْأَعْمَالِ الصَّالِحَةِ قَبْلَ أَنْ تُشْغَلُوا**)) واتە ئەی موسوڵمانینە، پێش ئەوەی کە مردن یەخەتان بگرێت پەشیمان ببنەوە، پەلە بکەن بۆ بەجێهێنانی کرداری باش و بە گەڵک پێش ئەوەی کاتتان لەدەست نەچوە و مەشغول نەبوونە. ((**وَصِلُوا الَّذِي بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ رَبِّكُمْ بِكَثْرَةِ ذِكْرِكُمْ لَهُ وَكَثْرَةِ الصَّدَقَةِ فِي السِّرِّ وَالْعَلَانِيَةِ تُرْزَقُوا وَتُنْصَرُوا وَتُجْبَرُوا**)) واتە ئێوە بگەینن بەجێهێنانی پەیوەندی خوێشایەتی و زۆر ناوی خودا و خێرکردن بە پەنهانی و بە ئاشکرا بگەڕێنەوە بۆ لای خودای گەورە، ئەوها بکەن خوا ڕزق و ڕۆزیتان زۆر دەکات، هەر کەموکوڕێکتان بەسەر حاڵ و ماڵتانا هاتبێ تۆڵەی دەکاتەوە بۆتان. ((**وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ قَدْ افْتَرَضَ عَلَيْكُمْ الْجُمُعَةَ فِي مَقَامِي هَذَا فِي يَوْمِي هَذَا فِي شَهْرِي هَذَا مِنْ عَامِي هَذَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ**)) واتە بەڕاستی ئێوە بزانن کە خودای مەزن نوێژی هەینی پێویست کردووە لەسەر ئێوە لەم شوێنەدا و لەم ڕۆژەدا و لەم مانگەدا و لەم ساڵەدا، هەتا ڕۆژی قیامەت. ((**فَمَنْ تَرَكَهَا فِي حَيَاتِي أَوْ بَعْدِي وَلَهُ إِمَامٌ عَادِلٌ أَوْ جَائِرٌ اسْتِخْفَافًا بِهَا أَوْ جُحُودًا لَهَا فَلَا جَمَعَ اللَّهُ لَهُ شَمْلَهُ وَلَا بَارَكَ لَهُ فِي أَمْرِهِ**)) واتە ئنجا هەرکەسێ واز لە نوێژی هەینی بهێنێ لە ماوەی مندا یا لەپاش ژیانی من، چ فەرمانڕەوای دادپەروەر بێت یا زۆردار و ستەمکار، چ لەبەر بەسووک تەماشاکردنی نوێژەکە تەرکی بکات، یا لەبەر ئەوەی ئینکاری بکات، ئنجا لە خودا دەپاڕێمەوە ئیش و کاری ئەو کەسانە پەرێشان بکا و کردوکۆششیان کۆ نەگرێ و پەیت و بەرەکەت لە کاسبیـیاندا نەبێ. ((**أَلَا وَلَا صَلَاةَ لَهُ وَلَا زَكَاةَ لَهُ وَلَا حَجَّ لَهُ وَلَا صَوْمَ لَهُ وَلَا بِرَّ لَهُ حَتَّى يَتُوبَ فَمَنْ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ**))[٥١٣] واتە: ئاگادار بن ئەم جۆرە کەسانە نوێژ و ڕۆژو و زەکات و حەجیان لێ وەرنا گیرێت

---

**(٥١٣) رواه ابن ماجه والطبراني في الأوسط من حديث ابي سعيد الخدري**

و صەدەقە و خێراتیان لیٚ قەبووڵ ناکریٚت، مەگەر تەوبە بکەن و پەشیمان ببنەوە لە تەرکی نوێژی هەینی، بەڕاستی بەجێی بێنن.

هەروەها ریوایەت کراوە هەر کەس یەک جومعە تەرک بکات خاڵێکی ڕەش لەسەر دڵی پەیدا دەبێت، ئەگەر دوو جمعەی تەرک کرد دەبیٚ بە دوو خاڵ، ئەگەر سیٚ جومعەی تەرک کرد دڵی هەموو ڕەش دەبێتەوە (پەنا بەخوا لەم حاڵە ناشیرینە).[٥١٤]

**تێبینی:**

هەروەها تەرکی نوێژی هەینی بەبیٚ بیانوویەکی شەرعی لە ریٚز و جوملەی تاوانە گەورەکان ژماردراوە بەڕای هەموو زاناکان، چونکە بیٚ گومان نوێژی هەینی فەرزی عەینە، ئنجا ئەم فەرموودەی حەزرەتﷺ دەخەینە بەرچاو بۆ ئەم باسە کافیە وەک دەفەرمووێت: ((**مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ مِنْ غَيْرِ ضَرُورَةٍ كتب منافقا في كتاب لا يمحى ولا يبدل**))[٥١٥] واتە: هەرکەسیٚ بەبیٚ بیانویەکی ڕەوا تەرکی نوێژی هەینی بکا، ئەمە ئەو کەسە بە ناپاک و دووڕوو لە قەڵەم دەدریٚ و ناوی لە دەفتەری ناپاکان دەنوسریٚ و هەتاهەتاییٚ نەدە گۆڕیٚ و نە دەسڕێتەوە.

خوایە لەتۆ دەپاڕێینەوە هەر تۆ پەنامان بی و لە ڕۆژی قیامەت قوتارمان بکەیت و لەبۆ خاتری خۆشەویستەکەت کە حەزرەتی محمدەﷺ (**وعلى آله وأصحابه وسلم وبارك إلى يوم الدين**)

(**ونسأل الله القدير بجاه النبي البشير أن يكتب لنا البراءة من النار والخلود في دار القرار**).

---

(٥١٤) بڕوانە مەکتووباتی کاك ئەحمەدی شێخ، مامۆستا مەلا عبدالکریمی مردس تەرجەمەی کردووە، لاپەڕە ٥٣ بەرگی دووەم.

(٥١٥) رواه الشافعي عن ابن عباس‌رضی الله عنهما

# تاوانی شەست و حەوت

## زیان گەیاندن بە ڕاسپێری

## (الأضرار في الوصية)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموویت: ((**مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْـرَ مُضَارٍّ**))واتە لەپاش وەصیەتێک کە وەسیەتی پێ کردبێ یاخود لـەپاش دانـەوەی قەرز حاڵی مردووش وابێ زەرەرگەیێنەر نەبێ بە میرات بەرەکان (بـە سـەبەب وەصیەت) کردنی زیاد لەسـێیەک، ((**وَصِيَّةً مِنْ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِـيمٌ حَلِـيمٌ**)) واتـە: فەرموودەیێکە ئەم ئەحکامانە لەلایەن خوداوە، خودا زانایە بە هەرچـی داینـاوە بۆ مـەخلوقی خـۆی بـێ تالووکەیـە بـۆ عـەزابی ئەوانـەی سەرپێچـی دەکـەن (موخالفن)، ((**تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ**)) واتە: ئەم ئەحکامی گـوتراو دەرحەق بە هەتیوان و میـرات وەصـیەت شـەریعەتی خودانـە و هەرکەسـێک فەرمانی خودا جێبەجێ بکا لە فەرموودەی ئەو دەرنەچێ، ((**يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ**)) واتە: دەیـان خاتـە نـاو چـەند باغێک کە دەڕوا لەژێر داری باغەکان چەند ڕووبار حالیان وایە (ئەبەدینە) لەناو باغەکان، ئەمەش گەیشتنە بە مەرامی گـەورە، ((**وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَـدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَارًا خَالِدًا فِيهَا وَلَـهُ عَـذَابٌ مُهِـينٌ**))[٥١٦] واتـە: هەرکەسـێکیش سەرپێچی فەرمانەکانی خودا و پێغەمبەری خودا بکا و گوێ نەداتـە ئـەحکامی خودا، خودا دەیخاتە ناو ئاگر، حاڵی وایە ئەبەدی دەبـێ لـەناو ئـاگر و بـۆ ئـەو کەسە هەیە عەزابێکی بەزیللەت (خودا پەنامان بێت)

---

(٥١٦) سورەی النساء ئایەتی ١٤

له ئەبوهورەیرەوە (خوای لیٚ ڕازی بیٚت) دەڵیٚت: پیٚغەمبەرﷺ دەفەرموویٚت: **((إنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ أو الْمَرْأَةُ بِطَاعَةِ اللّٰهِ تعالى سِتِّينَ سَنَةً ثُمَّ يَحْضُرُهُمَا الْمَوْتُ فَيُضَارَّانِ فِي الْوَصِيَّةِ فَتَجِبُ لَهُمَا النَّارُ))** واتە بەڕاستی وەها ڕیٚدەکەویٚ مرۆڤیٚ یا ژنیٚ شەستساڵی تەمام فەرمانبەری و پەیڕەوی خودای مەزن دەکا، جا لەکاتی سەرەمەرگا لە وەصیەت دا واتە ڕاسپیٚری دا ناهەقی دەکا، جا هەردووکیان خۆیان شایستەی ئاگری دۆزەخ دەکەن. **((ثُمَّ قَرَأَ عَلَيَّ أَبُو هُرَيْرَةَ مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَارٍّ))**[517] واتە لە پاشان ئەبوهورەیرە (خوای لیٚ ڕازی بیٚت) ئەم ئایەتەی خویٚندەوە، ئەمەش دەقی ئایەتەکەیە: واتە: ئەم بەشە کە هەیە بۆیان لەپاش ڕابواردنی وەصیەتەکە کە کرابی یا لەپاش دانەوەی قەرزیٚ کە لەسەر مردووەکەوە بیٚ، وەلحاڵ ئەو وەصیەتە یا ئەو قەرزە نەبوبی بەهۆی زیان گەیاندن بە میرات بەرەکان، هەروەها پیٚویستە بزانین ئەگەر کەسیٚک وەسیەتی کرد و وەسیەتەکەی جیٚبەجیٚ بکەین چونکە ئەگەر وەسیەت بگۆڕین بە ناهەق ئەمە تاوانە، وەک قورئان دەفەرمنوویٚت: **((فَمَنْ بَدَّلَهُ بَعْدَمَا سَمِعَهُ فَإِنَّمَا إِثْمُهُ عَلَى الَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ))**[518] واتە هەرکەسیٚک وەصیەتی مردوو بگۆڕی، چ واریس و چ شاهید لەپاش ئەوەی کە بیستی و حاڵی بوو، ئەوە تاوانی جیٚنەگرتنی ئەو وەسیەتەیە لەسەر ئەوانەیە دەیگۆڕن و خودای گەورە بەڕاستی هەموو قسەی ئەبیسیٚ و بە هەموو شتیٚ دەزانیٚ.

هەروەها پیٚغەمبەریشﷺ دەفەرموویٚت: **((من فر بميراث وارثه قطع الله ميراثه من الجنة يوم القيامة))**[519] واتە کەسیٚک گل بداتەوە ماڵ و سامانی میراتگری خۆی بە ناهەق خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت دەبچوڕیٚنیٚ میراتی وی لە بەهەشت.

---

**(٥١٧) رواه ابوداود**

**(٥١٨) سورەتی البقرە ئایەتی ١٨١**

**(٥١٩) رواه ابن ماجه**

له فەرموودەیەکی تردا حەزرەتﷺ دەفەرموویت: ((**إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ فَلَا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ**))[520] واتە بەڕاستی هەموو خاوەن مافێ خودا مافی خۆی داوەتێ، ئیتر وەصییەت و ڕاسپێری بۆ میراتبەر ڕەوا نیە.

**سەرنجێك:**

هەروەها زیانگەیاندن بە وەصیەت واتە راسپێری دا و لە ریز و جوملەی تاوانە گەورەکان ژماردراوە بەرای هەمو زاناکان، چونکە بەڕاستی پێغەمبەریشﷺ دەست نیشانی ئەمەی کردووە بە فەرموودەییکی خۆی، وەک دەفەرموویت: ((**الإضرار في الوصية من الكبائر**))[521] واتە زیان گەیاندن لە وەسیەت لە تاوانە گەورەکانە.

لە پاشان پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە وەک دەفەرموویت: ((**تلك حدود الله**)) **فقد صرح رسول اللهﷺ بأن الأضرار في الوصية من الكبائر**، واتە بەڕاستی حەزرەتﷺ دانی پیاداناوە کە زیان و زەرەر گەیاندن بە وەسیەت واتە ڕاسپێریدا، چونکە ئایەتەکەش ئەبێت بە دەلیل و بەڵگە لەسەر ئەمە.

هەروەها شێخ ابن الحەجەریش لە زەواجردا دەڵێت: زۆر لە ئیمامەکانمانەوە دانیان پیادا ناوە کە زیان و زەرەر گەیاندن بە وەصیەت واتە راسپێریدا لە تاوانە گەورەکان ژماردراوە.

**(فنسأل الله العفو والعافية من كل بلاء ومحنة إنه جواد كريم)**

---

(٥٢٠) رواه الترمذي

(٥٢١) رواه النسائي

# تاوانی شەست و هەشت

## حیلە و فڕوفێڵ

## (المكر والخديعة)

خوای گـەورە لـە قورئانـدا دەفـەرموویّت: ((**وَلاَ يَحِيــقُ الْمَكْــرُ السَّـيِّئُ إِلاَّ بِأَهْلِهِ**))[٥٢٢] واتە فڕوفێڵی خراپ سەرەنجام هەر دەوری خاوەنەکەی ئەداتـەوە و خۆی پێ گیرۆدە دەبێ.

هەروەها خوای گەورە لە ئایەتێکی تـردا لـەبارەی ناپاکانـەوە دەفـەرموویّت: ((**يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ**))[٥٢٣] واتـە بەڕاسـتی ناپاکـەکان لەبـەر ئـەوە کـە باوەڕیان نیە بە خودا حیلە و فێڵ دەکەن لەگەڵ پێغەمبەری خودادا و لەگـەڵ موسوڵمانانا و خوای گەورە لەبەر ئەوە بە هەموو کاروبارێکیان دەزانێ (حالیش وایــە) خــودا جــەزادەرەوەی فێڵــی ئەوانــە بــە ئاشــکراکردنی (ئەســرار و) نهێنيیەکانی ئەوان لە دونیا و (عەزاب) لە قیامەت.

هەروەها پێغەمبەریشﷺ دەفـەرموویّت: ((**المكر والخديعة في النار**))[٥٢٤] واتـە کەسێ فڕوفێڵ بکا بۆ زیانگەیاندن بە موسوڵمانان لەناو ئاگری دۆزەخدا دەبێ و ئازاری دەدرێ.

هەروەها حەزرەتﷺ دەفـەرموویّت: ((**لا يدخل الجنــة خــب ولا بخيــل ولا منان**))[٥٢٥] واتە ناچێتە بەهەشتەوە ئینسانی فڕوفێڵ باز و ئینسانی بەخیل واتـە ڕژد و ئینسانی منەت بکا بەسەر ئەو کەسەدا کە شتی دەداتێ.

---

(٥٢٢) سورەتی الفاطر ئایەتی ٤٣

(٥٢٣) سورەتی النساء ئایەتی ١٤٢

(٥٢٤) رواه البزار

(٥٢٥) رواه الترمذي

له فه‌رمووده‌یێکی تردا حه‌زره‌ت ﷺ ده‌فه‌رموویت: واته ئه‌هلی دۆزه‌خ پێنج که‌سن، یه‌کێکیان له‌مانه مرۆڤێکه به‌شه‌و و به‌ڕۆژ حیله و فڕوفێڵ ئه‌کات له‌گه‌ڵ ماڵ و منالیا.[٥٢٦]

**ئاگاداریێك:**

هه‌روه‌ها ئه‌م تاوانه‌ش له ڕێز و جومله‌ی تاوانه گه‌وره‌کان ژمارد‌راوه به‌ڕای زاناکات، وه‌ک شێخ ئیبنو حه‌جه‌ر له زواجردا فه‌رموویه‌تی: چونکه به‌ڕاستی حیله و فڕوفێڵ هیچ ناگونجێ له‌گه‌ڵ خاوه‌ن باوه‌ڕان. هه‌روه‌ها خاوه‌نی فڕوفێڵ ئه‌گه‌ر په‌شیمان نه‌بێته‌وه له‌م کاره ناپه‌سه‌ند و خراپه‌یه با خۆی به ئوممه‌تی پێغه‌مبه‌رﷺ نه‌ژمێرێ، وه‌ک حه‌زره‌تﷺ ده‌فه‌رموویت: ((**من غشنا فليس منا والمكر والخديعة في النار**))[٥٢٧] واته هه‌رکه‌سێ ساخته و گزیمان لێ بکا له ئێمه نیه، چونکه به‌ڕاستی که‌سێ فڕوفێڵ بکا بۆ زیان گه‌یاندن به خاوه‌ن باوه‌ڕان له ناو ئاگری دۆزه‌خدا ده‌بێ و ئازار ده‌درێ. (خوا په‌نامان بێت)

**(فنسأل الله العفو والعافية وصلى الله على النبي الأمي وعلى آله وصحبه وسلم)**

---

(٥٢٦) ئه‌م فه‌رمووده‌یه (موسلم) گێڕاویه‌تیه‌وه.

(٥٢٧) رواه الطبراني وابن حبان في صحيحه

# تاوانی شەست و نۆ

## سیخوڕی لەسەر موسوڵمانان و پیشاندانی عەیب و عار و نهێنییەکانیان

## (من جسّ على المسلمين ودل على عورتهم)

خوای گەورە لە قورئاندا دەفـەرمووێت: ((**ولا تجسسوا**))[٥٢٨] واتـە سـیخوڕی مەکەن یا بەدوای کاری پەنامەکی موسوڵماناندا مەگەڕێن.

پێغەمبەریشﷺ دەفـەرمووێت: ((**إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ وَلَا تَحَسَّسُوا وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا تَنَافَسُوا وَلَا تَحَاسَدُوا وَلَا تَبَاغَضُوا وَلَا تَدَابَرُوا وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا**)).[٥٢٩]

هەروەها ریوایەت کراوە[٥٣٠] لە زۆر کتێبی تەفسیر و سـیرەتا بەسـەرهات و قصەتی (**حاطِب**) کوڕی (**ئەبی بلتعة**) پیاوێکی ڕێک و ڕەوان بووە، یەکێک بووە لە کۆچەرە پێشینەکان، هاوبەشی جەنگی بەدر بووە، خـۆی لـە قـوڕەیش نـەبوو، بەڵکو هاوپەیمانی (بنی أسد)یەکان بـوو، مـاڵ و منـاڵی لـە مەکـەدا مـابۆوە، پیاوێک بوو جێگای باوەڕ و ڕاوێژی پێغەمبەر بوو، ئاگادار بوو بەوەی زانـی کـە حەزرەتﷺ دەیەوێ سوپا بەرێ بۆ سەر مەکە بۆ گرتنی، نامەیەکی بۆ خەڵکی مەکە نووسی، کە پێغەمبەرﷺ بە سوپاوە هات بۆ سەرتان، ئاگاتان لـە خۆتـان بێ، ئەم نامەیەم دا بە (سارە) کە ژنێکی ئازادکراوی بەنی (**موطهلیب**) بوو، ئنجـا

---

(٥٢٨) سورەی الحجرات ئایەتی ١٢

(٥٢٩) رواه الشیخان

ئەم فەرموودەیە لە تاوانی چل و دووهەم تەرجەمە کراوە پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکات.

(٥٣٠) ئەمەم وەرگرتووە لەگەڵ دەست لێدان لە تەفسیری (نامی) دانراوی مامۆستا (مەلا عبدالکریمی مدرس) وە ژیانی پێغەمبەری مەزن محمدﷺ دانراوی عبدالعزیز پارەزانی و کتێبی (محمد رسول الله) دانراوی محمد رضا لاپەڕە٣٠٧.

حـــەزرەتی (جوبرەئیـــل‌عليه السلام) هـــات بـــۆ لای حـــەزرەت و هـــەواڵی پـــێ‌دا، جـــا پێغەمبەرﷺ حەزرەتی عـەلی و عـەممار و گهلحـە و زوبـەیر و مقـداد و ئـەبو مەرپهدی هەنارد (خوایان لێ ڕازی بێت) بەدوای ژنەکە هەڵگری نامەکـە بـوو، ئنجا فەرموی برۆن هەتا ئەگەنە (روضة خاخ) لەوێدا کەژاوەیێ هەیـە، ئەگەنـە ژنێکی بت پەرست، نامەیەکی لـە (حاگـب)ەوە بـردووە بـۆ بـت پەرسـتەکانی قورەیش.. ئێمەش لەو شوێنەدا پێگەیشـتین بـە سـواری وشـترێکەوە دەڕۆیـی وەکو پێغەمبەرﷺ فەرمووی. وتمان نامەیەکت پێ‌یە بمان دەرێ. ووتـی نامـەم پێ نيیە، هەرچی هەوڵمان دا بێ‌سوود بـوو، نەچـووە عـەقڵ و ژێـری وتمـان پێغەمبەری خوا موخالەفەی نەکردووە، یا نامەکە دەربێتە یا ڕوتت دەکەینـەوە. کە زانی بەڕاستمانە و وازی لێ ناهێنین، نامەکەی لەناو تەوقەسـەریدا دەرهێنـا و دایـە دەسـتمان، ئێمـەش نامەکـەمان هێنایـەوە بـۆ مەدینـە بـۆ خزمـەت پێغەمبەری خودا. ئنجا ئەویش ناردی بەشوێن (**حاطب**)داو فەرمووی: ((**ما حملك على هذا؟**)) چی پاڵی پێوەنای بۆ کردنی ئەم کارە؟ یا بۆچی وات کـرد. ((**فقال يا رسول اللهﷺ أما والله إني لمؤمن بالله ورسوله ما غيّرت ولا بدّلت ولكني إمرأً ليس لى في القوم من أصل ولا عشيرة وكان لى بين أظهرهم ولد وأهل فصانعتهم عليهم**)) واتە (**حاطب**) گوتی ئەی پێغەمبەری خوا، سوێند بـی بـەخودا مـن بـاوەڕی پتـەوم هەیە بە خوا و پێغەمبەری خوا، هیچ نەگۆڕاوم لەسەر ئاینی ئیسلام، بەڵام مـن پیاوێکم خێزان و پەیوەندیم لەناو گەلی قورەیشـایە و کەسـم نیـە بیانپـارێزێ، من ویستم خزمەتێک بکەم بۆ ئەوەی چاوێک لە ماڵ و مناڵەکانم بکەن.

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ڕاست ئـەکا، ((**فقال عمر بن الخطاب يـا رسـول الله، دعني اضرب عنقه فإن الرجل قد نافق**)) واتە عومەری کوری (**خطاب**) (خـوای لـێ ڕازی بێت) گوتی ئەی پێغەمبەری خوا، لێم گەڕێ با بیکوژم یـا لـە گـەردنی بـدەم، چـونکە بەڕاسـتی ئـەم پیـاوە ناپـاکی کـردووە و موخالەفـەی خـوا و پێغەمبەری خوای کرد. ئنجا حەزرەتﷺ فەرمووی: لێ‌ی گەڕێ ئەی عومـەر،

رجا وایە خوای گەورە چاوپۆشی لێ کردبێ، چونکە ئەمە بەشداری کردووە لـە جەنگی بەدر، خوای گەورە فەرموویەتی دەرهەق ئەهلی بەدرا: ((**أعملوا ما شئتم قد غفرت لكم**))[٥٣١] واتە بەڕاستی هەرچیەکی بکەن خوا لـەئێوە خـۆش بـووە. ئنجا ئەم ئایەتە لە شەئنی (**حاطب**)دا هاتە خوارەوە، وەک دەفـەرمووێت: ((**يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ**))[٥٣٢] تـا دوایـی ئایەتەکە، واتە ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هێناوە بە خودا و پێغەمبـەر، دوژمنـی من و دوژمنی خۆتان مەگرن بە دۆست هەتا نهێنی و شتی پەنامەکی خۆتـان بە نامە بگەیەنن بەو دوژمنانە.[٥٣٣]

((**عَنْ ابْنِ عُمَرَ قَالَ صَعِدَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمِنْبَرَ فَنَادَى بِصَـوْتٍ رَفِيعٍ فَقَالَ يَا مَعْشَرَ مَنْ أَسْلَمَ بِلِسَانِهِ وَلَمْ يُفْضِ الْإِيمَانُ إِلَى قَلْبِهِ**)) لە ئیبنـو عومـەرەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوەو دەڵێت پێغەمبەرﷺ بەسەر دوانگەی منبر کەوت و بانگی کرد بە دەنگێکی بەرز فـەرمووی: ئـەی کۆمـەڵی کـە بـە زبـان ئیسلام بووەو باوەڕی و ئیمانی جێگیر نەبووە لەناو دڵیـەوە. ((**لا تُؤْذُوا الْمُسْلِمِينَ وَلَا تُعَيِّرُوهُمْ وَلَا تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ فَإِنَّهُ مَنْ تَتَبَّعَ عَوْرَةَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ تَتَبَّعَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ وَمَنْ تَتَبَّعَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ يَفْضَحْهُ وَلَوْ فِي جَوْفِ رَحْلِهِ**))[٥٣٤] واتە ئازاری موسوڵمانان مەدەن، مەگەڕێن بە شوێنی ناتەواوی موسوڵماناندا، چـونکە ئەمـە شـتێکی ناڕەوایـە و دروست نیە، ئەو کەسەی ئەکەوێتە شوێنی عەیب و عاری موسوڵمانان، خـوای گەورە ئەکەوێتە شوێن عەیب و عاری، هەرکەسێکیش خـوای گـەورە بکەێتـە شوێن عەیبی ئابڕووی دەبا و شەرمەساری دەکا و لەناو خەڵکا سووک و رسوای ئەکا ئەگەر لەناو زگی خانووەکەشی بێت.

---

**٥٣١ رواه البخاري ومسلم**

**(٥٣٢) سورەتی الممتحنه ئایەتی ١**

**(٥٣٣) ئەمەی وەرم گرتووە لەو بەسەرهاتەی (حاطب) ئەمـە لـە کتابی الکبائردا نووسراوە، بەڵام بە کورتی، ئێمەش بە درێژی باسمان کرد بۆ ئەوەی سود بەخش بێ (انشاء الله). دانەر عبدالرحمن مەلا طه عزیز**

**(٥٣٤) رواه الترمذي وابن حبان**

هەروەها پێغەمبەرﷺ لە وتارى حەجى ماڵ ئاوايي‌دا (حجه الوداع) فەرمووى: ((**إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا فِي بَلَدِكُمْ هَذَا فِي شَهْرِكُمْ هَذَا ألا هَلْ بَلَّغتُ**))[٥٣٥] واتە بەڕاستى خوێن و ماڵ و سامان و ناموستان لەيەكتر قەدەغەيە، هەروەک قەدەغەى ئەو رۆژە و ئەو مانگە و ئەو شارە ئەوا من ڕام گەياند و بانگم كردن.

**تێبينى:**

هەروەها ئەم تاوانەش لە رێز و جوملەى تاوانە گەورەكانە، چونكە شوێنكەوتنى عەيب و عارى موسوڵمانان ئاشكرا بكەيت وەک سيخوڕى و باس كردنى عەرز و نامووسى خەڵكى بۆ ئەوەى سووک و رسواى بكەيت لەناو خەڵكا، بەڕاستى ئەمە تاوانێكى زلە و لە تاوانە گەورەكان ژماردراوە بەڕاى زاناكان.

(نعوذ بالله من ذلك ونساله العفو والعافية إنه لطيف جواد كريم).

---

(٥٣٥) رواه الشيخان

# تاوانی حەفتا

## جنێودان بە هاوڕێیانی پێغەمبەرﷺ یا یەکێك لە یارانی ﷺ

## (سب أحد الصحابة رضوان الله عليهم)

هەروەها خوای گەورە بە گشتی ستایشی پێغەمبەرﷺ و یارانی (ڕەزای خوایان لێبێت) دەکا لە قورئانی پیرۆزدا و دەفەرموویێت: ((**مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنْ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الإِنْجِيلِ**))[٥٣٦] واتە موحەمەد پێغەمبەری خودایە و ئەوانەی لەگەڵ محمد دان واتە یارەکانی زۆر دلێر و ئازان، زۆر بەتێن و دڵ ڕەقن بەرامبەر بە کافرەکان، دڵ نەرم و خاوەن بەزەیین لەنێوان خۆیاندا، وەک باوک و کوڕ تۆ بە چاوی خۆت دەیانبینی هەر لە (رکوع) و (سوجدە)دان مەبەست و نیازیان لە کردەوەکانیاندا هەر ڕەزابوونی خودایە و شێوەی شیرینیان لە روو دەم و چاویاندا دیارە بەهۆی (ئەثری) کوڕنووشەوە، ئەوانەی کە باس کران سیفەت و نیشانەی ئەو ئیماندارانەیە کە خوا باسی فەرمووە لە تەوراتدا، واتە لە تەورات و ئینجیلدا ئەو سیفەت و نیشانە پێشوانەیان باس کراوە.

هەروەها قورئان لە شەئنی پێشکەوتوانی کۆچکەران و یاریدەدەران دەفەرموویێت: ((**وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنْ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ**))[٥٣٧] واتە ئەوانەی کە پێشکەوتن لە کۆچکردنتدا لە مەکەی موکەڕەمەوە بۆ مەدینەی مونەووەرە و ئەو کەسانەی کە پێشکەوتن لە

(٥٣٦) سورەتی الفتح ئایەتی ٢٩

(٥٣٧) سورەی التوبە ئایەتی ١٠٠

یارمەتیدانی پێغەمبەرﷺ و ئەو کەسانەی کە بە شوێنی ئەوانا هاتن بە بیروباوەڕی باش و کردەوەی چاک و خووڕەوشتی بەرز خودای گەورە لەوان رازی‌یە و ئەوانیش لە خودا ڕازین، چونکی موسوڵمانی ساغ ڕەخنەی نیە بەرابەر بە تەسەڕوفاتی خودای مەزن، خودا ئامادەی کردووە بۆیان ئەو ەباغاتی بەهەشتە کە جۆگە و جۆبارەکان لە ژێر دارەکانیانەوە دەڕۆن (حاڵی) ئەمانە وەهایە تیا ئەمێننەوە لەو باغاتەدا هەتاهەتایە و ئەمە گەیشتنە بە پایەی خاوەن مایەی گەورە لای خودا.

هەروەها چەند فەرموودەیێکی پێغەمبەرﷺ دەخەینە ڕوو لەبارەی فەزڵ و گەورەیی ئەصحابە و یارانی پێغەمبەرﷺ یەکێک لە فەرموودەکانی حەزرەتﷺ ئەمەیە دەرهەق یاریدەدەران (ئەنصار) دەفەرمووێت: ((من علامە الإیمان حب الْنصار ومن علامە النفاق بغچ الْنصار))[538] واتە نیشانە و عەلامەتی ئیمان خۆشویستنی ئەنصارە واتە یاریدەدەرانە،[539] و نیشانە و عەلامەتی نیفاق واتە دووڕوویی لەگەڵ ئەهلی ئیسلاما بوغچی ئەنصارە.

لە فەرموودەیێکی تردا پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنْفَقَ أَحَدَكُمْ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا بلغ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلَا نَصِيفَهُ**))[540] واتە جنێو مەدەن بە هیچ کەسێ لە هاوڕێکانی من، سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستەوەیە، ئەگەر یەکێ لە ئێوە بە قەد کێوی ئوحود ئالتوون ببەخشێتەوە هێشتا ناگات بە مشتێکی ئەوان، هەروا بگرە ناگات بەنیو مستیشیان.

---

**(538) رواه البخاري**

**(539) واتە ئەنصار کە ئەوس و خەزرەجن کۆچیان بە پێغەمبەرﷺ کرد و یارمەتیاندا و لەسەر کوففاری قوڕەیش و (سائرە تا) لە ئەرزی حیجاز و یەمەن و (ئەطرافەکانە). (بڕوانە القران النیرین فی مجمع البحرین) دانراوی مامۆستا مەلا رشید بەگی بابان، بەرگی یەکەم، لاپەرە ٢٧١، تحقیق محمد علی القرەداغی.**

**(540) رواە الشیخان**

هەروەها لە فەرموودەیێکی تردا دەفـەرمووێت: ((**اللّٰهَ اللّٰهَ فِـي أَصْـحَابِي، لا تَتَّخِذُوهُمْ غَرَضًا بَعْدِي، فَمَنْ أَحَبَّهُمْ فَبِحُبِّي أَحَبَّهُمْ، وَمَنْ أَبْغَضَهُمْ فَبِبُغْضِي أَبْغَضَـهُمْ، وَمَنْ آذَاهُمْ فَقَدْ آذَانِي، وَمَنْ آذَانِي فَقَدْ آذَى اللّٰـهَ، وَمَـنْ آذَى اللّٰـهَ يُوشِـكُ أَنْ يَأْخُذَهُ**))[٥٤١] واتە خۆتان دووربگرن و لەخوا بترسن دەربارەی ئەصـحابانی مـن، دووبارە خۆتان بگرن و لەخوا بترسن دەرهەق یاران و هاوڕێیانی مـن لـەدوای مندا و مەیانکەنە هەدەفی خۆتان بۆ تەعنە و تەشەرە، واتـە ناویـان مەبـەن بـە خراپە. ئنجا ئەوەی ئەوانی خـۆش دەوێ ئەمـە بۆیـێ خۆشـی دەوێـن چـونکە بەڕاستی منی خۆش دەوێ و لە خۆشەویسـتی مـن ئەوانیشـی خـۆش دەوێ.. ئەوەی ڕکی لەوانە ئەوە بۆێ ڕکی لێیانە چونکە بەڕاستی ڕکی لە منە و لە ڕکی من ڕکی لەوانە، ئەوەی ئازاریـان ئـەدا لـە ژیانیانـا یـا لـەپاش وەفاتیـان ئـەوە بەڕاستی با بزانێت کە ئەوە ئازاری من دەدات، ئەوەی ئازاری مـن دەدات ئـەوە بەڕاستی با بزانێت کە ئەوە ئـازاری خـوا دەدات، هەرکەسـێکیش ئـازاری خـوا بدات، ئەمە بێ گومان بەزووترین کات خودا ئەیگرێت و لەناوی دەبات.

لە فەرموودەیێکی تردا پێغەمبەرﷺ دەفـەرمووێت: ((**إذا رايتم الذين يسـبون أصحابي فقولوا لعنة الله على شرّكم**))[٥٤٢] واتە ئەگەر دیتتان کەسێک جنێوی بە ئەصحابەی من دەدا، ئێوە پێی بڵێن لەعنەت و نـەفرینی خـوا لـە خراپەکـەتان بێ.

لـە گێڕانەوەیـەکی ئەنەسـی کـوڕێ مالـک دا دەڵێـت: حـەزرەتﷺ دەفـەرمووێت: ((ﷺ**من سبّ أصحابي فعليه لعنة الله والملائكة والناس أجمعـين**))[٥٤٣] واتە هەرکەسێ جنێو بە یارانی مـن بـدات، ئەمـە لەعنـەت و نـەفرینی خـوا و فریشتەکان و هەمووو موسوڵمانانی لێ‌یە.

---

(٥٤١) اخرجه الترمذي

(٥٤٢) رواه الترمذي

(٥٤٣) رواه الطبراني والحاكم

**باسێك:**

هــەروەها لــەبارەی فــەزائیل و گــەورەیی ئەصــحابەكاندا (ڕەزای خوایــان لێبێت) گەلێ فەرمودەی بەرز لە (شئنیان) دا هاتووە دەبن بە بەڵگە و دەلیل لەسەر مەزنایی ئەواندا، هەروەها لە عیمرانی كـوڕی حصـین (خـوای لـێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەرموویـەتی: ((**خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ**))[٥٤٤] واتە چاكترین چەرخ و زەمان ئـەو چـەرخەیە كـە منی تیا ئەژیم، لەپاشان ئەوانە كە لـەدوای شـوێنی ئەوانـدا دێـن و مەبەسـت لێرەدا تابیعینە، لە پاشان ئەوانە كە بە شـوێنی ئەوانـدا دێـن مەبەسـت تـابعی تابعینــە. ((**قَالَ عِمْرَانُ فَلَا أَدْرِي أَذَكَرَ بَعْدَ قَرْنِهِ قَرْنَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا**)) وات عیمـران وتـی ئیتر نازانم لەپاش چەرخی خۆی دوو چەرخی تری فەرمووی یا سـێ چـەرخی تری فەرموو. ((**ثُمَّ إِنَّ بَعْدَكُمْ قَوْمًا يَشْهَدُونَ وَلَا يُسْتَشْهَدُونَ وَيَخُونُونَ وَلَا يُؤْتَمَنُــونَ وَيَنْذُرُونَ وَلَا يَفُونَ وَيَظْهَرُ فِيهِمْ السِّــمَنُ**))[٥٤٥] واتــە بەڕاسـتی لـە دوایـی ئێـوەوە كۆمەڵێك پەیدا دەبن بێئەوەی كەس دوای شایەدی دانیـان لـێ بكـا كەچـی هەر لەخۆیانەوە خۆ دەبەنـە پێشـەوە و شـایەدی بـە ناهـەق دەدەن و گـزی و ناپاكی ئەكەن و جێگەی بـاوەڕ و (**ثقة**) پێكـردن نـین و (نــذر) دەكـەن بـەلآم جێبەجێی ناكەن، قەڵەویی لەناویاندا پەیدا دەبێ.

هەروەها پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەییێكی تردا دەفـەرمووێت: ((**لَا تَمَسُّ النَّــارُ مُسْلِمًا رَآنِي أَوْ رَأَى مَنْ رَآنِــي**))[٥٤٦] واتـە هـەر موسـڵمانێ ئـەمنی ببینـێ یـا كەسێك ببینێ و ئەو كەسە منی دیبێ، ئەوە ئاگری دۆزەخ نالكێ بە پشتی ئەو كەسەوە.

---

(٥٤٤) رواه الشيخان

(٥٤٥) رواه البخاري ومسلم

(٥٤٦) رواه الترمذي

له فەرموودەیێکی تردا حەزرەتﷺ دەفەرموویت: ((**مَا مِنْ أَحَدٍ مِنْ أَصْحَابِي يَمُوتُ بِأَرْضٍ إِلا بُعِثَ قَائِدًا وَنُورًا لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**))[٥٤٧] واتە هەرکەسێ لە یارانی من لە هەر جێگا و خاکێکا بمرێ، لە ڕۆژی قیامەدا کە زیندوو دەکرێتەوە ئەبێ بە پێشڕەو و ڕۆناکایی بۆ خەڵکی ئەو شوێنە.

له فەرموودەیێکی تردا حەزرەتﷺ دەفەرموویت: ((**أصحابي كالنجوم بأيهم أقتديتم اهتديتم**))[٥٤٨] واتە هاوڕێیانی من وەک ئەستێرەی گەشی ئاسمانن، بە شوێنی هەر کامیان بکەون شارەزای ڕێگەی ڕاست دەبن.

باسێک:

هەروەها پێویستە ئێمە بزانین هەموو ئەصحابە و هاوڕێیانی پێغەمبەرﷺ ڕاست و ڕاستگۆ بونە و دووربوونە لە خراپەکاری، چونکە ئەم زاتانە هەموو یەکتریان خۆش دەویست بۆ ڕەزابوونی خوا و دڵیان بۆ یەکتری دەسووتا و بەزەییان بە یەکتردا دەهاتەوە و شتیان بێ یەکتری نەدەخوارد، چونکە یەک دەنک و یەک ڕەنگ و یەک ڕێ بوون گەورە و بچووکیان لەلا نەبوو، هەموو کاتێک خوایان لەبەرچاو بوو دژی زوڵم و ستەم و جەور و زۆرداری بوونەوە، ئاشقی خوا و پێغەمبەرﷺ قورئان و ئایین بوونە بەڕاستی هەموویان مەرد و شێری خوا بوونە، چونکە خزمەتی وایان هەبووە کەس ناتوانێ ئینکاریان بکا، ئنجا پێویستە ئێمە ئیمان و باوەڕمان پێیان ببێ کە ئەصحابە و یارانی پێغەمبەرﷺ هەموو شایستەی مەدح و پهنا و ستایشن، بەلآم لەناو ئەماندا (دە) کەس پایەیان بەرزترە و ئەمانە مەشهورن بە (**العشرة المبشرة**) لەم دەستەیەش دا چوار کەسیان لێ هەڵبژاردووە، هەروەکو شێخ ئیبنوحەجەر لە (زواجر)دا دەڵێت: (**وأجمعت علماء السنة أن أفضل الصحابة العشرة المشهود لهم**

---

**(٥٤٧) رواه الترمذي**

**(٥٤٨) رواه البيهقي والديلمي**

**باجنة على لسان نبيهﷺ وأفضل هؤلاء العشرة أبوبكر الصديق ثم عمر بن الخطاب ثم عثمان بن عفان ثم علي بن أبي طالب** (رضي الله عنهم أجمعين) **ولا يشك في ذلــك إلاّ مبتدع منافق خبيث**). واته هەموو زانایانی ئاینی بە کۆمەڵ یەکگرتوون لەسەر ئەم بیروباوەڕە کە چاکترین ئەصحابە ئەم دە کەسەنە کە شایەتی و موژدە پێدراون بە بەهەشت لەسەر زبانی پێغەمبەری خواﷺ، وە چاکترین و گـەورەترین ئـەم دە کەسەش ئەبوبەکری صدیقە لەپاشان عومەری کـوڕی (خگابـە) لـە پاشـان عوسمانی کوڕی عفانە، لە پاشان عەلی کوڕی ئەبوو (**طالب**)ە، خودا لە هەمووان ڕازی بێت، هیچ کەس گومانی لەمەدا نیە مەگەر ئینسانی تازە ئیجاد و ناپـاک و پیسۆک نەبێت.

هەروەها (**عیرباضی**) کوڕی ساریە (خـوای لـێ ڕازی بێـت) دەگێڕێتـەوە لـە حەزرەتەوەﷺ کە دەفەرمووێت: ((**عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَــاءِ الرَّاشِــدِينَ مِــن بعدي، عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الْــأُمُورِ**))[٥٤٩] واتـە ئێـوە لەسـەر سوننەت و ڕێگای مـن و جێنشـینانی مـن ڕێبکـەن و بـەدەم و دەسـت ئـەم ڕێگایەی من و جێنشینەکانم توووند بگرن و بەرمەدەن و خۆتـان بپـارێزن لـەو شتانەی من نەم گوتووە و نەم کردووە وەک شتێ بیدعە و تازە ئیجاد.

ئینجا شێخی ئیبنو حەجەر دەفـەرمووێت: (**والخلفاء الراشدين هم أبــو بكــر وعمر وعثمان وعلي رضي الله عنهم أجمعين**) واتە جێنشـینە دادپـەروەرەکان ئـەم چوارەنە، حەرزەتی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلیيە، (خوایـان لـێ ڕازی بێت) جا هەرکەسێ ئەم زاتانەی خۆش بوێت ئەمە بەڕاستی خوا و پێغەمبەری خۆش ویستووە، چونکە ئەمان خوا و پێغەمبەریان زۆر خـۆش ویسـتووە، ئنجـا کەسێ خوا و پێغەمبەریﷺ خۆش بوێـت، ئەمـە ئـەبێت بـە دەلیـل و بەڵگـە

---

**(٥٤٩) رواه ابوداود والترمذي**

لەسەر باوەڕی بەهێز، هەرکەسێ باوەڕی بەهێزی هەبێ، ئەمە بێفەرمانی خوا و پێغەمبەری خوا ناکا و لەسەر هەق و شەریعەتی ئیسلامەوە لانادا و ناترازێ.

هەروەها ئەبوئەیووبی سەختیانی (خوای لێ ڕازی بێت) کە یەکێک بووە لە پیاوە گەورەکانی (سلف) واتە رابوردوو[550] دەفەرمووێت: (هەرکەسێ ئەبووبەکری خۆش بوێ ئەمە بەراستی منارەی ئاینی بەرز کردووتەوە، کەسێک عومەری خۆش بوێ ئەمە بەڕاستی ڕێگای ئاینی فرەوان کردوە و لەسەر ڕێگای راستەوەیە، کەسێک عوسمانی خۆش بوێ بەڕاستی ڕەوشنبوتەوە بە نووری خوداوە، کەسێک عەلی خۆش بوێ ئەمە بەراستی دەستی گرتووە بە هەق و راستیەوە. (ومن قال الخير في جميع أصحاب رسول الله ﷺ فقد برء من النفاق) واتە هەرکەسێک بڵێت هەموو هاوڕێیانی پێغەمبەرﷺ چاک بوونە و ئەمە بەڕاستی دوورە لە ناپاکی و دووڕوویی.[551]

هەروەها عەبدوڵای کوڕی مبارەک دەفەرمووێت: (**خصلتان من كانتا فيه نجا الصدق وحب اصحاب محمدﷺ**)[552] واتە دوو ڕەوشت هەنە لە هەرکەسێکا بێت، ئەمە مایەی رزگاريیە، یەکەم راستگۆیی، دووەم خۆش ویستنی یارانی پێغەمبەرﷺ.

**ئاگاداریێك:**

هەروەها بەراستی پێویستە ئێمە بزانین گەلێک لە پێشەوا و زانایانی ئاینی لە کتێبی (**عقائدا**) و زۆربەی پەرتووکە بەنرخەکان دانیان بەوە داناوە کە بە پێویستی بزانین دەم بگرینەوە لە ناوهێنانی یارانی پێغەمبەرداﷺ لەم

(550) وتەی راستتر ئەمەیە کە ئەم زاتە تابعین بووە، بۆ ئەم باسە بڕوانە پەرتووکی (نسيم الرياض في شرح الشفاء) دانراوی مولانا شهاب الدين الخفاجي، بەرگی سێهەم لاپەڕە ٤٢٧.

(551) بڕوانە پەرتووکی (الزواجر عن اقتراف الكبائر) دانروی شێخ ئیبنو حەجەری هەیتەمی، بەرگی دووەم لاپەڕە ٢٣٢.

(552) بڕوانە پەرتووکی (الشفا بتعريف حقوق المصطفى) دانراوی (قاضي عياض) بەرگی دووەم لاپەڕە ٥٤.

ڕووداوانەی کە لە بەینیاندا رووی داوە، چونکە ئەگەر لە ڕێگـەی ڕاسـت و ڕەوا ئێمە لانەدەین دەزانین هەموو یارانی پێغەمبەرﷺ دادپەروەر بوون، کـەس لـە ئێمە ناگات بە هاوتایان، ئەو شەڕ و شتانەیش کە روویان داوە لەناویانا بـارێکی وایان بۆ دەدۆزینەوە کە کار نەکەنـە سـەریان، بێگومـان ئـەو شـەڕانە کـە لـە بەینیاندا رووی داوە لە ئارەزووی نەفسەوە نەبووە و لە ڕێگـەی خـودادا بـووە و بۆخودایان کردوە و هەردوو لایان بەپێی بۆچوونی خۆیان لەسـەر هـەق بـوون، ئەونەیان کوژراو و ئەوانەیان بکوژ بوون هەردوو لایـان لـە بـاغی بەهەشـتدان، هەردوو لایان پاداشیان دەدرێتەوە، ئەوانەیان (موصیب) بوون و بۆچـوونەکەیان ڕاسـت بـوە دوو پاداشـیان هەیـە و ئەوانـەیان کـە بـە هەڵـە چـووبوون و بۆچوونەکەیان ڕاست نەبووە تەنها یەک ئەجر و پاداشیان هەیە.[٥٥٣]

پ/ واتە پرسیارکراوە لە هەندێک زانایـان لـەم ڕووداوانـەی کـە لـە بـەینی هاوڕێیانی حەزرەتﷺ بەرپا بوە، وەک ئەم شەڕ و شۆڕ و شتانەی کە روویـان داوە لە نێوانیاندا.

و/ لە وەڵامدا زاناکان فەرموویانە: ئەمە خوێنێک بـوو واتـە بەڕاسـتی خـوای گەورە دەستی ئێمەی لێ پاراستووە لەم ڕووداوە و پێویست ناکات ئێمە زبـانی خۆمان لێ هەڵسووین، چونکە ئەو رووداوانەی کـە لـەنێوانیانا ڕوویـان داوە وەک ئەو ڕووداوە بـووە کـە لـەنێوان حـەزرەتی یوسـفعليه السلام و برایـەکانی ڕوویـداوە، ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە: (سئل بعچ العلماو عمّـا وقـع بـین الصـحابه مـن

---

(٥٥٣) هەزار ڕەحمەت لەم کەسەبێ کە گوتوویەتی:

ونسكت عن ضرب الصحابة فالذي جرى بينهم كان اجتهادا مجرِّدا
وقد صحّ في الأخبار ان قتيلهم وقاتلهم في جنة الخلد خلدا

هەندێی تر وتوویانە:

ثم السكوت واجب عمّا جرا بينهم من فعل ما قد قدرا
فكلهم مجتهد مثاب وخطؤهم يعفر الوهاب

(بڕوانە کتێبی رفع الخفا في شرح ذات الشفا، دانراوی زانای بەناوبانگ ابن الحاج الكردي، ل٢٦٩)

(بڕوانە کتێبی (معارج القبول بشرح الّصول) دانراوی (الشيخ حافظ احمد) بەرگی دووەم لا ٤٨٩

قتال فقال تلک دماوّ قد گهر الله منها أيدينا فلا نلوّپ بها ألسنتنا وسبيل ما جرى بينهم كسبيل ما جرى بين يوسف واخوته)[٥٥٤]

هەروەها لە شەرحی (العقيده النسفيه)دا دەفەرمووێت: (**يجب الكف عن ذكر الصحابة الا بما فيه خير وثناء**) واتە پێویستە ئینسان دەم بگرێتەوە لە ناوهێنانی یارانی پێغەمبەرﷺ بە نارێکی، مەگەر مەدح و ستایش نەبێ بە هیچ جۆرێک دروست نیە ناویان بە خراپە ببردرێت، چونکە ئەگەر ئێمە بەچاوی مەرحەمەت و بەزەیی تەماشایان بکەین و ورد ببینەوە بۆمان دەرئەکەوێ خوای گەورە لە گەلێک جێگادا لە قورئانی پیرۆزدا مەدح و ستایشی کۆمەڵێکیانی کردووە. هەروەها ئەگەر وردبینەوە لە فەرموودەکانی حەزرەتﷺ بۆمان دەرئەکەوێت لە فەرموودەکانی واتە دەست نیشانی ئەوەمان بۆ ئەکەن کە حەزرەت زۆر ستایشی کردوون و زۆر لێیان ڕازی بووە و زۆری خۆش ویستوونە، هەروەک لە پێشەوە هەندێک لە فەرموودەکانمان باس کرد، هەروەها پێغەمبەرﷺ بە گشتی لە فەرموودەیێکدا داوامان لێ دەکات کە ڕێزیان بگرین، وەک دەفەرمووێت: ((**أكرموا اصحابي فإنهم خياركم**))[٥٥٥] واتە ڕێزی هاوڕێیانی من بگرن، چونکە بەڕاستی ئەوان چاکترینی ئێوەن یا هەڵبژێردراون لە ئێوەوە.[٥٥٦]

---

**(٥٥٤) بۆ ئەم باسە ئەگەر ئەتەوێ تێبگەیت بە دوورودرێژی، بڕوانە کتێبی (الصواعق المحرقه) في (الرد على اهل البدع والزندقه) دانراوی الشيخ احمد بن حجر الهيتمي، ل٢١٤ و بڕوانە (الزواجر) ل٢٣١.**
**و بڕوانە (رفع الخفا في شرح ذات الخفا) دانراوی زانای بەناوبانگ ابن الحاج الكردي. ج٢ ل٢٦٨**
**و بڕوانە (صفوه التفاسير) دانراوی (محمد علي الصابوني) ج٣ ل٢٣٩**
**(٥٥٥) رواه احمد والحاكم**
**(٥٥٦) بڕوانە (شرح النسفية) في (العقيدة الإسلامية) دانراوی الدكتور عبدالملك عبدالرحمن السعدي، ل٢٢٨.**
**هەروەها لە دەقی عەرەبییەکەدا دەڵێت: (وقد وردت احاديث في فضائل الصحابة والتابعين ﷺ منها عام ومنها خاص بالمهاجرين ومنها خاص بالأنصار ومنها خاص بالآحاد فرداً فرداً ومنها القطع لأحدهم بالجنة مطلقاً ومنها القطع لبعضهم بمجاورة رسول اللهﷺ في الجنة) (بڕوانە معارج القبول بشرح سلم الاصول، دانراوی الشيخ حافظ بن احمد ج٢ ل٤٨٩**

ئنجا هەروەها وای بەباش دەزانم لەم باسەدا کـە برێـک گـوێ ڕاگـرین لـە پێشەوای مەزن و لە زانای بەناوبانگ مامۆستا (عبـدالرحیم) مەولەويیـەوە لـە (العقیـده المرچـیه)دا لــە بـارەی ستایشـی هاوڕێیـانی حــەزرەت داﷺ دەفەرمووێت:

خـــــــەیری ئـــــەو ژەوات (ژات الكرامــــــــە)
فیرقــــەی عەلیـیــــەی صــــەحبی كیرامـــــە
ئەوانـــــــەن ئـــــەوان چـــــاكیان بناســــــن
(خیـــــــر أمــــــه أخرجـــــــت للنــــــاس)
بـــــەدەس ئـــــەوان كــــەوت دەرەجـــەی قـــەبوول
ڕەچــــــامەندیی حـــــەق صـــــوحبەتی ڕەســـــوول
بكــــــــە بـــــــە چـــــــاوی دڵ تەماشـــــــایان
لــــــــە قورئانــــــــدا مـــــــەدح و پهنایــــــان
ئینصـــــــافت بـــــــوێ نـــــــەقهر كـــــــە ورد ورد
چـــــلۆنه شەخصــــێ خــــودا پهنــــای كــــرد
نـــەك هـــەر لـــە جایــێ جـــا یـــەكێ جـــا دوو
ڕاس وه بـــــێ جـــــادوو (جاهـــــدوا جـــــادوا)
بـــــە موجاهـــــەدەی ئەصـــــغەر و ئەكبــــــەر
بـــە جـــوودی مەیســـوور یـــا مەعســـوور یەكســـەر
بـــە جـــەلای فیگـــرەت لـــە ژەنگـــی فـــەترەت
بـــە جـــەلای مـــەوگین مـــەئلووف و هیجـــرەت
بـــە نـــەفس و بـــە مـــاڵ (فـــی ســـبیل الله)
(بـــــــالله مــــــــع الله فـــــــــی الله لله)
والله أشـــــــتری وهــــــم قـــــــد شـــــــروا
مــــا لهــــم بــــل مــــا لهــــم مــــا عتــــوا
ناكـــەن چـــە حاجـــەت پێـــوان بـــە (أوان)
صـــەد هـــەماری غـــەیر بـــە مشـــتی ئـــەوان
هـــای لـــەو تەصـــدیقه و عـــەزم و ئاهەنگـــە

لــــەو بـــەژلی مـــاڵ و ڕۆحـــە بـــەو ڕەنگـــە
لـــەو قەولـــە فکـــری چـــاک لـــێ کـــەرەوە
لــــە گەرمـــــەی جەنگـــــدا داتـــــە دەرەوە
(مـــــن فــــم الْنصـــــار والمهـــــاجره
إمــــــا الغنيمــــــــه إمـــــــا الآخــــــره)
هـــــیچ واریـــــد نـــــەوێ لـــــە شـــــەئنیاندا
بەســــــن بـــــۆ دەلیـــــل لـــــە فەچـــــڵیاندا
دەزانـــــی نەکـــــەی ئـــــەر لـــــە حـــــەق عـــودوول
ژوو اجتهـــــــــاد کلهـــــــــم عـــــــــدول
لـــــيس لهـــــم مـــــن أحـــــد معـــــادل
ولمـــــا جـــــری مـــــنهم محامـــــل
بهـــــوی الـــــنفس اصـــــلاً مـــــا التحـــــق
بـــل كـــان للحـــق فـــی الحـــق علـــی الحـــق
کوژیـــاگ و بکـــوژ وان لـــە گـــوڵ گەشـــتدا
لـــە گـــوڵ شـــتی دەشـــت صـــەحرای بەهەشـــتدا
بـــۆی دەبێـــت هەریـــەک بـــە قـــەدەر نەصـــیب
ئـــەجرێ بـــۆ مـــوخگیو دوان بـــۆ موصـــیب
جوننـــەی ئیجتهـــاد ئەصـــحابی جەننـــەت
نایبـــا تیـــری گهعـــن ئـــەربابی جیننـــەن
بـــوغچ و شـــەتمیان ســـەب گهعـــن و لەعنـــەت
یـــا کـــوفرە ئەڵبـــە یـــا فســـق و بیدعـــەت
ئـــەدووی هـــەرکامێ لەوانـــە کـــەوی
توشـــــیاری یـــــەکێ لەمانـــــە دەوێ

گهعنـــــه لـــــه ئهصـــحاب ســـــهیيدی ســـــهروهر
گهعنـــــه لـــــه دینـــــه نىيـــــهی بـــا خهبـــهر؟
ئـــــاخر ئـــــهم دینـــــی ئیســــــلامی پاكـــــه
بـــــاعیپی چــــاكهی دونیـــــا و عوقباكـــــه
لهوانـــــــهوه هـــــــات گهیشـــــــته ئێمـــــه
بـــــهوان پـــــاراو بـــــوو ئـــــهم زهوی دێمـــــه
ڕوواتـــــــی پوقـــــات عـــــودوول ئـــــــهوانن
موجتههیـــــــــدینی فوحـــــــوول ئـــــــهوانن
خـــــــودا و ڕهســـــــوول وان لـــــــه مهدحیانـــــدا
مـــــونكیر وان لـــــــه (ژم!) لـــــــه قهدحیانـــــدا
توخـــــودا بـــــێ بڵـــــێ پـــــێم وه پـــــهنهانی
قصـــــهی كـــــام لایـــــان بـــــهڕاس دهزانـــــی؟
لـــــه تهنقیصـــــی صـــــهحب دهكهوێتـــــهو دهر
تهنقیصـــــــی جـــــــهناب خـــــــودا و پێغهمبـــــــهر
لا بـــــــــه عهقیـــــــــدهی ناپهســـــــــهندیده
(نعـــــــوژ بـــــــاالله مـــــــن ژی العقیـــــــده!)
كافیـــــه بـــــۆ مـــــان ســـــوننه و كیتـــــاب
(أمســـــــكوا إژا ژكـــــــر الْصـــــــحاب)[٥٥٧]

هەروەها خاوەنی شەرحە (العقیدە الگحاویە) بە سەنەدێکی (صحیح) ریوایەت لە ئیبنو عەبباسەوە ئەکات، هەروەک دەفەرموویّت: ((**عن ابن عباس رضي الله عنهما أنه قال: لا تسبوا أصحاب محمدٍ فلمقام أحدهم ساعةً يعني مع**

(٥٥٧) بڕوانە (العقيدة المرضية) دانراوی سيّد عبدالرحمن مەولەوی، ل٧١ چاپی مصر.

**النبيﷺ خير من عمل أحدكم اربعين سنة،**[٥٥٨] **وفي رواية وكيع خـير مـن عبـادة أحدكم عمره.**[٥٥٩] )) واتـه دەفـەرمووێت جنێـو بـه هاوڕێیـانی پێغەمبـەرﷺ مەدەن، چونکه بەڕاستی یەک کات له ڕابواردنی یەکێک لەوانەوە لـه خزمـەت پێغەمبەرﷺ هاوڕێیانی کردووە چاکتر بووە له کردەوەی چل ساڵی یەکێک لـه ئێوەوە، له ریوایەتی (وەکیعدا) دەڵێت: هاوڕێیەتی حەزرەتﷺ چاکتر بـووە لـه خواپەرستی یەکێک له ئێوەوە به درێژایی تەمەنیەوە.[٥٦٠]

سەرنجێک

هەروەها جنێـودان بـه هاوڕێیـانی پێغەمبـەرﷺ لـه ڕێـزو جوملـەی تاوانـه گەورەکان ژماردراوە به ڕای هەمو زانایـان (**قال الشيخ ابن حجر في زواجره: فمن سب الصحابة ﷺ أيّ كبيرة بلا منازع**).[٥٦١] واته شێخ ئیبنوحەجەر لـه (زواجر)دا دەفەرمووێت هەرکەسێ جنێو به هاوڕێیانی پێغەمبەرﷺ بدات ئەمـه بەڕاسـتی هەڵساوە به تاوانێکی گەورە و بەبێ چەند و چوون.

هەروەها له شەرحی (**العقيدة النسفية**)دا[٥٦٢] دەفـەرمووێت: (**فمن سبهم والطعن فيهم والتدخل في نسبة بعضهم إلى الصواب والبعض إلى الخطأ فحرام قطعـاً ولربمـا يكون كفراً**) (**والعياذ بالله**) واته کەسێک جنێویان پێ بدات یا تانـه و تەشـەریان لێ بدات یا نسبەتی هەندێکیان بدات لەسەر هەڵەوە ئەمه قەدەغەیە و حەرامـه به هیچ جۆرێک دروست نیە، نزیکه ئەگەر پەشیمان نەبێتەوە ببێـت بـه کـوفر (خوا به دوورمان بگرێت).

---

(٥٥٨) اخرجه الإمام احمد في فضائل الصحابة

(٥٥٩) ورواية وكيع اخرجها ابن ماجه برقم الحديث ١٦٢

(٥٦٠) بڕوانه كتێبى (العقيدة الطحاوية) دانراوى الإمام القاضي على بن محمد العز الدمشقي، ج٢ ل٦٩٣.

(٥٦١) بڕوانه كتێبى (الزواجر في اقتراف الكبائر) دانراى الشيخ ابن الحجر الهيثمى ج٢ ل٢٣١

(٥٦٢) بڕوانه (شرح النسفية في العقيدة الإسلامية) دانراوى الدكتور عبدالملك عبدالرحمن السعدى، ل٢٢٨

**(قال الإمام الذهبي في الكبائر: فمن طعن فيهم أو سبهم فقد خرج من الدين ومرق من ملة المسلمين)**[٥٦٣] واته هەرکەسێ تانەو تەشەریان لێ بدات یا جنێویان پێ بدات، ئەمە بەڕاستی دەرچووە لە ئاینی و لە کۆمەڵی موسوڵمانان و ئیسلام دا بەدەرە.

وە لە شەرحی (العقيدة المرضية)دا دەفەرمووێت: ڕق هەڵگرتن لەوان جنێوپێدانیان تانەو تەشەر لێدانیان و لەعنەت لێکردنیان ئەنجامەکەی یا کوفرە یا فیسق و بیدعەتە. واتە هەرکەسێ ئەوانە بە حەڵاڵ بزانێ و بیانکات کافر دەبێت، خۆ ئەگەر بە حەرامیان بزانێت بەڵام هەر بیانکات ئەو فاسق دەبێت و دەبێتە ئەهلی بیدعەت.[٥٦٤]

ئنجا هەروەها پێویستە لەسەر ئێمەی موسوڵماناندا، ئەگەر خوانەخواستە بە خراپە ناوی هاوڕێیانی پێغەمبەریانﷺ برد بەبێ ئەدەبی و یەک سەر دەم کووتی بکەینەوە بە دەست و زبان بە قەد تواناوە، هەروەها حەزرەتی پێغەمبەریشﷺ دەستنیشانی ئەمەی کردووە بەم فەرموودەیەوە کە دەفەرمووێت: ((إذا ذكر أصحابي فامسكوا))[٥٦٥] واتە گەر باسی هاوڕێیانی من کرا بە (شێوەیێکی ناڕێکی) زوو دەم بگرنەوە.

---

**(٥٦٣) بڕوانە کتێبی الکبائر دانراوی الإمام الحافظ محمد بن احمد بن عثمان الذهبي، ل٢٨٢**

**(٥٦٤) بڕوانە (العقيدة المرضية) دانانی سیّد عبدالرحیمی مەولەوی، شەرح و لێکدانەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس. ل٤٧٠.**

**(٥٦٥) رواه الطبراني وابو نعيم**

# پــــاڕانـــەوە

دوا ووتــەم بەڕاســت (الشــكر لله)
چــونكە پێویســتە بــە دڵ و زبــان
خوابە بە جاهی (فخر المرسلین)
(حوبمـــــان) زیادكــــەی بـــۆ
(ئەصــــــــــــــحابەكان)
ئەمەی نوسیومە بە (قەدر إمكـان)
ببی بە ڕەحمەت بـۆ موسـوڵمانان
هــەزاران درووود لــە پێغەمبــەران
بــە دائــم وەكــو بــارانی بــواران
نوسەریش یەک بـێ لـە خزمـەت
كـــــــــــــــاران

بـــەردەوام ئـــەڵێم (الحمـــدلله)
سوپاسی خوا كەین بەبێ هـیچ
گومـــــــــــــــــان
دوورمان خـەرەوە لـە ڕق و لـە
كـــــــــــــــــین
(مخصوص) لەوانـە هـەر چـوار
یارەكـــــــــــــــان
بەدەستی كەرم وەر بگرە لێمان
(یا رب) بم بـورە لـە تاوانـەكان
لە خزم و یـاران لـە فیـداكاران
برژێتە سـەرجەم (ئەصـحابە و
یـــــــــــــاران
هەڵی ناوێژی لەتەک هـەژاران

غفر الله لي ولوالدي وللمؤمنين يوم يقوم الحساب، أللهم أنفعما بما علمنا وعلمنا ما ينفعنا وزدنا علماً وعملاً والحمد لله على كل حال وأعوذ بالله من حال أهـــل النـــار وآخر دعوانا أن الحمد لله ربّ العالمين وصلى الله على سيدنا محمد النبي الأمي وعلـــى آله وأصحابه الطيبين الطاهرين ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين.

المؤلف

عبدالرحمن ملا گە عزيز

إمام وخطيب قرية دارە تو

ناحية بردە رە ش، قضاء عقرة

سنة ١٩٩١/١/١

**تێبینی:**

ئەم پەرتووکە پەسند کراوە لەلایەن چەند زانایەکی بەڕێزەوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد خاتم الأنبياء والمرسلين، وعلى آله وأصحابه ومن أتبعهم باحسان إلى يوم الدين.**

مرۆڤی زانا وەکو چرایێکە لە تاریکی شەودا کە زانینەکەی بە دەوروپشتی خۆی دەبەخشێ لە ئەستێرەیەکی گەشەدار دەچێت کە دەدرەوشێتەوە. ئەرکی مامۆستایان و زانایانی ئایینی هەر لە کۆنەوە ڕێنمایی کردنی کۆمەڵ بووە لە پێناو فێربوونی کاری چاکە و دوورکەوتنەوە لە هەڵس و کەوتی چەوت و ناپەسند، کە بەم چەشنە ڕازی بوونی پەروەردگار وەدەست دێت، بەتایبەتی لەم سەردەمەدا ئەبێ هەموو لایەک دەست و برد بکەین بۆ ڕامالینی ئەم دیاردە نالەبارانەی کە بڵاوبوونەتەوە لەناو کۆمەڵی کوردواریماندا کە لە دەست کردنی ناحەزانی ئایینی ئیسلامی پیرۆزە.

جا ئەبێ هەموو لایەک ئاگادار بکەینەوە لەم تاوانانەی کە بچوک و گەورەن، لێرەدا دەمەوێ پیرۆزبایی خۆم لە مامۆستا بەڕێز و خۆشەویست ملا عبدالرحمن ملا گە عبدالعزیز بکەم بەبۆنەی دانانی ئەم کتابە (تاوانە مەزنەکان). کە توانیویەتی هاریکارییەکی باش بکات، لە دەرخستنی هەردوو ڕووی چاکە و خراپە.. بۆیە منیش داواکارم خوای گەورە پاداشتی ئەم خزمەتە چاکەی بداتەوە و هەموو لایەکمان بکات بە هێزێکی یەکگرتوو بە چەکی زانست و زانیاری لە ڕووی تەوژمی بەرەڵایی و لاسایی بێگانەکان بوەستین و کۆمەڵێکی پێشکەوتوو و خواناس پێک بهێنین ببین بە سەرقافڵەی کاروانی زانین.

له کۆتاييدا داواکارم خوای گەورە لە کارەساتی ڕۆژگار و شەڕی کەسانی لەخوا نەترس بمان پارێزێت.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموویت: ((**إذا مات العبد انقطع عمله الا من ثلاث: صدقة جارية، أو علم يُنتفع به، أو ولد صالح يدعوا له**))رواه مسلم.

**محمد عبدالكريم البرزنجي**

**امام وخطيب جامع آزادى/ أربيل**

١٩٨٤/١١/٩

١٤٠٥/٢/١٦

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي جعل علماء الدين مناراً لأعلاء كلمة الله، الصلاة والسلام على من بعث متمماً لمكارم الأخلاق محمد المصطفى صلوات الله وسلامه عليه وعلى آله وأصحابه الأبرار الشرفاء، فبعد أطلاعي على ما نمقه الفاضل ملا عبدالرحمن ملا طه الدزه يي) من تفسيرات وتراجم لبعض الآيات القرآنية والأحاديث النبوية كلاً حسب مضامينها وسماها ب(تاوانة مةزنةكان) كان عند يقيني أنه أصاب الواقع كأنما نقط وضعت على الأحرف من سلاسة ألفاظها وحلاوة معانيها وجذابة طرائفها حيث لم يأل جهداً لتحصيل نفائسها وكان حقاً مصداق قولهﷺ: ((من كان لله كان الله له))، فالله أرجو أن يجعل سعيه مشكوراً ويكثر من أمثاله في هذا العصر حيث قد قل نضرائه فالناس يسعون لجلب الحطام الفانية، أما هو (والله يشهد) فيسعى للحصول على ذخيرة الآخرة والخلق الفاضلة كما هو أهل لها ويجعل الله قدوة لمعاصريه في خدمة هذا الدين الحنيف إنه سميع مجيب.

الناظر في كتاب (تاوانة مةزنةكان)
نورى شيخ يحيى الأتروشي
مسكناً والبريفكانى نسباً
إمام وخطيب جامع العشائر السبعة (برده ره ش)
٧/ صفر/ ١٤٠٥
١٩٨٤/١١/١

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله الذي يوفق الصالحين من المؤمنين لخدمة الإسـلام والمسـلمين، والصـلاة والسلام على سيدنا محمد شمس الهداية وعلى آله وصحبه ومن سار على دربه إلى يوم الدين.

وبعد: فان أخانا في الإسلام الأستاذ الشيخ عبدالرحمن ملا طه عبدالعزيز (من الذين صدقوا ما عاهدوا الله عليه) وأخلصوا نيتهم لله سبحانه وتعالى، قد حضـره إيمانـه أن يقوم بتأليف كتاب (تاوانة طةورةكان) وقد اطلعت على هذا الكتاب، فالفيته كتابـا وافيا بالغرض الذي من أجله صنف في اسلوب سهل وعبارة غاية في الوضوح سـائلا المولى العلي القدير أن يجزل جرائه ويثنيه على عمله وأن يوفقه للسـير علـى طريـق السلف الصالح من علماء هذه الأمة وأن يجعله من الذين يستمعون القـول فيتبعـون أحسنه.

محمد ملا أحمد الإمام

أمام وخطيب الجامع الكبير في عقرة

ومدير المعهد الإسلامى في قضاء عقرة

٢٢/صفر/ ١٤٠٥

١٦/ تشرين الثاني/ ١٩٨٤م

بسم الله الرحمن الرحيم

فالله الحمد جزيلا وكفى بالله وكيلا ولا نرضى دونه بديلا وصلى الله على سيدنا محمد الذي جعله الله لنا دليلا وارسله هاديا وأوضح لنا سبيلا، وعلى آله وأصحابه الذين سلكوا وما بدلوا تبديلا، أما بعد فلقد منّ الله علينا إذ الهم أخانا في النسب الفاضل (عبدالرحمن بن ملا طه) ليتشرف بجمع وتأليف كتاب (تاوانة طقورةكان) فقد ألتمس مني أن أراجعه ولكن كثرة المشاغل حالت دون ذلك وبعد مطالعتي لبعض مؤلفه من هذا الكتاب فوجدته مفيدا ومفيد في موضوعه ولقد الفيته كتابا في بابه فريداً من نوعه وكل موضوع منه يصلح للخاصة والعامة ويمكن أن يستعين به الواعظ والمحاضر والخطيب والطالب ويكفيه نفعا أنه تعرض لبيان أخطار جميع الكبائر وذكر الزواجر وذلك بأسلوب سهل ممتع ومقنع مما ألتقطه من كتب العلماء الأعلام من سلف الأمة وخلفها وله فضل البيان في هذا الكتاب بعون الله تعالى وختاماً نبتهل إلى الله بالدعاء الصالح له ويحفظه من المخاطر كما نسأل الباري جل ذكره بأن يجعل بلدنا آمنا مطمئناَ ونناشده النصر والتوفيق والسلامة من الفتن ويهلك كل معتد أثيم حسبنا الله ونعم الوكيل.

عبدالله ملا طه عزيز

إمام مسجد صالح دباغ/ اربيل

١٩٨٦/٤/١٥

بسم الله الرحمن الرحيم

بەناوی خوای ئەنوسم پارچە هەڵبەستێکی پڕ مانا
لەبۆ إنسانی زانا و (عاقلی) دڵ پڕ لە ئیمانا
لەبۆ ئەو کارە من پیادەم لە هەڵبەستو (شعر) دانان
ئەگەرچی (نصحەتە) دەرسە لەبۆ زۆربەی موسوڵمانان
بە پێویستی ئەزانم لێرەدا با بیخەمە بەردەم
(شفایە) بۆ هەزاران عیللەت و دەردی دڵی پڕ غەم
لە بابەت چەند (حدیپێکە) کەوا فەرموویتی پێغەمبەر
دروودی خوای لەسەر بێ زاتی پاکی سیدی سەروەر
ئەفەرمووێ حەوت گوناە گەورەن کە (معلومە) لەلای ئوممەت
لە حەوتیش تاوەکو حەفتاش بگرە تا حەفصەت
هەمویان واردی شەرعن بە نصی ئایەتی قورئان
ئەبێ دور بێ لە گشت تاوانەکان خاوەن ئیمان
ئەوەی ئێستاکە باسی لێ ئەکەین شرحی ئەکەین حەوتن
تاوانی گەورەنەبێ گومان بە وێنەی ئاگر و نەوتن
بە کورتی (مختصر) با تێ بگەین تاوانەکان چەندن
ئەوەندە گەورەنە هەر یەک بە وێنەی کێوی ئەڵوەندن
یەکەم تاوانی تاوان بار (شەریک) پەیدا بکا بۆ خوا
بە قەد یەک مو وە یا (ژرە) ئیمانی نیە بە خوا
بەبێ شک هەر ئەوە هەردەم لە عالەم (کافری مگلق)
(سەفیهو) سوک و ریسوایە بەڕاستی خۆیەتی ئەحمەق

دووەم تـــاوانی تاوانبـــار دەســـا جادووگـــەری و ســـحرە

کـــە پیشـــە و کـــردەوە و کـــاری هـــەزاران (عنصـــری کـــوفرە)

ســـێیەم گـــەر بێتـــو ئیســـلامێ بکـــوژرێ و خـــوێنی بڕژێنـــرێ

بـــە گوللـــەی تیـــژی ژەهـــراوی ســـەر و کەللـــەی ببڕژێنـــرێ

بـــە ناحـــەق یـــا بـــەبێ ســـوچ و قەباحـــەت گیـــانی دەربێـــنن

ژیـــان و شـــادومانی مـــاڵ و ســـامان و منـــداڵی بفـــەوتێنن

چـــوارەم ئـــەی بـــرادەر خـــواردنی مـــاڵی هەتیوانـــە

بـــە (ڤلـــم) و زۆر ئـــەوەی بیخـــوا گەلـــێ (حـــاڵی) پەرێشـــانە

وەکـــو ئـــاگر لـــەنێو ســـکیا بلێســـە و گڵپـــە ئەســـێنێ

دڵ و جـــان و جگـــەر پـــاکی ئـــەبرژێنێ و ئەســـوتێنێ

بەشـــی پێنجـــەم لـــە تـــاوان بارەکـــان کێنـــە ریبـــا خـــۆرن

لـــەکاری ناپەســـند بێ گومـــان لەگـــەڵ تـــوخمی خۆخـــۆرن

شەشـــەم تـــاوان لەمەیـــدانا (فـــرار) کـــردن لـــەڕووی دوژمـــن

چ دوژمـــن دوژمنـــی ئـــاین ئەگـــەر جـــەرگی بکـــەن کـــون کـــون

ئـــەبی لاوێکـــی هوشـــیار و زیـــرەک و ژیـــر و ووریـــا بـــێ

بەرامبـــەر دوژمنـــی ئیســـلام ئـــەبێ سەربەســـت و ئازابـــێ

چـــەکی دەســـتی هـــەزاران بـــێ لـــە شـــەڕدا چەشـــنی پـــۆلا بـــێ

ئـــەبێ ســـەربەرز و بالابـــێ لـــەڕێی حـــەق چەشـــنی ئالابـــێ

دەبـــا بێینـــە ســـەر تـــاوانی حەفتـــەم بـــا کـــەمێ بـــدوێین

بـــەیانی کـــەین لـــەبۆ ئوممـــەت ئـــەوەی پێویســـتە بیلێـــین

بەناحـــەق بوهتـــان هەڵبەســـتن حەرامـــە بـــۆ ژن و ژاران

لـــە بـــۆ (دون البلوغـــان) و لـــەبۆ کیـــژ و کـــچ و کـــاران

بـــە ئایـــەت خـــوا لـــە قورئانـــان بـــە لەعنـــەت نـــاوی بـــردوون

لـەرۆژی دواییـدا و لـە جەننـەت بێبـەش و محروومـی کـردوون
ئـــەوانن پیـــاوی تـــاوان بـــار ئـــەوانن (خـــائنی ئوممـــەت)
ئەوانـــەن دەردی پـــڕ مەینـــەت، ئـــەوانن (عیللـــەتی میللـــەت)
موســـولْمانان دەخیلتـــان بـــم دەســـا خۆتـــان بپـــارێزن
لـە پیـاوی ناپەسـند و بـەد و لـە (شەحصـی ئەحمـەق) و درۆزن
بەوەنـــدە (اکتفامـــان) کـــرد ئیتـــر بـــا وازی لـــێ بینـــین
لـەبۆ یادیگـار بـەجێی دێلـین سـبەی هـەر ئـەمرین و نـامێنین
ســـوپاس بـــۆ (عبـــدالرحمانی) مـــلا گـــە کـــە مـــاوەی دام
کـــە (تقریفـــێ) بنووســـم بـــۆی دەســـا هێنایـــە جـــێ داوام
خـودا وێنـە و (ئـەمپالی) ئـەو زۆر کـا و ببێتـە قـدوە بـۆ میللـەت
ژیـــانی خـــۆش بکـــا و هـــەر گیز نـــەبینێ تاڵـــێ و زیللـــەت
کتێبـــی (الکبـــائر) ســـا بـــە لـــەفزی جـــوانی خـــۆی کـــردی
بـــە (نـــو گقی) شـــیرن و شـــەهدی وەری گێـــڕاوە بـــۆ کـــوردی
بـــە هـــەوڵ و هیممـــەتی بـــەرزی بـــە ســـعی و کۆششـــی تـــوانی
بـــە نـــووکی خامـــەی ڕەنگینـــی دەری خســـت ناوونیشـــانی
بەڕاســـتی ئاشـــکرای کـــردن پیـــاوی پـــیس و تـــاوان بـــار
بـــە ئایـــات و (ئـــەحادیپی) ڕەســـولی ســـەروەری نـــازدار
بـە فیکـری بکـری پـڕ حیکمـەت بـە پەنـدەی جـوانی پیـرۆزی
بـە گفتوگـۆی شـەکەر بـاری بـە گیـانی پـاکی پـڕ سـۆزی
خـودا هـەر پایـەداری کـا و وەکـو ئەسـتێرە هـەر گـەش بـێ
ئـەوەی ناحەزیـەتی هـەردەم لـە گـەردون خوایـە ڕوی ڕەش بـێ
تکامـــان وایـــە ئـــەی (ئـــەنوەر) لـــە بـــو ئـــەو زاتـــە دوعاکـــەی
ژیـــانی خـــۆش بکـــەی عـــومری درێژکـــەی مـــاڵی ئاواکـــەی

ببـــورن ئـــەی برایـــان ئەگـــەر (خـــەتا و ســـەهوێکی) تێدایـــە
ئـەوەی دورە لەگشـت (سـهو و خـەتا) بێ(شـوبهە) هـەر خودایـە
تـــەواوبوو (شـــعرەکانم) لێـــرە لـــە ســـایەی خـــواوە و مامۆســـتا
دەســم شـــل بـــو دوو چـاوی ڕەوشـــەنم کـــوڵ بـــو قەڵـــەم وەســـتا

الشاعر
سید أنور سید أحمد البرزنجی
١٩٩١/٩/٢

## سەرچاوەکانی ئەم پەرتووکە ئەمانەی خوارەوەن


١-قورئانی پیرۆز

٢-تەفسیری ئیمام (فخرالدین) رازی مەشهور بة (التفسیر الکبیر)

٣-تەفسیری ئیمام (قورطبي) (التفسیر الجامع الأحکام).

٤-تەفسیری ئیمامی آلوسی (روح المعاني)

٥-تەفسیری ئیمامی (ابو جعفری الطبري) مەشهوور به (الجامع البیان)

٦-تەفسیری (خازن ومدارك) دانراوی (علاء الدین بن محمد ابراهیم الصوفي)

٧-تەفسیری (صفوة التفاسیر) محمد علی الصابوني.

٨-تەفسیری (واضح) محمد محمود الحجازي

٩-تەفسیری (نامی) مامۆستا مەلا عبدالکریمی مدرس.

١٠-تەفسیری (خال) دانراوی شێخ محمدی خالاً.

١١- تەفسیری (ذیانی ئینسان) تەفسیری قورئان، مەلا حسێن هەولێری.

١٢-کتاب (الزواجر عن اقتراف الکبائر) دانراوی (الشیخ ابن الحجر الهیتمي المکي)

١٣-کتاب (الکبائر) دانراوی (الإمام الحافظ محمد بن أحمد بن عثمان الذهبي).

١٤-کتاب (الخطایة في نظر إسلام) دانراوی (عفیف عبدالفتاح طبارة).

١٥-کتاب (ارشاد العباد) الی سبیل الرشاد، دانراوی (زین العابدین عبدالعزیز.

١٦-کتاب (تاج الاصول) تألیف الشیخ علی منصور الناصف.

١٧-کتاب (الترغیب والترهیب) تألیف الحافظ المنذري.

١٨-کتاب (فیض القدیر) شرح (الجامع الصغیر) تألیف الإمام المناوي.

١٩-کتاب (احیاء علوم الدین) تألیف الإمام الغزالي.

٢٠-هەموو کتێبە (سوننەکان) بە شەرحەکانیەوە.

٢١-شەریعەتی ئیسلام، مامۆستا عبدالکریمی مدرس.

٢٢- (اقتران النيرين) دانراوی مەلا رشید بەگی بابان بگە تایگەتی بگەرگی یەگگەم، تحقیگق محمد علی القرەداغی.

٢٣-(التاج جامع الأصول) وەرگێڕانی مامۆستا نوری فگارس حەمگەخان، (تحقیق) محمگود أحمد محمد.

٢٤-یاساکانی ئیسلام، دانراوی مەلا محمد عبدالکریم.

٢٥-مەکتووباتی کاك ئەحمەدی شێخ، وەرگێڕانی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مدرس.

٢٦-ڕابەری بەندەکان، دانراوی مامۆستا عبدالله گناوی.

٢٧-کۆڕی ئامۆژگاری مامۆستا محمد شلماسی.

٢٨-(مذاهب الأربعة) تألیف العلامة عبدالرحمن الجزیری.

٢٩-(النجمة اللامعة) قاموس کردی- عربي، تألیف فاضل نظام الدین.

٣٠-هدایة الرحمان لألفاظ وآیات القرآن، محمد صالح البنداق.

(ملاحظة)

هەروەها زۆر بەڕتووکی تریش سوود و کەڵکمان لێ وەرگرتووە لەناو کتێبەکەدا دەستنیشانمان کردووە.

# فەرهەنگۆک

| ئازاردان | الأذيه |
| --- | --- |
| ئامشۆکەر لەبەینی خەڵک | النمام أو قتاد |
| باسێک | فصل |
| باوڕی، یاوەڕ | ئیمان |
| بەندە | العبد |
| بوهتان، بوختان | قذف، رمی، افتراو |
| تاوان یا گوناه | ذنب أو اپم خگیئه |
| تێبینی یا سەرنج یا ئاگادارییێک | تنبیه أو ملاحظه |
| پاش ملە ناوهێنان | الغیبه |
| پەند، عیبرەت | العبره |
| جیهان | الدنیا |
| جیاوازی | اختلاف، تفاوت، فرق |
| خۆکوشتن | الانتحار |
| داد یا دادپەرست | عاجل، منصف |
| دانەپیانهێنان | اقرار |
| داوەر یا دادگەر | قاچی، حاکم |
| داوێن پیسی | الزنا |
| دەم قاڵی | المشاده الکلامیه |
| دەماودەر یا دەمەوەر | پرپار، محب الجدال، أو لغوی |
| دەمەقالی | عراک او الخصام |
| دراوسێ | الجیران |

| دروودی خوای لێبێ(د.خ) | علیه السلام |
| --- | --- |
| دوارۆژ | القیامه |
| رۆژی یا رۆزی | الرزق |
| راسپێردراو، راسپێری | وصی، توصیه |
| ڕەوا، دروست | الحلال، مشروع |
| ڕواڵەت یا بەرچاوی | الریاو أو نفاق، تملق |
| روانگە | نڤر |
| رووکەشی | الڤاهری |
| رێباز یا رێبازگە | المڒهب |
| ریسوایی | حقاره، عار، فچیحه، خزی |
| رێگری، جەردەیی | ڨگع الگریق |
| سامان، دارایی | المال |
| ستەم کردن | الڤلم |
| سەرانە، باج | المکاس |
| سەرنڤیشت | القدر |
| سەزادان | العڒاب |
| سوو | الربا |
| سوود | ربح، نفع، فائده |
| سیخوڕی، جاسوسی | تجسس، جاسوسیه |
| گەوادی یا دەوێتی | الدیوپ |
| گەواهی، شایەتی | الشهاده |
| گەورە، زل، مەزن | کبیر، الکبائر |
| گزی، سختەیی | الغش |

| گیرا، قەبوول | القبول |
|---|---|
| عوزر، بەڵگە، هەجەت | العڑر |
| فەرمووده | أمر، قول، مأپور، نصیحه، ارشاد |
| فەرهەنگۆک | قاموس صغیر، أو قاموس المختصر |
| فێڵباز | غشاش، محتال، خداع |
| قەدەغە، قەدەغەکردن | تحریم، منع، نهی |
| کەلەپوور | إرپ |
| کەم تەرخەمی | اهمال، عدم المبالاه |
| کەم و کووڕیی | نقس، قصور |
| کنێزه | الجاریه |
| ماف یا هەق | الحق |
| مەرج | الشرگ |
| ناپاک، دووڕوو | المنافق |
| ناپاکی یا خیانەت | الخیانه |
| نەفرەت، لەعنەت | اللعنه |
| نزا، پاڕانەوه | دعاو، توسل، تچرع |
| هاوڕێیانی یان یارانی | صحابه النبیﷺ |
| واته | یعنی، المعنی |
| وێنه | صوره |

# نـــــــاوەڕۆك